# کاروان

گۆڤارێکی رۆشنبیری مانگانەیە
ئەمیندارێتی گشتی رۆشنبیری و لاوان
بەزمانی کوردی و عەرەبی دەری دەکا

23 ئابی 1984 سالی دووەم



## لەم ژمارەیەدا



ئەدرەس : هەولێر ـ ئەمیندارێتی گشتی رۆشنبیری و لاوان ـ گۆڤاری (کاروان) ت 20882

« فەرەیدون عەلی ئەمین »

# «دەسکەوتی ووشە لای منداڵان» چی یەو روانینە سێ بەرهەمی کوردی بۆمنداڵ لەم کلاو رۆژنەیەوە

هەموو جارێك لەدڵی خۆمدا ئـەڵێم : خۆزگـە منداڵانیش لەناو خۆیـاندا شـاعیرو چیـرۆك‌نووس‌و رەخنـەگرو ئـەدیبی خۆیانیان ئەبووو بەرهەمی خۆیانیان هەڵدەسەنگان‌و بڕیـاری خۆیانیان ئەداو ئێمەو مانانیشیان لەم ئـەركە رزگـار دەكرد ! بەلام كە ئەمە وا نەبێت ، دیارە ئەم ئەركەش هەر بەرەورووی گـەورە دەبێتـەوەو یـەخـە دەگـرێت . بـۆیـە دەڵێم كـە بـۆ منداڵ‌نووسین هەروا كـارێكی ئاسـان نییە ، چـونكە جگـە لە بەهرەیەكی خوایی‌و سەلیقەیەكی تەواو نـاسك ، شـارەزایی پەروەردەو نەشونمای[1] منداڵیشی گەرەكە .

وانەبێت من لێرەدا پێوانەیەكی تایبەتی یان نموونەیەكی ستاندارد « standard » م هێنابێت‌و بڵێم ئەبێت بەرهەمی منداڵ ئـاوهابێت‌و ئیتـر ئەگـەر جۆرێكی‌تـر بێت نابێت‌و بـە كەڵكی هیچ‌نایەت ، بەلام ئەوەندە ئەڵێم كە نووسەر هەر بە سەلیقەی خۆی ئەتوانێت بزانێت كە كاری بۆمنداڵ‌نووسینی لە باردایـە یان نا ؟! ئەتوانێت بە زرنگی خۆی لەوە بگات كە ئایا تۆماری بیرەوەریی‌و كامێرای چاوی دیمەنی ژیانی منداڵێتیان بە هەموو گفتوگۆو جۆری ووشەبەكارهێنانی ئەوسایەوە گرتووە یان‌نا ؟! ئایا سەرنجی ووردی زانیارانەی لە منداڵانی ئێستاو دیمەنی ژیان‌و جۆری گفتوگۆو ووشەكانیـان‌و هەڵس‌و كـەوت‌و یاری‌و قسەی‌خۆش‌و تەنانەت شەڕكردن‌و شەڕەجنێوەكانیان داوە یان نـا ؟! ئایـا تا چ رادەیـەك لەگـەڵ سـایكـولۆجیـای منـدالدا ئاشنایەتیی هەیە ، ئەم ئـاشنایـەتییە خـولیایـەتی‌و تەلی دڵی هەمیشە بۆی لێدەدات یان نا ؟

ئـەو ئەدیبـەی لەناو خـوێندەوارە گـەورەكانـدا بـالاو بەناوبانگە هیچ مەرج نییە لە مەیدانی نووسین بۆ منداڵاندا ئەو گەورەو بالایە بێت . بەڵكو بەپێچەوانەوە لەوانەیە كە بۆ منداڵ بنووسێت سەرنەكەوێت‌و رۆبچێت ، چونكە بـۆمنداڵ‌نـووسین رێی هات‌و نەهـاتە ، مـلی رێگاگـرتنێكە كـە یان ئـەتكەێنێتـە مەڵبەندی ئاوات یان بە ناخی ژێركەوتندا دەتباتە خوارەوە .

منداڵێك كە لە دایك دەبێت ، سەیر دەكەین دوای چەند مانگێك مووروویەك یان شتێكی لەو بابەتەی ، بە پەتكێكەوە ، بە دەسترازەی بێشكەكەی یان سـەری جۆلانـەدارینكەیـەوە بۆ هەڵدەواسن دوای ئەوە بەماوەیەك شەقشەقەیـەكی ئەدەنـە دەست ، كە كەوتە گاگۆڵكی‌و دارە دارە شتێكی‌تر ، تا ئەگەر كوڕ بوو بۆ خۆی حەز لە ئۆتۆمۆبیلێكی منـداڵان دەكات یـان ئەگەر كچ بوو دەست‌دەبات بۆ بووكێكی منداڵانەو ئەیگرێت بە بـاوەشی‌یەوە ، مـەسەلەی بـۆ منداڵ‌نـووسینیش شتێكەوا ، منداڵان هەموویان لە تەمەنێكدا نین ، هەر تەمەنە دەسكەوت‌و زەخیـرەخستنی ووشەی خـۆی هەیـە كە ئـەمـە نـاوەڕۆكی باسەكەمانەو بەدرێژی لێ‌ی ئەدوێین .

كە بۆ منداڵ دەنووسیت ، دەبێت جیهانێكی سەیر بێنیتە پێش‌چـاو ، منـداڵانی پـۆلی یـەكـەمی سـەرەتـایـی تـا هەشت‌ساڵان[2] ، ئەوەندە خەیاڵیان فراوان‌و بەربڵاوە كە هەر مەبەسەی دەوێت ، منداڵێك سواری قامیشێك یان لقەدارێـك دەبێت‌و قامچییەك بەدەستەوە دەگرێت ، قامیشە تاوئـەدات‌و خۆشی هەتـا گوڕی تێـدایە رادەكـات‌و ئارەقـەی رەش‌وشین دەكاتەوە ، كـەچی وا ئەزانێت ئـەسپی راستی‌یەو چـوارناڵە دەكات . یان سواری سنووقێك دەبێت‌و دەست بە سوكانەوە دەگرێت‌و پێ‌دەنێت بە بەنزینداو گێردەگـۆرێت‌و بەدەم دنیـا پـڕدەكات لە « دیـددیدو پـاپ‌پاپ » ، بـە خـەیـاڵی خـۆی لە ئۆتۆمۆبیلێكی راستیدایـەو لەسەر سـەت دەئاژۆێ ، بـەدەم

رویشتنیشەوە دەست بەرز دەكاتەوە بۆ هاوڕێكانیو بەدەمیانەوە پێدەكەنێت . وەكو لە دڵی خۆیدا بڵێت : ئەها من ئوتۆمۆبیلم هەیەو ئێوە نیتانە !! خۆ لە تەلەفزیۆندا كە بابەتی « میكیماوس » و « كیمبا » و « كاسپەر » و « سوپەرمان » و « گراندایزەر » و « لیدی ئوسكار » و « تۆم سویر» و « ساسوكی » و گەلێكیتر لەمجۆرانە دەبینێت ، زۆری لاخۆشەو لە خۆشیدا ئاگای لە دنیا نامێنێت ، بێئەوەی لە دڵی خۆیدا بلێت ئەم جولەو بازدانو فڕینە كاریكردە نینو لە راستییەوە دوورن !!! ، لە « راستییەوە دوورن » ئەوە هەر بە خەیاڵی گەورەدا دێت ، بەلام لە جیهانی مندالانی ئەو تەمەنەدا تەواو لە گەڵ خەیاڵە بەرزو بەربلاوەكانیاندا جووتن . منداڵ خۆی كە باسی تۆپین بۆ هاوڕێكانی دەكات ئەڵێت : « شەقێكم لە تۆپەكە هەڵدا چووە ئاسمانو نەگەڕایەوە !! » باشە ئیتر بۆ خەیاڵ فراوانیی منداڵ هیچ پێویست بەنموونەی دی دەكات ؟! ئەی ئاگاتان لێ نییە كە منداڵ لەگەڵ بووكەشووشەكانیدا قسەدەكات ، بە خەیاڵە فراوانەكەی خۆی هەروا ئەزانێت كە ئەمانە گیانلەبەرنو هاوڕێو رەفیقی ئەمن .

نووسەرێك كە بۆ منداڵی ئەو تەمەنە دەنووسێت كە باسكرا ، دەتوانێت سوود لەو خەیاڵە فراوانە وەربگرێت ، بێئەوەی حسابەكە بەپێی خەیالو هۆشی خۆی بكاتو بلێت : « كەی ئەمە وایە !! » چونكە كە وایووتو دەستی گێڕایەوە ئیتر ئەوە بیەوێتو نەیەوێت بۆ گەورە دەنووسێت نەك بۆ منداڵ . هەر لەبەر ئەمخەیاڵ فراوانییەشە كە مندالان گوێقولاغی حیكایەت دەبن ، لەگەڵ سەركەوتنی پاڵەوانەكەدا دڵخوش دەبنو چەپڵە لێ ئەدەن ، بە ئازارو ئەشكەنجەو ژێركەوتنیشی رووگرژو خەفەتبار دەبن ، چونكە بە خەیاڵی خۆیان وا ئەزانن خۆیان ئەو پاڵەوانەن ، وا ئەزانن لە خەوێكی خۆشدان ، هەر ناخۆشیو گیروگرفتێكی وەختیان كە هەبێت هەموویان لە بیردەچێتەوەو دەكەونە دۆخێكی ئاساییەوە ، كە ئەمە خۆی لەخۆیدا چارەسەركردنێكی سایكۆلۆجیانەی نایابە ، دیارە ئەمەش بە مەرجێك وایە كە مەبەستی سەرەكیی حیكایەتەكە دیاربێتو نەبێتە مایەی سەرلێشێواندنو بیرئالۆزاندنی ئەو مندالانە ، ئەم قسەیەی دوایمان نەك هەر بۆ حیكایەت بەڵكو بۆ جۆرە بەرهەمەكانی تریش تا رادەیەكی زۆر راستە .

دیسان ئەبێ نووسەر ئەوە بزانێت ئەو مندالانەی كە خەریكن هەشتساڵ بەرێدەكەن تا ئەوانەی كە دوانزەساڵن ، حەز بەو جۆرە حیكایەتانە دەكەن كە ئازایەتیو پاڵەوانێتیو سەركەشیو ملپێوەنانی تێدایە .

ئەم یەكدوو نموونەیەم هەر بۆیە هێنایەوە بۆ ئەوەی بلێم : بیرڕۆشنكردنو خۆخەریككردنو موتالاكردن ئەگەر بۆ هەموو نووسەرو ئەدیبێك پێویست بێت بۆ ئەوانەی بۆ مندالان دەنووسن پێویسترە[3] . چونكە هەرچی قۆناخی منداڵییە ، نەك هەر لە رووی دلۆدەرونەوە زوو زوو ئەگۆڕێت بەڵكو لە رووی نەشونمای « بایۆلۆجی » و « ئەقل » و « زمان » و « كۆمەلایەتی » و « ئینفعال (وسۆز Emotion » یشەوە هەمیشە لە گۆڕراندایە ، دەنا باسێكی وا هەر بۆ خۆی پێوستی بە لێدوانێكی دووروودرێژە كە ئێرە شوێنی نییەو پشتبەخوا لە داهاتوودا ئەگەر بۆمكرا شتێكی لەسەر ئەنووسم .

ئێستا دێمە سەر باسی دەسكەوتو زەخیرەخستنی ووشە لای منداڵ .

دەتوانین لە رێگای نەشونمای زمانی منداڵەوە ، نەشونمای ئەقلی بپێوین چونكە زمان ئامرازی بیركردنەوەیە ، منداڵێك دەسكەوتی ووشەی بە پێی تەمەنی زۆر بێت ئەوە نیشانەیەكە بۆ وورپایی و توانای ئەقلی ، چونكە دیارە باشتر ئەتوانێت مەبەستی خۆی دەربڕێتو باشتریش لە قسەی مامۆستایانو گەورەكانی خۆی دەگات . ئێستا زۆركەس لە مەیدانی سایكۆلۆجیی منداڵدا بایەخ بەم لایەنە دەدن ، لە سەردەمێكی پێش ئیستاشەوە بایەخی پێدراوە ، بۆ ئەمە تەمەنی منداڵیان كردووە بە چەند قۆناخێكەوە[4] ، لە هەر قوناخێكدا لە قسەكردنی منداڵ كۆڵیونەتەوەو توانیویانە ئەوە بزانن كە هەر منداڵە لە هەر قوناخێكی تەمەنیدا چەند ووشە فێردەبێت ، دیارە لێرەدا گەلێك شتی لاوەكی كاردەكاتە سەر ئەوەی كە منداڵێك لە گەڵ منداڵێكی تردا جیاوازی هەبێت ، وەكو لە یەكنەچوونی لەشو هێزو دروستی منداڵێك لە گەڵ منداڵێكی تردا ، وەكو ئەوەی لە ماوەیەكی ژیانی منداڵدا كچ لە كوڕ زۆرتر توانای فێربوونی زمانی هەیە ، وەكو جیاوازی مندالانی میللەتێك لە گەڵ مندالانی میللەتێكی تردا لە رووی داراییو باری ژیانو گوزەرانو ئاستی پێشكەوتنو شارستانێتییەوە . وەكو ووتمان ئەم هۆیانە لاوەكینو كاریان

لەم مەیدانەدا کاریگەر نییە ، بۆیە ئەگەر لێکۆڵینەوەکان زانیارانە بن و هەروەها ئەو ئامرازانەی لە تاقیکردنەوەکاندا بەکار دەهێنرین ئەوانیش هەر زانیارانە بن دەبینین کە ئەنجامەکان لەیەکتر نزیك ئەبنەوە .

ئەو « ئنگا » یەی بۆ یەکەمجار وەکو دەنگێك لە منداڵەوە هەڵدەسێت و دڵی باوکی چاوەڕوان و بێئارامی پشت دەرگای ژووری « لەدایكبوون » ەکە ئەگەشێنێتەوە ، بە یەکەم دەنگی منداڵ دادەنرێت ، ئەگەر چی زانا بایۆلۆجییەکان ئەوە بە دەنگ دانانێن ، بەڵکو بە هەناسەدانەوە یان وەلامدانەوەی ئەو ووژەی هەوایەی دەزانن کە دەچێتە سییەکانەوە ، واتە کارێکە لەدەست منداڵەکە خۆیدا نییە ، دوای ئەوە بە ماوەیەکی کەم دەنگەکە دەکەوێتە ژێر ڕکێفی منداڵەکە خۆیەوەو هەرجارە بە ڕەنگێك بۆ مەرامی خۆی بەکاری دەهێنێت تا دەگاتە « گفەوبقە » ئنجا « گروگاڵ » . منداڵ کە بەدەم گڕوگاڵەوە دەڵێت : « با ، دا ، بە ، دە ، نە » ، خۆی گوێی لە دەنگی خۆی دەبێت و بەو گوێلێبوونەش زۆردڵخوش دەبێت بۆیە حەزدەکات هەر یەکەیان دووبارە بکاتەوەو بڵێت : « با ... با » « دا ... دا » « بە .... بە » « دە ... دە » « نە ... نە » . ئنجا دایکی ووردەووردە هانی دەدات و ئەو دەنگانە دووبارە دەکاتەوە ،منداڵەکەش دیسان لە دوایەوە دەیانلێتەوە[5] ، بەمە خۆشییەکەی زۆرتر دەبێت چونکە سەیردەکات دایکیشی هاوکاریتی و هاوبەشی خۆشییەتی ، کار دەگاتە ڕادەیەك دایك دەست بۆ بووکەشووشەیەك ڕادەکێشێت و دەڵێت : « بەبە » منداڵەش دەیلێتەوە ، ئیتر ووردە وردە کە منداڵەکە وای لێهات بە بینینی بووکەشووشەکە ووتی : بە بە[6] » ئەوە مانای ئەوەیە کە یەکەم ووشەی جیهانی ئەو منداڵە لە دایكبوو .

تاقیکردنەوە سایکۆلۆجییەکان ساغیان کردۆتەوە کە « توانای[7] زمان فێربوون » لە سەردەمێکی نەشونمادا لای کچ زووترو گەشتر لە لای کوڕ سەر هەڵدەدات بۆیە لەو سەردەمەدا کچ زووترو زۆرترو باشتر فێری زمان دەبێت .

بۆ ئەوەی بزانرێت لە چ تەمەنێکدا یەکەم ووشەی جیهانی منداڵ لەدایك دەبێت ، گەلێك تاقیکردنەوە کراوە ، گرنگەکەیان ئەوەیە کە « بوتمان = Boteman [8] » ناوێك بەسەر « 35 » منداڵدا ، « 12 کوڕو 23 کچ » « لە هەشت مانگانەوە تاساڵێك و سێ مانگان » کردوویەتی « لەمانە 18 منداڵیان ئینگلیز ، 12 یان ئەڵەمان ، دوانیان فەرەنسی ، دوانیان بولگاری و یەکێکیان پۆڵۆنی بوو » لە ئەنجامدا گەیشتۆتە ئەوەی کە نزیکەی لە ( 29٪ ) یان لە دەمانگاندا یەکەم ووشەیان لەدەم دەرچووە ، لە (75٪) یان پێش ئەوەی یەکساڵان تەواوبکەن یەکەم ووشەیان لە دەم هاتۆتەدەر ، لە (50٪) ی کوڕەکان پێش یەکساڵان تەواوکردن یەکەم ووشەیان لە دەم دەرچووە ، کەچی کچەکان لە (87٪) یان پێش یەکساڵان تەواوکردن یەکەم ووشەیان لە دەم هاتۆتەدەر .

هەندێك لە زاناکان ، لەم مەیدانەدا ، لە تەنیا منداڵێك کۆڵیونەتەوە کە زۆرتر کچ یان کوڕیان بووە ، ئەمە لەچاو ئەو لێکۆڵینەوەو تاقیکردنەوانەدا کە بەسەر کۆمەڵێك یان چەند کۆمەڵە منداڵێکدا دەکرێت بایەخێکی زانیاریی ئەوتۆی نییە . بۆیە لێرەدا لێکۆڵینەوەکەی « سمیث = Smith »[9] ناوی ئەمەریکایی بخەینە پێش چاو باشە کە « 15 » کۆمەڵە منداڵی هێناوەو هەر بۆ ئەوەی بزانێت منداڵ لە هەر تەمەنێکدا دەسکەوت و زەخیرەخستنی ووشەی چەندە ، دەستی کردووە بەکار . بە سەرنجدانە ئەم لیستەیەی خوارەوەدا ئەنجامی لێکۆڵینەوەکەیمان بە باشی بۆ دەردەکەوێت .

| تەمەن بە ساڵ و بە مانگ | ژمارەی منداڵ | ژمارەی ووشە |
|---|---|---|
| هەشت مانگان | 13 | 1 |
| دە مانگان | 17 | 3 |
| یەکساڵان | 52 | 3 |
| ساڵێك و سێ مانگ | 19 | 19 |
| ساڵێك و شەش مانگ | 14 | 22 |
| ساڵێك و نۆمانگ | 14 | 118 |
| دوو ساڵان | 25 | 272 |
| دووساڵ و شەش مانگ | 14 | 446 |
| سێ ساڵان | 20 | 866 |
| سێ ساڵ و شەش مانگ | 26 | 1222 |
| چوارساڵان | 26 | 1540 |
| چوارساڵ و شەش مانگ | 32 | 1870 |

| | | |
|---|---|---|
| پێنج ساڵان | 20 | 2072 |
| پێنج ساڵ و شەش مانگ | 27 | 2289 |
| شەش ساڵان | 9 | 2562 |

« نەجمەددین عەلی مەردان » یش لە ماجستێرنامەکەیداو لە مەیدانی نەشوانمای زمانی منداڵانی چوارساڵان و پێنج ساڵانی باخچەی ساوایاندا هەر تاقیکردنەوەکەی « سمیث » ی بە نموونە هێناوەتەوە[10].

تاقی کرنەوەی دیکەش هەیە ، ئەنجامەکانی لەمەکەی « سمیث » ەوە نزیکن بۆیە پێویست بە نووسینی ناکات ، ئەوەندە هەیە ئەو تاقیکردنەوانەی کە بەسەر منداڵانی هەراشتر لە شەش ساڵاندا کراون دەڵێن : کە دەسکەوت و زەخیرەخستنی ووشە لای منداڵی هەشتساڵان (3600) و دەساڵان « 5400 » و دوانزەساڵان « 7200 »[11] ووشەیە .

تائێستا لەو لێکۆڵینەوانەی لە زانکۆی بەغدا لەم بارەیەوە لە شێوەی ماجستێرنامەدا پێشکەش کراون ، من چەند دانەیەکیانم دیون ، لێرەدا هەر ماجستێرنامەکەی « سمیرة عبدالله عبدالواحد »[12] دەخەمە پێش چاو ، چونکە لەسەر قوتابیانی پۆلی سێیەم و چوارەمی سەرەتایی یە ، کە ئەمانە لە ناو هەموو قوتابیانی پۆلە سەرەتاییەکاندا . دەکەونە ناوەڕاستیانەوە .[13]

سەمیرە لە لێکۆڵینەوەکەیدا ساغی کردۆتەوە کە تێکڕای دەسکەوتی منداڵی پۆلی سێیەم لە زماندا « 3200 » و منداڵی پۆلی چوارەم « 3800 » ووشەیە ، دیسان ئەوەی ساغ کردۆتەوە کە زوربەی ووشەکان « ناو »[14] ن دوای ئەو « فەرمان » ئنجا کەمێکی ئامرازی « پەیوەندی Preposition »[15] ن . دیسان ئەوەی ساغ کردۆتەوە کە زوربەی ووشەکان لە چوارپیت ، دوای ئەو لە پێنج پیت ئنجا لە سێ پیت پێکدێن ، هەروەها ئەنجامی لێکۆڵینەوەکە دەڵێت کە ووشەی منداڵانی ئەو تەمەنە زۆریان بە پیتی « ئا » ئنجا « ب » ئنجا « ت » ئنجا (س) دەست پێ دەکات .

ئەم لێکۆڵینەوانە لەبارەی دەسکەوت و زەخیرەخستنی ووشەوە لای منداڵان بە زمانە بێگانەکان سوودی بۆ ئەدەبی منداڵانی ئەو زمانانە هەیە[16] . ئەگەر کوردیش ئەم جۆرە لێکۆڵینەوانەی لە زمانی منداڵانی خۆیدا بێت[17] ، ئەوا ئەو نووسەرو شاعیرانەی بۆ منداڵانی کورد دەنووسن لە بەرهەمەکانیاندا سوودی لێ وەردەگرن و منداڵانیش بە خوێندنەوەی ئەو بەرهەمانە سوودمەندتر دەبن . ئەم لێکۆڵینەوەیەی سەمیرەو ئەوەکەی « حسون و هورمز »[18] یش هەروەها هەموو ئەوانەی لە ناو ئەو میللەتانەدا کراون کە خوێندن و ڕۆشنبیریان تا ڕادەیەکی زۆر بە زمانی ناو قەوارەی تایبەتی خۆیانە ، ئەوە دەسەلمێنن کە ئاستی ڕوشنبیریی خێزان کارێکی گەورە دەکاتە سەر زۆربوونی دەسکەوتی ووشە لای منداڵان بە زمانی مادەرزادی خۆیان[19] . واتە بە زمانی ئەو دایکەی لێی بوون .

با لە کلاوڕۆژنەی ئەو قسانەوە کە تا ئێستا کران ، بڕوانینە چەند بەرهەمێکی ئەم دواییەی مەیدانی ئەدەبی منداڵانی کورد ، ئەگەر لە دەرەوەی ئەو کلاوڕۆژنەیەشەوە ووردە سەرنجم هەبوو ئەوا هەر دەیخەمە پێش چاو . با « چۆلەکە پاساری » یەکەی کاکەی فەللاح کە بریتییە لە « 23 » شیعرێك لە « 54 » لاپەڕەی پچووکدا ، پێشخەین . شایانی باسە کە ئەم دانەیەی ئێستا لەو بەرهەمە لەبەر دەممدایە ، پێشکەش کراوی دەستی کاکەی فەللاح خۆیەتی کە بە دەستی پڕ ڕێزەوە وەرم گرت .

شیعری « ڕێزی مامۆستا » ، کە بە دەم منداڵێکەوەیە کە تازە پێ ئەنێتە قوتابخانەوە ،؛ واتە یان شەشساڵانی تەواوکردووە یان نەی کردووە[20] ، شیعرەکە دەڵێت :

**« ڕێزی مامۆستا لە سەرچاومە**
**ڕەگی پەروەردەی لە هەناومە »**

منداڵ لەو تەمەنەدا کوا لەو « ڕەگی پەروەردە » یە دەگات و چۆن لەو « لە هەناومە » یە دەگات کە خۆی « لەهەناومایە » یەو پێویستیی شیعر وای لێ کردووە . من پێم وایە هەر لەم شیعرەدا ووشەی « خولیا » بو منداڵی ئەو تەمەنە نابێت . دووەم شیعر « منداڵ و نەورۆز » لاپەڕە « 7 »

**ڕۆژی سەیران و گەشتە**
**کوردستانمان بەهەشتە**
**شەریف و مامەیارە**
**قەشقۆلی و سەرچنارە**

ئەو « شەریف » ە لە پەراوێزدا پێویستیی بە ڕوونکردنەوە هەیە ، خۆ ئەمە هەر بۆ منداڵی سلێمانی نییە ، لە شوێنانی تر لە

باوك‌و دایكیشیان بپرسن ره‌نگه نه‌زانن كه مه‌به‌ست كاریزی وه‌ستا شه‌ریفه ، لام وایه « قه‌شقۆلی » یه‌كه‌ش هه‌ر پێوستی به ته‌نكه روونكردنه‌وه‌یه‌ك هه‌بێت .

ل « 9 » ئێمه‌ین قاڵبووی بۆته‌ی خه‌بات » . ئه‌و « قاڵ بوون » و « بۆته » یه كوا ده‌سكه‌وت‌و زه‌خیره‌خستنی ووشه‌ی جیهانی منداڵه ، دوای به‌رێكردنی قۆناخی منداڵی‌و سه‌رهه‌ڵدانی قۆناخی هه‌رزه‌كاریش هێشتا زۆر هه‌ن له‌و دوو ووشه‌یه سه‌ریان ته‌قه‌ی دێت .

**ل « 11 » : « ساڵ به‌بێ ئێمه گیانی مردووه »**

**« كه ساڵ بوو ، مێژووش دیاره زیندوه »**

من ئه‌قڵم نایبڕێت كه منداڵ له له‌تی دووه‌می شیعره‌كه بگات .

**ل « 12 » : باخچه‌ی سه‌رچنار**

**« ده خوایه هه‌ر ئاوابێ**

**هه‌میشه هه‌ر ئاوابێ »**

ئه‌و دوو « ئاوابێ» یه به زۆربه‌ی هه‌رزه‌كارو لاویش له‌یه‌ك جودا ناكرێنه‌وه ، ئیتر كاكه حه‌مه چۆن ئه‌بێت به منداڵاندا رابپه‌رموێت كه ئه‌و شیعره‌یان خوێنده‌وه نه‌ك هه‌ر تێی بگه‌ن به‌ڵكو چێژیشی لێ‌وه‌ربگرن .

ل « 36 » : گوڵی سێ وه‌رزه » كه مه‌به‌ستی ئه و منداڵه‌یه كه له باخچه‌ی منداڵانه ، منداڵه‌كه‌ی چوواندوه به گوڵ‌و ده‌ڵێت :

**« گوڵی من بێ ئینجانه‌یه**

**بۆ په‌روه‌رده په‌روانه‌یه »**

یه‌كسه‌ر نالێم منداڵ له‌مه ناگات ، وا خۆم ماناكه‌ی لێك‌ئه‌ده‌مه‌وه ئنجا خۆتان سه‌رپشك بن . كاكه‌ی فه‌للاح ئه‌یه‌وێت بڵێت : كه منداڵی باخچه‌ی منداڵان وه‌كو په‌پووله‌یه‌ك وایه به ده‌وری « په‌روه‌رده »دا ده‌گه‌رێت كه په‌روه‌رده‌كه وه‌ك چرایه‌كی گه‌ش وایه . راسته په‌روانه له كه‌له‌پووری ئه‌ده‌ب‌و فۆلكۆرماندا له جیاتی په‌پووله به‌كارهێنراوه ، به‌لام له‌جیهانی منداڵدا ، منداڵ هه‌ر « په‌پووله » كه‌ی پێ‌خۆشه‌و ده‌سكه‌وت‌و زه‌خیره خستنی ووشه‌ی لای خۆیه‌تی‌و هه‌رچی « په‌روانه » كه‌ش هه‌یه له خه‌رمان‌و زه‌خیره‌ی‌زمانی ئه‌ودا بۆ «ته‌یاره‌ی » « یه‌ك په‌روانه » و « دوو په‌روانه » زۆر به ئاسانی به‌كارهێنراوه ، ئیتر ئه‌وچی‌یه‌تی به‌سه‌ر ئه‌وه‌وه كه ئه‌م دوو ووشه‌یه له رووی جووڵه‌و ماناوه یه‌كن . ئه‌مه‌وێت بڵێم « په‌روانه » به‌و مانایه‌ی كاكه‌ی فه‌للاح به‌كاری هێناوه بۆ ئه‌ده‌بی گه‌وره‌یه‌و منداڵ له‌و شوێنه‌دا به‌كاری‌ناهێنێت .

**ل « 45 » : « چۆن ، چۆن ، په‌یت پێ‌بردن**

**بۆ من وا دابه‌شكردن »**

باشه منداڵ له « په‌ی پێ بردن » به باشی ده‌گات ؟!. ئه‌توانم نموونه‌ی تریش له‌م بابه‌ته پیشان‌بده‌م به‌لام ئه‌وه‌ی تا ئیستا پیشاندرا ، بۆ ئه‌م مه‌به‌سته ، به‌سه .

ئه‌گه‌ر له ده‌ره‌وه‌ی كلاوروژنه‌ی باسه‌كه‌وه ، سه‌رنجم هه‌بێت ئه‌وه‌یه كه وێنه‌كانی ناو « چۆله‌كه پاساری » زۆر بچووك‌و نادیارن‌و ده‌ستی كه‌مته‌رخه‌می‌و ده‌ستنوقاویان به‌ئاشكرا پێوه دیاره ، ئه‌گه‌ر ده ، دوانزه سالێك له‌مه‌وبه‌ر هه‌ڵه‌ی وا بكرایه ره‌نگ‌بوو نه‌بوونی نه‌خشكێشی منداڵان‌و دواكه‌وتنی هونه‌ری چاپه‌مه‌نی بكرایه به بیانوو ، به‌لام ئێستا كه نه‌خشكێشی وه‌كو « عه‌لی مه‌ندلاوی » و كه‌سانی‌تر بین بۆ ئه‌بێت به‌وێنه‌ی‌واو به‌شوێنی وا ته‌نگه‌به‌ر رازی‌ببین . به‌رامبه‌ر پیته‌كانیش وه‌كو سه‌رنجم داوه له زۆر شوێندا « ئه » وه‌كو « نه » نووسراوه .

به‌رهه‌می دووه‌م « به‌هه‌شتی منداڵان » ه‌كه‌ی « دایكی سۆلاف » ه كه له 1983 دا چاپكراوه . تێكرا دایكی سۆلاف له‌و ووشانه‌وه نزیك‌بۆته‌وه كه ده‌سكه‌وت‌و زه‌خیره‌ی منداڵن چونكه جگه له به‌هره‌و سه‌لیقه‌یه‌ك كه له شیعره‌كانیدا ، له‌م مه‌یدانه‌دا به‌دی ده‌كرێت ، ره‌نگه ئه‌وه‌شی چووبێته‌پاڵ كه دایكه‌و له‌و دایكانه‌شه كه كوردییه‌كه‌یان نه‌ژاكاوه . « مریشكه كوله » و « باخچه‌ی مالمان » و « بووكه‌كه‌م » و « باخچه » و « بووكه‌به‌بارانێ » و « به‌رخه‌كه‌م » و چه‌ند شیعرێكی تریشی له كلاوروژنه‌ی باسه‌كه‌مانه‌وه به شیعره‌سه‌ركه‌وتووه‌كانی ده‌زانم ، هه‌ر له هه‌مان كلاوروژنه‌وه ، له‌ته‌شیعری « بۆ سه‌ر شالقی ئاوات ل 21 » وله‌ته‌شیعری « ژێر تیشكی ئه‌م ره‌نجه‌ما ل 27 » و « هه‌ست بزوێنی ل 32 » به‌وانه ئه‌زانم كه منداڵ باش تێیان‌ناگات . له چه‌ند لایه‌نێكی‌تره‌وه كۆمه‌ڵه سه‌رنجێكم هه‌ن كه ئه‌مانه‌ن :

ل « 6 » : شیعری (سێو) له‌سه‌ر زمانی منداڵێك به سێوێك ده‌ڵێت :

**وه‌كو تۆپ هه‌ڵی‌ئه‌ده‌م**

**دوای ئه‌وه نۆشی‌ده‌كه‌م**

**یا :**

**تێر بۆنی هەڵئەمژم**
**بەسنگمەوە ئەیگوشم**
**ئەینێمە بەینی دوولێو**
**زۆر خۆشە خواردنی سێو**

خواردنی سێو خۆشە ، ئەمە راستەو لەسەر سەرم بەلام لە رووی پەروەردەی دروستییەوە ، چۆن دەبێت سێویەك هەڵبدرێت ، تێر بۆنی هەڵمژرێت ، بە سنگەوە بگوشرێت ئنجا بخورێت ؟!

لە « ل : 34 شیعری « کارژۆلە » دا دەڵێت :

**« تۆم خۆش ئەوێ کارژۆلە**
**بباعێنە بەرخۆلە »**

ئەگەر کارژۆلە بێت ، بەرخۆلە نییە !

لە شیعری « بۆق بۆقیلە ، ل : 52 » لەسەر زمانی منداڵێك بە بۆقەکە دەڵێت :

**« هاوڕێی کوڵو خونچەکەم**
**هەڵقونە سەر پەنجەکەم »**

ئەمیش وەکو مەسەلەی « سێو » ەکە لەرووی پەروەردەی دروستییەوە ناگونجێت . ئێمە لە وولاتێکدا این کە نە گۆشتی بۆقی تێدا دەخورێت و نە دەست لە بۆقەوەدان بە شتێکی راست دەزانرێت ، ئیتر بۆ هەڵقونێتە سەر پەنجەی منداڵەکانمان ، خۆ خاڵخاڵۆکە نییە !!.

لە شیعری « نەبەزین ، ل : 54 » دا لەسەر زمانی منداڵان دەڵێت :

**« تەرزەی ناو دەغڵو هەردین**
**چاو نەترس و نەبەردین »**

تەرزەی ناو دەغل زیاندارەو وەزنی هەیە ، هەرچی منداڵە بێزیانەو وەزنی نییە .

ل « 54 » دەڵێت :

**« چاوەڕوانی بەهارین**
**هاوار ئەکەین بۆ نەژین »**

« ین » ی بەهارینو « ن » ی « نەژین » پاش قافیەنو بە قافیە حساب ناکرێن ، ئەوەی دەمێنێتەوە « نەژی » یە کە نابێت بە قافیە بۆ بەهار کە ئەمە ناوەستاییە لە شیعردا ، نەخوازەلا شیعری منداڵانیش ، کە تا نەغمەی خۆشو ووشەی پڕ مۆسیکاو لەرەی ناسكو قافیەی سواری زۆربێت لای منداڵ پەسەندترەو سەیردەکەین هەر لەخۆیەوە دەیڵێتەوەو ئاوازی بۆ دائەنێت و چەپڵە دەکوتێت و بەدەم چەپڵە کوتانەوە پێدەکەنێت و دەیکا بە هەرا ، بۆیە پێش چوونە قوتابخانە لە گەڵ هاوڕێکانیدا بە دڵی خۆیان ئەم جۆرە شیعرانە بەگۆرانی و چەپڵەوە دەڵێنەوە :

**« هەناران و مەناران**
**یاخوا داکاتە باران**
**بۆ فەقیرو هەژاران . »**

**« حاجی لەقلەق مار هات**
**ماری زەنگەو زار هات »**

دیارە زۆری تریش لەم بابەتانە هەن ، ئەمانەی من نووسیومن مشتێکن لە بارێك .

بەرهەمی سێیەمیش « جەژنانە » ەکەی لەمەڕ « دکتور عیزەدین مستەفا رەسوول » ە کە لە زمانی رووسییەوە کردوویەتی بە کوردیو بریتییە لە پێشەکییەك و « 15 » شیعر لە (74) لاپەڕەدا .

لەم باسەدا لە دەسکەوتو زەخیرەخستنی ووشەی لای منداڵ دوام بەو مەبەستەی ئەو کتێبو گۆڤارو شیعرو حیکایەت و نووسینانەی بۆ منداڵ دەنووسرێن بە شێوەیەك بن کە لەگەڵ دەسکەوتی ووشەیدا بگونجێن و نووسینەکە ئاسان و ئاوازدار بێت تا نەبێتە تەگەرە لە رێگای فێربوونیدا . من لەو خاڵانەی کە دکتور لە پێشەکییەکەیدا باسی کردوون ـ جگە لە خاڵی چوارەم ـ نەك هەر لاریم لێیان نییە بەڵکو بەراستیشیان دەزانم[2] . ئەو خاڵی چوارەمەش کە من لاریم لێیەتی دەڵێت : « لە رووی ناوەڕۆکەوە پلەی حیکایەتەکان لە گەڵ منداڵی تەمەنی جیاجیادا دەگونجێن ، وا بزانم بۆ « راز » ی دوانزدەساڵانە دەستدەدەن و بەشی « زینۆ » ی سێ ساڵانی تێدایەو خۆیان بۆ ساڵێکی تری « زەریا » ی یەك ساڵانیش دەخەنە رێ . »
دیسان دەڵێت : « ... هەر لە بەر ئەوە پێشکەش بەوان و بە یاری « 9 ساڵ » و « بادە » ی «5 ساڵ» و هەموو هاوتەمەنە هاوزمانەکانیان کرا ، بەلام لە رووی زمانەوە ، ئەگەر کەمێك ژوور تەمەنیش کەوتبم ، ئەوا حەزم کرد ، چۆن ئێمە لە رێی حیکایەتی گوێ ناگردانەوە ، هەر لە منداڵییەوە زۆر ووشەو زۆر ئیدیۆمی کوردی فێرکراین . شتێك لەو سامانەش بە نووسین

بگەێنمە ئەوەی پێگەیشتومان . » ـ تائێرە قسەکانی دکتۆر بوون .

ئەو حیکایەتانە وەکو دکتور دەڵێت بۆ (رازی) دوانزە ساڵان‌و « یاری » نۆساڵان دەشێن‌و پیرۆزیان بێت . بەڵام لەبەر رووناکی ئەو قسەو لێکۆڵینانەوە کە باسکران چۆن « بەشی « زینۆ » ی سێ‌ساڵانی تێدایەو خۆیان بۆ ساڵێکی‌تری « زەریا » ی یەکساڵانیش دەخەنەرێ » ؟! دکتور خۆی لە خاڵی دووەمدا کە لەو خاڵانەیە منیش بەراستیان دەزانم دەڵێت : « چونکە لە لایەنە زانستی‌یەکەوە باوەڕم وایە کە بەرهەمێکی وەك ئەمە خۆی ـ واتە ئەسڵەکەی ـ (ئەسڵی جەژنانە ، ف .ع) پشت بە تاقی‌کردنەوەی درێژی نووسەرەکانی‌و نووسەرە هاوزمانەکانیانەوە دەبەستێ‌و ئەو نووسینە دەبەستێ بە بناغەی زانستی خۆیەوە . » کە ئەمە قسەی دکتور خۆی‌بێت ئیتر چۆن قسەیەك دەکات کە لە گەڵ ئەو بناغە زانستییەدا یەك‌نەگرێتەوە ، هەر لەو « جەژنانە » یەدا حیکایەتی (پەشێوی) مەبەستی ئەوەیە لە گەورەی بگەیەنێت کە دەبێت بەپێی دەسکەوتی ووشەی منداڵ لە هەرتەمەنێکدا گفتوگوی لەگەڵدا بکەین‌و ووشەیەك بەکار نەهێنین کە لە دەسکەوت‌و زەخیرەی ئەودا نەبێت ، (دایکەکە بە ڤیدیای ووت ماڵەکەم پەشێو ناوێت‌و رۆیشت ، ڤیدیا کە (بەپێی حیکایەتەکە) دەیتوانی بشخوێنێتەوە ، لە « پەشێوی » نەگەیشت ، وای زانی چوکلێتێکی تازەیەو ناوەکەی وایە ، هەستا ماڵەکەی ژێرەوژوورکردو دای‌بەسەر یەکداو « پەشێوی » ی نەدۆزیەوە[22] !!! ) ، کە ئەمە وابێت ئیتر حیکایەتەکانی « جەژنانە » چۆن بەشی (زینۆ) ی سێ‌ساڵانی تێدادەبێت‌و چۆن بۆ ساڵێکی‌تری (زەریا) ی یەکساڵان خۆیان دەخەنەرێ[23] ؟!

بۆ (بادە) ی پێنجساڵانیش کە بەپێی تەمەنی دەبێت لە باخچەی منداڵاندا بێت ، چونکە لە باخچە فێری نووسین‌و خوێندن‌و بیرکاریی ناکەن ، ئەو حیکایەتانەیان دەخەنە بەردەست کە نووسینی لەسەر نییەو هەر بە وێنەکان لە حیکایەتەکە دەگەن[24] .

ئەگەر لە کڵاوڕۆژنەی باسەکەمانەوە بڕوانمە (جەژنانە) کەی دکتۆر وەریگێڕاوە دەڵێم :

« ئەم شەرم بە خۆ هاتنە ، ل 23 » و « عەرەبانەیەکی لە ماسی پڕی رادەکێشا ، ل 30 » و « خۆ لە مەترسی پاراستن ، ل 67 » جۆرە دارشتنێکە کە بۆ منداڵ ناشێت چونکە لە سێ ووشە زیاتر دراونەتە دەمیەك ئنجا مانایەکی بەخشیوە ، ئەمە جگە لەوەی کە منداڵ ئەگەر بیەوێت مەبەستێکی وا دەرببڕیت ناتوانێت‌و ناشییەوێت ئاوا سێ‌چوار ووشە بخاتە دەمیەك ، هەر لە (دەسکەوت‌و زەخیرەخستنی ووشە لای منداڵ) لەم شێوەدارشتنە نییە[25] .

## پەراوێزەکان :

1 — یەکێك لەو نەشونمایانە ، نەشونمای زمان ، ە ، واتە دەسکەوت‌و زەخیرەخستنی ووشە لای منداڵ بە پێی تەمەنی .

2 — قۆناخی منداڵێتی تێکڕا خەیاڵی تێدا فراوانە ، بەڵام توندوتیژی ئەم خەیاڵە فراوانە لەو ملوەیەدا سەرهەڵدات‌و بەئاشکرا دیاردی دەدات .

3 — سەیرکردنی بەرنامەی منداڵان وفلیمی منداڵانیش لە تەلەفزیوندا بەشێکە لەو بیرڕوشنکردن‌و خۆخەریککردنە .

4 — ئەم قۆناخانە وەهمین ، تەنیا بۆ ئاسان‌کردنی لێکۆڵینەوە دانراون وەکو چۆن لە جوگرافیادا هێل کەمەرەیی‌و هێل پانی‌و هێلی درێژی دانراون . دەنا قۆناخەکان سەرجەمەکانیان بەیەکەوەنووساون‌و دەشچنەناویەکەوەو جودانابنەوە .

5 — د . مصطفى فهمي ـسايكولوجيه الطفوله‌و المراهقة ، مصر ، دار مصر للطباعة ص 136

6 — ماموستاو شاعیری بەرێز ع . ع شەونم ئەم ووشەیەی بە شێوەیەکی سەرکەوتوانە لە ئەدەبی منداڵاندا بەکارهێناوە

بەبە ، بەبە ، پچکۆلە

ئۆخەی ، ئۆخەی ، بەرخۆلە

ع . ع. شەونم ، چرۆ ، سلێمانی ، چاپخانەی راپەڕین چاپی‌دووەم ، 1974/4/30 . ل » 15 « . .

7 — زانا کۆنەکان بۆ هەموو « توانا = قدرة » یەك هەر ووشەی « زیرەکی » یان بەکاردەهێناو بڕواشیان وابوو کە ئەوی لە مەیدانێکدا زیرەك بێت ئیتر لە هەموو مەیدانەکانی‌تردا هەر زیرەك‌دەبێت ، زانایانی ئەم دوایی‌یە هاتنە سەر ئەو بلوەڕەی کە ئەو قسەیەی ئەوان راست‌نییە ، بەڵکو زیرەکی بەسەر چەند توانایەکدا دابەش‌دەکرێت‌و مەرجیش‌نییە مرۆڤ لە هەموو تواناکاندا هەر ئەسپی تاوبدات‌و بکەوێتە پێش‌هەموان . هی وا هەیە توانای زمانی هەیەو لە مەیدانی نووسیندا سوارچاکە ، مەرج نییە هەر ئەو زەلامە لە توانای میکانیکیشدا هەر سوارچاك بێت‌و لەهەر شوێنێکدا ئۆتۆمۆبیلەکەی پەکی‌کەوت ، ئەوەندەی بلێیت یەك‌ودوو چاکی‌بکاتەوەو هەلسێتەسەرپێ ، یان مەرج نییە ئەوەی لە « توانای ژمارە » دا واتە لە مەیدانی « بیرکاری ـ ماتماتیك » دا مێشکێکی رووناك‌و دەستێکی باڵای هەبێت ، ئیتر هەر ئەو کەسە دەبێت لە توانای مۆسیکا یان نیگارکێشان یان خۆشنووسیشدا هەمان باڵادەست‌و لێهاتووبێت . ئەوەندە هەیە ئەگەر یەکێك خوا بیداتێ چەند

توانایەکی تێداکۆبووبێتەوە ، واتا لە چەند توانایەکدا وەستاو کارامەبێت خۆ ئەوە شتێکی گەلەك باشە ، هەتا ئێستا زاناکان پتر لە « 65 » توانایان دۆزیوەتەوە .

8 — سەرچاوەی ژمارە (5) ل 138

9 — = = = ل 140

10 — نجم الدين علي مردان ، رياض الاطفال في الجمهورية العراقية بغداد ، مطبعة الزهراء (1972) ص62, 63

11 — بڕوانە : « احمد نجيب ، فن الكتابة للاطفال ، مصر ، دار الكاتب االعربي للطباعةو النشر 1968 ص40

12 — سميرة عبدالله عبدالواحد ، المحصول اللفظي لتلاميذ الصفين الثالث والرابع الابتدائي ، رسالة ماجستير ، آذار ، 1982 .

13 — بۆ سەرنجێکی سەرپێیدان لەو لێکۆڵینەوانە دەتوانیت سەیری سەرچاوەی پێشو ل 34 — 51 بکەیت .

14 — لێکۆڵینەوەکەی « الكبيسي » ش کە هەر ماجستێرنامەیە ئەمە ئەسەلمێنێ ، هەمانسەرچاوەی پەراوێزی 12 . ل 38

15 — حەرف « جر »

16 — لەو زمانانەشدا ئەگەر نووسەر ئەم باسە گرنگە ڕەچاو نەکات هەر دەکەوێتە هەڵەوەو ڕەخنەی لێ دەگیرێت . ئەوەبوو لە 1984/3/4 دا ، یەکشەمە ، لە بەرنامەی « کتێبخانەی سینەمایی » دا فلیمی « دواشەوی جەژنی لەدایکبوون » پیشاندرا ، « تۆمی » و « لاری » کە هەردووکیان نۆساڵانبوون ، دوو پاڵەوانی فلیمەکەبوون . ئەوەی فلیمەکەی پێشکەشدەکرد ، مامۆستایەکی هێنابوو ، فلیمەکەی هەڵدەسەنگان ، یەکێك لە ڕەخنە دیارەکانی کە لەو فلیمەی گرت ئەوەبوو کە « تۆمی » و « لاری » قسەکانیان لە خۆیان گەورەترن .

17 — لەرۆژنامەی « العراق » و گۆڤاری « کاروان » دا خوێندومەتەوە کە دکتورانامەکەی « عبدالستار طاهر شريف » لەسەر دەسکەوتی ووشە دەبێت لای منداڵ ، جا ئەگەر ئەو کۆمەڵەمنداڵانەی کە بە « نموونە sample » بۆ لێکۆڵینەوەکەی وەریان دەگرێت کورد بن ، ئەوا بۆ گەشەپێدانی ئەدەبی منداڵانی کورد لەلایەن نووسەرانی ئەم مەیدانەوە بەسوود دەبێت .

18 — سەرچاوەی ژمارە (12) لە پەراوێزەکاندا ل 45

19 — دیارە لەناو کوردا ، ئەمە نەك هەر وانییە ، بەڵکو بەپێچەوانەوەیە ، سەیر دەکەیت منداڵێك لەناو خێزانێکی نەخوێندەوارو ناڕۆشنبیردا ، دەسکەوتی ووشەی جیهانی منداڵانی بە پێی تەمەنی خۆی زۆر زۆرترە لەو منداڵەی کە لە ناو خێزانێکی خوێندەوارو ڕۆشنبیری ئێستاماندا گەورەدەبێت چونکە هەرچی ئەم خێزانەی دواییەیانە دەمهەڵناهێنێتەوەو ڕستەیەك نالێت ئەگەر دووسێ ووشەی ناکوردیی تێدانەبێت ، تۆ واز لەوە بێنە کە هۆیەکەی چییەو چینییە ، بەڵام هەر نەختێك بە تەنگەوەهاتن و کۆڵبەزمانەکەوە هەڵگرتن و لەبەر خاتری منداڵەکانی خۆمان ، با وا قسەبکەین کە ئەگەر منداڵەکانیشمان فێری دەسکەوتی ووشەی تەمەنی خۆیان نەکەین ، هیچنەبێت سەریان لێنەشێوێنین و ئەو نەختە ووشانەش کە لە هەندێك شوێندا لە قوتابخانە فێردەبن لێیان نەگۆڕین و لەبیریان نەبەینەوە . ئەڵێن قسە ، قسەئەهێنێت ، ڕۆژی یەکشەمە ، « 11 / مارت » لە سلێمانی خۆم کرد بە « کتێبخانەی سلێمانی » دا بۆ گۆڤارو ڕۆژنامەکڕین ، کە سەیرمکرد کاك مستەفا ساڵح کەریمی هاوڕێم و کاك ساڵح حەمەئەمینی چیرۆکنووس و کاك عەزیز عومەری ئەندازیاری کشتوکاڵ ئەوانیش لەوێن ڕۆژنامەدەکڕن ، لەپڕ ئافرەتێك خۆی کرد بەژووردا و ووتی : « اصباغی بۆستەری ماڵی » هەیە !!. دوایی لە کاك مستەفام پرسی بەوناوەوە کە تۆ مامۆستاو بەڕێوەبەری قوتابخانەی سەرەتاییت ، منداڵەکانی لای ئێوە بە « اصباغی ماڵی » دەڵێن چی ؟ زۆر لەسەرخۆ ووتی پێیئەڵێن : « بۆیەی ئاوی » !.

20 — هەر منداڵێك کە لە سەرەتای ساڵی خوێندندا دەچێتە قوتابخانە ، ئەگەر شەشساڵانی تەواوکردبێت ئەوا وەردەگیرێت ، ئەگەر تەواویشی نەکردبێت هەر وەردەگیرێت و بۆی هەیە لە « 1/31 » ی ساڵی تازەی ناو ئەو ساڵی خوێندنە شەشساڵان تەواوبکات .

21 — بۆ بینینی ئەو خاڵانە سەیری « جەژنانە » ، وەرگێڕان دوکتور عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ ، بەغداد ، (مطبعة الاديب البغدادية ، ساڵی 1982 » بکە .

22 — من هەر مەبەستی حیکایەتەکەم نووسیوە ، دیارە خۆی بە جۆرێکیتر دارێژراوە ، حەزم ئەکرد خوێنەری بەڕێز لە لاپەڕە (11) ی « جەژنانە » دا بیخوێنێتەوە .

23 — لە کتێبخانەی منداڵاندا وەکو « کتێبخانەی منداڵی عەرەب » ی (مەنسوور) لە بەغدا ، هەر منداڵێك پۆلی یەکەمی سەرەتایی تەواونەکردبێت نایەڵن بچێتەژوورەوە بۆ خوێندنەوەو پێناسەشی بۆ ناکەن ، چونکە هەرماسانی ئەو نامیلکەو گۆڤارانە بۆ ئەو منداڵانەیە کە سەرەتاییەکی « ئەلفوبێ » و « بیرکاری » لە قوتابخانە فێربوون و لەو نووسینانە دەگەن ، نەك منداڵێك کە گەورەیەك دایبنێت و حیکایەتی بۆبکات ، ئەم باسەی منیش هەر لەسەر ئەو بنچینەیەو بۆ ئەو مەبەستە نووسراوە .

24 — بۆ نموونە بڕوانە (الارنب و القنفذ و شجرة الصبار) تاليف : شفيق مهدي ، رسوم : ميعاد خليل ، الاخراج الفني : شريف الراس . دار ثقافة الاطفال ، مكتبة الطفل 32 سلسلة البراعم ، 1981 .

25 — ساڵی 1973 ، لە (ڕوشنبیری نوێ) دا شتێکم بۆ منداڵان نووسیوو یەکێك لەم جۆرە دارشتنەی تێدابوو کە « لا مل بەدمنووك خوراندن » بوو . کاکە حەمەی مەلا کەریم لای کاك ئەحمەد تاڵانە کە ئەوسا لە یەکشوێن مووچەخۆری میری بووین ووتبووی : بە کاك فەرمیدون بڵێ ، بە لای منەوە ئەم جۆرە دارشتنە بۆ منداڵان خۆش نییەتە بەرگوێم ، منیش ووتم : زۆر ڕاستدەکات ، نەك هەر ئەوەندە بەڵکو بۆمنداڵ ناشێت و سەری لێ تێکدەدات ، لەو ڕۆژەوە بەڵێنم بە خۆم دا کە لە فرسەتێکدا کە پەیوەندی بەم باسەوە ببێت ، ئەم سەرنجەی کاکەحەمەو ئەو وەرامەی خۆمە وەکو ئامانەتێك بخەمە بەر چاوی ئەو خوێنەرە بەڕێزانەی کۆڵیان بەم جۆرە نووسین و باسانەوە هەڵگرتووە .

* The pronunciatory product of children

گوشاد حمه سعید

# گەلەگورك یان كارەساتێكی پڕ لە میحنەت

ماوەی چەند مانگێك لەمەوبەر كتێبێكی كاك حسین عارف چیرۆك نووس كەوتە بازاڕەوە ئەویش «گـەلەگورگ»بـوو ، كە چـوار چیرۆكی گـرتبووە خـۆیـەوە ئـەوانیش (سـەفـەرێكی ئەفسووناوی ، تەتەر ، گەلەگورگ ، شالاوی دل) بـوون و لە لایـەن ئەمـانەتی گشتی رۆشنبیـری و لاوانەوە چـاپكـراوەو بلاوكراوەتەوە .

ئـەم نووسینـە بـاری سـەرنجی خـۆمـە كـە لە كـاتی خوێندنەوەی چیرۆكەكان و بە تایبەتی گەلەگورك لام گەلالەبوو بۆیە بە پێویستم زانی چەند لایـەنێكی چیرۆكی گـەلەگورگ بخەمە ڕوو .

پێش هەموو شتێك باسەیری ئەو چوارچێوە هونەری یە بكەین كە چیرۆكەكەی تێدا دارێـژراوە ، لە راستی‌دا چەنـد لایەنێكە وەك مۆنۆلۆج ، خەون ، تەییاری هۆش وە گرنگترین لایەنیشی دابەش‌كردنی چیرۆكەكەیە بەسەر چەند بەشێكەوە كە لە چیرۆكی یەكەمیش لەوەو پێشیش ئـەم هەوڵەی‌داوە ، بـەڵام هێندی گـەلەگورگـەكەی سـەركەوتـوونی‌یـە ، ئـەم دابەش‌كردنە تەنیا بە دانانی سەرە بـاسی جیاجیـا نی‌یە كـە سەرەباسەكان (زریان ، بارام ، گفت‌وگۆ ، بۆتەی زریان ، شێر ، بەفرینـە ، ئایش ، شـەوچەرە ، خـەون ، بارام ، بـازە ، گورگ ، دەمانچە ، لورە ، (● ● ●) مۆتەكە ، دیـوو درنج ، تەناف ، شالاوی گورگ ، لوزی گورگ ، پیـلان ، كازیـوە)ن بەڵكە بـە باس‌كـردنی یەكـەی ڕووداني چیرۆكـەوەش كە لە ڕاستی‌دا هەموویان پەیوەندی‌یەكی نەپساوەیان بـە یەكـەوە هەیەو لە هەمان كاتیشدا هەر بەشەی خۆی لە خۆی‌دا زیاتر لە كورتە چیرۆكێك دەكا لە گەڵ بوونی پەیوەندی‌یەكی بەهێز بە قەوارەی چیرۆكەكە .. چونكە لە زۆر شوێنی چیرۆكەكەدا گەر بەشێكی لادەی هەست بە لەبار یەك چوونی چیرۆكەكە دەكەی بۆ وێنە لە بەشی شەشـەمدا گـەر (ئایش) لادەی هـەست بە بزربوونی سـەرەداوی ڕووداوەكان دەكـەی چونكـە كۆتـایی پێهێنانی ڕووداوەكان لە گەڵ بەشەكەی ئەولا تریدا زۆر لێك دوور نـاكەوێتـەوە . گرنگتـرین هۆی ئـەمەش لەوەدایـە كـە چیرۆك‌نووس ماوەی نێوان ڕووداوەكانی زیاتر چڕكـردۆتەوەو یاخود خەون و خەیاڵێكی دەخاتە نێوانەوە كە ئەگەر ئەم بەشەی تێدا نەبووایە ئەوا خوێنەر هەستی بە بۆشـایی شوێنی ئـەم خەونە نەدەكرد بەڵام بوونیشی زۆر پێشبینی بە خوێنەردەدا ، ئەمەش خالی نی‌یە لە ووردە كاری نووسەر ، ئەمە لە لایەك لە لایەكی ترەوە ئەم سەرە باسانە بە تەواوی ڕێگا لە بـەردەمی خوێنەردا خۆش ئەكا بۆ تێگـەیشتن بە شێـوەیەكی ئـاسان و چەواشە نەبوون لە نێوان ڕووداوەكانی ناو چیرۆكەكەدا . ئەو ڕووداوانەی كە بە هۆی فلاش باك و ڕووداوەكانی ڕابردووی پێش ڕووداني چیرۆكەكە دەهێنرێتـە ناو چیـرۆكەكـەوە وەك كەرەسەیەكی هونەری بەكار دەهێنرێت .

دووهەمیش لێك جیاكردنەوە یان نوسینی ئەم هۆیانە (كە لە پێشەوە باسیان‌كرا) لە بەشی سەربەخۆدا باس دەكرێ كە خۆی وەكو كورتە چیرۆكێك دەنوێنێ كە لە (ئایش ، خەون) دا بە جوانی بەدیار دەكەوێ ، لەیەكەمیاندا نووسەر دەیەوێ بە ووردی پێمان بڵێ كە سەرەتای دەستپێكردنی ئەم چیرۆكە لە كوێ‌وە سەر هەڵدەدا چونكە تا ئێرە لای خوێنەر ڕوون نی‌یە كە لە بەرچی ئەم خێزانە لەم ناوچەیە دەژین ، ئێرە كوێ‌یەو بۆچی هاتوونەتە ئێرەوە (بەرای من پێویستیشە كە خوێنەر بیزانێ) وە یان باشترە بڵێین هۆی ئەم كارەسات و ناخۆشی‌یەی كە بـارام




بەسەر ئەو خێزانەی دەهێنی لە چی‌یەوەیەو چۆن شان دەداتە بەر بارگرانی ئەو ناخۆشیانەو ، هەروەها خۆشی‌و باشەی دوور کەوتنەوەکەیشی چی‌یە ؟ . ئایا دوور کەوتنەوە لە کۆمەڵ بە هەموو خرابی‌و ناخۆشی‌شیەوە ئەنجامەکەی چی دەبێ ؟ و چۆن ناتوانێ بە دووره بەرێزی هیچ شتێك ئەنجام بدا ؟ ئاقی‌کردنەوە تاڵ‌و تونەکەیشی چ هۆشیاری‌یەك لە لای قارەمانی چیرۆکەکە دروست دەکا بە سیفەتی ئەوەی کە خۆی لە دەوری تەوەرەی ڕووداوەکان دەسوڕێتەوەو کارێکی ڕاستەوخۆش لە سەر گۆڕینی ڕێڕەوی ووردو درشتی ڕووداوەکان دەکا ، ئایا چۆن شاقەلی لەم کارانە هەڵدەکا ؟ تا چ ڕادەیەکیش لای خوێنەر پەسند دەکرێ یان لە توێی بیرو بۆچوونی‌دا ڕەنگ دەداتەوە وە یاخود شوێنی خۆی لە کوێی چیرۆکەکەدا دەبینێ ؟ .

قەوارەی چیرۆك (کورتە چیرۆك ، چیرۆکی درێژ ، ڕۆمان) جا چ قەوارەی نووسینە کە بێ یان ڕووداوەکەی ، جۆری کاریگەریان لێك جیایە ئەمەش نەك بە کورتی‌و درێژی چیرۆکەکە بەڵکو بە هێزی دەربڕینەکەو ڕۆشنایی خستنە سەر کەلێن‌و قوژبنی چیرۆکەکە چونکە زۆر جار ڕووداوی جەرگبڕ هەیە بە دەستی نووسینەوەی یان نووسەرەکەیەوە جگە لە شتێکی کرچ‌و کاڵ چیتر نی‌یەو کاریش ناکاتە سەر خوێنەرەکەی .

زیاتر لە هەموو کەسەکان بارگرانی چیرۆك دەکەوێتە سەر قارەمانی چیرۆکەکە ، جا هەڵبژاردنی قارەمانێك کە شیاوی ئەم کارو کردەوانەبێ‌و بتوانێ شانبداتە بەر ئەم ڕووداوانە خاڵێکی گرنگی سەرکەوتنی چیرۆکەو ئەگینا خوێنەر هەست بە لەنگی نێوان هێزی قارەمان‌و قورسایی‌و بارستایی ڕووداوەکە دەکا ، بۆیە هەڵبژاردنی بارام لە شوێنێکی ئەوهادا کە هەموو خەم‌و خۆشی دوور کەوتنەوەیە لە ناو ئەو کۆمەڵەی کە ئازاری دەدا دەیچەوسێنێتەوە ، بۆیە گەرای هەستی یاخی‌بوون لە مۆخی بارام دەتروکێ ، ئەمە نەك لە هەڵویستێکی شۆرشگێرانەو قوڵ‌بوونەوە لە ناوەرۆکی مەسەلە کۆمەلایەتی‌یەکانی کە لە ڕاستی‌دا سەرو دەرێکی لێ دەکا بە بێ ئەوەی خاوەنی پشوویێکی درێژبێ ، هەر تەنیا بیر لەوەندە دەکاتەوە هەرکەسێکی ئەم ڕێگایەی گرتە بەر ئەنجامەکەی هیچی بۆ ناکرێت بۆیە بەم جۆرە هەستی بەرانبەری وەیسەی یەکە برادەری دەردەبڕێ «وەیسە یادت بەخێر .. تۆ ئێستا کادرێکی حیزبایەتیت‌و تابینە قاقات نوقمی سیاسەتە ، منیش گۆشەگیرێکی هەلاتوو لەو کۆمەڵەی تۆ دەتەوێ گوایە بە سیاسەت چاکی بکەیت !» لا 72 .

بە کورتی دەیەوێ بەوەیسە بڵێ تۆ بە دەست دانە ئەم کارەت لەو پاکی‌یەی جارانت دوور کەوتیتەوەو منیش بەم گۆشەگیری‌یەم بە هەشتێك یان کۆمارێکی ئەفلاتونیانە دروست دەکەم کە هەر هەمووی پێك هاتووە لە ڕزگارکردنی پێستی خۆی‌و ماڵ‌و منداڵەی‌و پێکەوە نانی ژیانێکی خۆش پێویستییان بە هیچ کەسێك نەبێ .

بارام خەڵکی لادێ‌یە شارەزایی‌یەکی باشی لەو ژیانەدا هەیە ، جگە لەمەش خۆی دەرچووی بەشی ئامادەیی کشتوکاڵە (وەك لە لاپەرە (72)ی کۆمەڵە چیرۆکەکەدا باسی لێوە کراوە) ئەمەش شتێکی تر دەخاتە سەر پەیوەندی بارام لەگەڵ دەورو بەرەکەی یان ڕەنگە هۆییك بێ بۆ زیاتر سەرکەوتنی بەسەر ئەو تەنگ‌و چەڵەمانەی کە ڕەنگە بێتە ڕێگای . هەموو کەس‌و ئەو شوێنەیش بە سەختی‌و نا خۆشی شیەوە لەگەڵ قارەمانەکە یان کەسانی چیرۆکە کە هیچ جۆرە لێك نەهاتنێکی تێدا نی‌یەو جۆرە گونجانێکی سرووشتیشی تێدایەو بۆیە لە لای خوێنەر سەیر نی‌یە ، گەر بارام لە شەوێکدا نەتوانێ ڕوو بەڕووی هێرشی سەرماو گورگ ببێتەوە یان خۆی بۆ ئەم هێرشە ئامادە نەکردبێ بۆ بەرەنگار بوونەوە ، وەك پشت ئەستووری بە (خانوو ، دەمانچە ، بازە) ئەمانەش خاسی‌یەتی چینایەتی بارام وەك جووتیارێکی لادێیی نیشان دەدەن ، بۆیە وادەزانی بە یاخی‌بوون‌و دوور کەوتنەوەی هەموو شتێك چارەی دەکرێ‌و ، بەلام بۆچی لە دەست ئەم حاڵەش هەڵدێ . ئەم پرسیارە شەخسی‌یەتی یەکێك لە چیرۆکەکانی (هـ . ج . وێلز)م بە بیر دەهێنێتەوە کە لە چیرۆکی (وولاتی کوێران) دایە ، ئەویش زەلامێکە پاش ئەوەی بەهۆی چەند ڕووداوێك ڕێگا ون دەکاو لە

جیهانی دەرەوە دادەبڕێو دوای گەلێ چەرمە سەری ڕێگـای دەکەوێتە شیوێك خەڵكێكی تێدا دەژی هەمووی كوێرن ، ئەو كوێری‌یە گەلێ هۆی مێژوویی هەبووە كەوای لە كۆمەڵە خەڵكێك كردوە دابیڕێن‌و ئەوە لە دوای ئەوە بەو كوێری‌یە ڕاهاتوون و لایان شتێكی سروشتی‌یەو غەریب نی‌یە ، بۆ كابرای كە تازە ڕێی كەوتۆتە ئەم وولاتە لەبەر خۆیەوە دەڵێ «خێل لە وولاتی كوێراندا پاشایە» كە چی لە ئەنجامدا ئیشەكە وانـاكەوێتـەوە بەڵكو هەموو قسەو هەڵس‌و كەوتی ئەم زەلامەیان لە كن سەیرو سەمەرە دەبێ بە پێچەوانەی ئەم مـەسەلە كـوردی‌یەی كـە دەڵێ :ـ پیاو لە وولاتی كوێراندا دەبێ دەست بە چاوی خۆیەوە بگرێ . بۆیە زەلامەكە لە ئەنجامی خۆ بە پاشا زانیندا دەگاتە ئەو ڕادەیەی بیكوژن ، لە ئەنجامدا هـەر بەوە ڕادەگـا خۆی دەربازبكاو بۆی «رچێ ، هەرچەندە ئەم چیرۆكە خەیـاڵی‌یە بەلام خەیاڵی‌یەكی ڕەمزی‌یەو چیرۆكەكەی كاك حسینیش خاڵی‌نیە لە هـەندێ شتی دەرنـەبڕاو بـە شێـوەیـەكی ڕاستـەوخـۆو ڕەمزی‌یەت ، بۆیە ئەم دوو ئیشە ئەدەبی‌یە لە زۆر خاڵی گرنگ‌و سـەرەكی‌دا یەكتـر دەگرنـەوە . هەرچـەنـدە گـەڕانـەوە لە (گەلەگورگدا)و هەڵاتن لە (وولاتی كوێران) دوو كـرداری دژ بەیەكن بەلام هەر دووكیان هەر بۆ گەیشتنە مەبەستێكن چونكە هەردووكیان بەرزە فڕانە بیر دەكەنەوەو دەیانەوێ ببنە پاشای وولاتێك بەبێ ئەوەی كەسێك بەشداری لە ئیشەكانیانـدا بكا تەنیا بە خەیاڵ‌و تێكۆشاتی خۆیان‌و بەس .

بیرە بنچینەیی‌یەكەی گەلەگورگ بەم شێوەیەیە :ـ بارام نـاوێـك لە دێیێكـدا دەژی كـە بێـزارە لە پـەیـوەنـدی‌یـە كۆمەڵایەتی‌یەكانی نێوان خەڵكەكەی لادێ كە بە تەبیعەتی حاڵ دواكەوتوویی‌یان پێوە دەبینرێ . هەر بۆیە بارام دەگاتە تینی‌و دەیەوێ لەم گێژاوە نەختێ دوور كەوێتەوە ، هەرچەندە ئـەو ناخۆشی ئێش‌و ئازارانەی دەخەنە بەرچاو كە مرۆڤ بە دوورە پەرێزی تووشی شتی لەوە خراپتر دەبێ بەلام ئەوو هەر نایەتە ژێر بـارو لە دڵی خۆیـدا ناو لە خـەڵكەكـە دەنێ (گورگی دووپێ) هەڵدەستێ دەرواو ماڵەكەی دەگوازێتەوە بۆ ئەو خانووەی كە دەیەوێ سەرەتای خەون‌و كارەكانی لێوە دەست پێبكا كـە لە خەیاڵی خۆیدا بە هەشتێكی پاشە ڕۆژی تێدا نەخشـاندووە ، ئەمە بووە بە فەلسەفەو ڕێبازی بیركردنەوەی بارام لە مۆخی نایەتە دەرەوە تا نزیكترین برادەری هەوڵی لەگەڵ دەدا كە ئەمە خەیاڵێكەو هەرگیز بە تەنیاو لە ژێر سایەی ڕژێمێكی كۆمەڵایەتی دواكەوتوودا ئەم زۆران‌بازی گرتنە ستەمە ، هەڵەیە ...هتد .. كەچی بارام پێی دەڵێ «لێم بوویتە فەیلەسوفێك‌و بە چەشنێ فێری ڕاووڕێوی هێنانەوە بوویت كە ئینجا تۆ من بەگیر بێنیت .» لا 72

بەلام با بپرسین بارام هەر لە دواكەوتوویی لادێ بێزارە ؟ یان تێكڕای كۆمەڵ‌و هەرشوێنێك چەند مرۆڤێكی تێدابێ ئەگەر وایە بۆ ڕووی لە شار نەكرد كە پەیوەندی‌یەكانی بەرهەم هێنان پێشكەوتوتـرە ؟ بەلام لێـرەدا دەبێ بلێین ئـەوساكـە هێرشی گەلەگورگەكە ڕووی نەدەدا بەڵكە شالاوی ئۆتۆمبیـل‌و بگرەو بەردەیەكی تر ڕووی‌دەدا كە واقیعی حاڵی شارە ئەمە لە لایەك لە لایەكی تردا بارام پێشتر خۆی بۆ ئەم ئیشە ئامادەكردبوو نـەخشەكـەی بە تـەواوی لا گـەڵاڵە ببـوو ئینجـا بـڕیـاری یەكجارەكی‌دا ، لەبەر ئەوەی بارام لە خۆی ڕانابینێ كە هیچ كارێكی كۆمـەڵایێتی بكا بـۆیە لە پـڕۆژەكەیشی‌دا شتێكی لەم بارەیەوە دانەناوەو هیچ حسابێكیشی بۆ نەكردوە ، هەرچەندە پڕۆژەكەی داچاندن‌و بەرهەم هێنانی دەیان دۆنم زەوی دێمی‌و بـەراو شتێكی پیرۆزە بـەلام پیرۆزی‌یەكـەی ئـەمـەیـان لە چوارچێوەی خێزانەكەی دەرناچێ ، هەر بۆیەشە شان دەداتە بەر هەموو ئەو ئەرك‌و ئازارانەی كە لە ئـەنجامی گیـانبازی‌و سـەركەشی‌یـەكەی دەیچێـژێ ئینجا تێكـڕای ئەم نـاخۆشی‌و دەردانـە دەیهێننەوە سـەرخۆو هـۆشیـاری دەكـەنـەوە كـە خەونەكەی نایەتە دی‌و هەرچۆنێك بێ دەبێ بگەڕێتەوە ناو ئەو خەڵكەی كە بە كۆمەڵگای گورگی دووپێ ناویان دەبا ئەمەش لە ئەنجامی هێرشێكی دڕندانەی سروشت‌و ئەو شتانەیش كە لە ئەنجامی سروشتێكی واوە تۆشی بە تووشی‌یـەوە دەبێ ـ ئیتر نازانین كە بارام لە ناو كۆمەڵگاكەدا هەمان بەرگری دەكا یان دەبێ وەك شەو گەرد خۆی بێنێتە سـەر ئەو شێـوەیەی كـە پێوویستە ؟ یان ئاواتەكانی بە بەشێك لەو شتانـە دادەنێ كە تێكڕای خەڵكەكە ئاواتی‌یەتی . نووسەر هەر لە سەرەتاوە بە چـەند ئیشـارەتێكی بچووك سـەرسـەختی بـارامـمـان پێـڕا دەگەیەنێ لەو بڕیارانەیش كە دەیـاندا پـەشیمان نـابێتەوە ، سەیری ئەم قسانە بكە : «تۆبڵێی وەهـا قوری پێـدا بدا كـە نەتوانم بچم دارەكەش بێنمە ژوورەوە ؟ ... جارێ ئەوەمـان بـەسە . ئـایش زۆر قسەی لە قسـەیدا نـەدەكـرد . (لا57)»

دووباره سەیری ئەم ڕستانە بکە .

«... وتم مەچۆ .. وتم وازی لێبێنە بۆ سبەینێ ، بە قسەی نەکردم . چی لێبکەم ! .. سەر سەختی یەکەی لەوەدانییە . کە قسەیەکی کرد ئیتر هەر ئەوەیەو هەر دەبێ بییاتە سەر لەگەڵدا وتنی بێسودە .

ئەو ئێوارەیە کە هاتەوە ووتی :

- بکەوەرە پێچانەوەی کەڵو پەلەکان ! ..

ورتەم لە دەمی خۆم نەهێنایە دەرەوەو چۆنی داواکرد وام کرد .» لا 65 .

کەچی ژنەکەی باوکی بەگژەوە دەنێ بەڵکو شەرمێ لەو بکا دیسانەوە هەر بێسودە چونکە باوکەکە پێش وەخت دەڵێ :

- هەرچەندە دەزانم سودی نییە قسەکەم دەدوێنم ، بەلام لەبەر خاتری تۆ دەیکەم . لا 65 .

لێرەدا وابەدیار دەکەوێ پێش ڕووداوی چیرۆکەکەش ، تا ئەوسەردەمەیش قوتابی بووە لەگەڵ وەیسەدا سروشتی ئەم مرۆڤە هەروا بووە .

بۆیە هەمو مەسەلەکان لە بەرهەم هێنانی دەدوانزە دۆنم زەوی کۆدەبێتەوە کە تاکە هۆی بژیوی خۆیو ماڵو منداڵەکەیەتی ، کە بەو پەری کولەمەرگیو ڕەنجی فەرهادوە شتێکی لێ هەڵدەکرێنێ ، ئەمەش پێچەوانەی ئەو بەهەشتەیە کە خەونی پێوە دەبینێ .

ڕوو داوەکان لە زۆربەی کاتدا بڕیار لەسەر هەڵوێستیان دەدەنو هەر بەم پێوانەیەش هەڵوێستیان بەرانبەری ڕووداوەکان دیاری دەکەن ، جا خوێنەر ڕەنگە بپرسێ ئایا باوبۆرانو زریانو بەفربارین هێرشی گەلە لەگورگ چ پەیوەندی بە کۆمەڵو هەڵویستی کۆمەلایەتی مرۆڤەوە هەیە ، بەلام با نموونەیێکی سەر پێیی بهێنینەوە : چیرۆك نووس هەرچی بێك دەکاو دەنووسێ هەمووی لە ئەنجامدا لە پێناوی خزمەت کردن وروونکردنەوەی خاڵە سەرەکییەکەی چیرۆکەکەدایە .

گابریل گارسیا لە (حکایە بحارغریق)دا بە پوختی باسی ئەو خۆئامادە کردنە دەکا تاوەکو دەریاوانەکان لەسەر پشتی (کالداس)دا بەرێ دەکەون ئیتر لە گەڵ هەڵکردنی باو بۆرانو بەرزبوونەوەی شەپۆلەکاندا کەشتییەکەیان نوقم دەبێ . بەلام هۆی زیاتری لەبەر ئەوەیە قاچاغێکی زۆریان لە کەشتییەکەیاندا بار کردووە ئەمەش باری لاسەنگ دەکاو

کەشو ئاوو هەوایەکەش یاریدەدەر بووەو لە گەڵ ئەم بارە قورسەدا کەوتۆتە بەربەرەکانێ . کاکڵەی چیرۆکەکەی نووسەر دەیەوێ باسی بکا لێرەوە دەست پێدەکاو پێشترەکەی هەموو ڕێگا خۆشکردنە لە بەردەم گێڕانەوەی ڕووداوەکانی ئەم (دە) ڕۆژەی دەریاوانێك بەسەر پشتی بەلەمەکە کە (لویس ئیلخاندرو فیلاسکو) بە بێ خواردنو خواردنەوە دەتوانێ خۆی بگەیەنێتە ڕۆخ ئاوەکان . بەلام هێزو توانای ئەو گەشبینی یەی لویس کەوەك مادەیەکی بەلگەدار بەکاری دەهێنی تاکە هۆی ڕزگاربوونی یەتی ، کە لە دواییشدا باسی ڕاستی نوقم بوونەکە دەکا دەبێتە هۆی نارەزایی لایەنی تایبەت بەم تاوانە .

(بارام) یش پێشتر ئەم شتانەی بیستووە بەلام بەلەمەکەی ئەو کوردییەو لە ناو دەریای بەفرو سەرمایەو ئاوی دەریایەکە بووە بە بەفر .

چەند جیاوازی یەك هەیە لە نێوان ئەم دوو چیرۆکەدا ڕوو بەڕوو بوونەوەی بارام لە گەڵ زریانو باو بۆران ڕمانی خانوو سەرماو سوڵو هەلەتی گەلە گورگ بە مەرجێ بارام لە ناو خانوەکی تۆکمەو هۆی بەرگری کردنی لە خۆی وەکو دەمانچەو دارو چەقۆ زیاتر قابیلی ڕزگاربوونە لە زەلامێك کە لە ناو دەریادا تاکە هۆی بەرگری سەوڵێکەو تاکە هۆی ڕزگاربوونی بەلەمێکی بچوکە . بۆیە لێرەدا وەلامی خوێنەر دەدرێتەوە کە باو بۆرانو زریانو دەریایێکی فراوانو بەرگوشاد نایە لەدەرگای خەڵك بدا ، بۆیە گەر قاچاغەکەو یاخیبوونەکە نەبوایە ئەوا توشیان بە تووشی ئەم دووکارەساتەوە نەدەبوو .

لە گەلە گورگدا خاڵی دەست پێکردنی کاکڵەی چیرۆکەکە لەوەرینەکەی بازەوەو لە (حکایەبحار غریق) دا لە نوقم بوونی (کالداس)ەوە دەست پێدەکا . ئەمەش خاڵی ستراتیژیو گرنگە چونکە خوێنەر دەگوازێتەوە ناو جیهانێکی نوێ ئەویش ئەو جیهانەیە کە نووسەر مەبەستی پێکانییەتیو هەموو هێزو توانای چیرۆکەکە دەکەوێتە ئەو شوێنەو هەر لێرەشدا وەك مەیدانێك هەموو شتەکان ڕوون دەبێتەوە ، وە من وابزانم سەلامەتی شێوە هونەرییەکەو ئەو زمانەیش کە چیرۆکەکەی پێ نووسراوە لەگەڵ کەشی چیرۆکەکە لێك جیانینە بۆیە کاك حسێن لە هەڵبژاردنی ئەو شێوازەی یان ئەو زمانەی چیرۆکەکەی پێ نووسیووە سەرکەوتووە جگە لە هێندێ هەڵەی چاپ کەتێی کەوتووە .

## گەلە گورگ لە نێوان چیرۆکی درێژو هەوڵی رۆمان نووسیندا؟ـ

گەلە گورگ هەندێ هەوڵی نوێی تێدا دەبینرێ کە خۆی لە رۆمان نووسین نزیك دەکاتەوە بەبێ ئەوەی سنوری چیرۆکی درێژ ببەزێنێ ، وە ئەگەر بشبایە بە رۆمان بەرای من رۆمانێکی سەرکەوتوو نەدەبوو ، گەلێ شت هەیە لە نزیکەوە ئەمەمان بۆ روون دەکاتەوە کە وابزانم ئەمەیان دەگەرێتەوە بۆ رووداوی ناو چیرۆکەکە کە لەوە زیاتری لە باردا نەبووەو هەر شتێکی تری لە گەلدا بایە ئەوا دەبووە هۆی زیان گەیاندن بە چیرۆکەکە چونکە قارەمانی چیرۆکەکەش هەر دیسانەوە نـاتوانێ خـۆی لە ژێر قورسایی رۆمانێکدا ببینێ بەو شێوەیەی کە باسی کراوە بەلام گەر بە درێژی باس لە ژیانی پێشترو پاشتری بکـرایە چـەند حالەتێکی تری باس بکرایە ئەوا یەکسەر ملی رێگای بەسەرهاتی رۆمـانێکی دەگرتـە خۆی ئـەوسـاکـە شـوێن و هـەڵکـەوتنی قارەمانەکە بەهێزتر دەبوو لە هی قارەمانی چیرۆکێکی درێژ .

مـاوەی نێوان رووداوەکـان رۆڵێکی گەورە دەبینی بـۆ نووسینی رۆمان (وەك لە پێشتر باسی ئەم چڕ کردنەوەمان کرد) بەلام نووسەر ئەمەیانی بۆ باسکردنی رابردوویێکی دوور بەکار نەهێناوە ، جگە لەمەش رەنگە بەفـرو زریان و بـاو وەیشومـە رووداوی هێندێ هی گەلە گورگەی یان بە هێزتریش لەوی لێ بوە شێتەوە بەلام نووسەر تەنیا مەبەستی ئەوەندە بووەو بەس .

شوێنی بەسەرهاتی چیرۆکەکە تارادەیێك ئەوەی پێـوە دەبینرێ کە بکرێتە مەیدانێك بۆ گێرانەوە یـان بەسـەر هاتی رۆمـانێك تێـدا بە مـەرجێك هـۆو وەسیلەی درێـژە پێـدانی تـەفاسیـلی رووداوەکان لە هـێرشی گەلە گـورگەکـە بەهێـزتر نەبوونایە وەك لە زوربەی رۆمانەکاندا واباوە یان هەر پێویستە وابێ ، واتە وەك چۆن زۆرانبـازیو چەنگـە چڕیی گـورگەو بارامە وەك رەمزی ژیان و مـردن دەیان خستینـە دڵەراوکێو ئاواش هی بارام و خەڵکەکـەمان بـزانیایـە ، چونکـە ئەگـەر فەلسەفە بایەخ بە شوێنی مرۆڤ دەدا لە بوون و کۆمەڵدا ، ئەوا ئـەدەبیش بایـەخ بـە ووردەکـاری و رازانـەوەی تـەفـاسیلە فەلسەفی و بۆچوونەکان دەدا ، بەلام کاك حسـێن تەنیـا باسی بارێکی نەفسی نادیار دەکا کە لە ئـاکاری ئـەم زەلامە رەنگی داوەتەوە بە بێ ئەوەی ئیزافەی بۆچوونو تێروانینی خۆی بکا ، چونکە گـەر ئەمـەی بکردایـە ئەوا تـووشی بێنەو بـەرەیەکی گەورەتر دەبوو لەوەی کە لە چیـرۆکەکـەدا رووی داوە واتە دەبـوایە لەم سنـوورە دەرچێ ، هەتـاوەکـو نـووسـەر خـۆی بەتەواوی لە (تەییاری هۆش) دوور دەخاتەوە هەر لەبەر هەمان هۆی پێشوو ، راستە ئەمـەیان بـەکار دەهێنی بـەلام لە ژێر سـەرپـەرشتی چـاوە دێـرییـەکی زۆرداو بـۆی نـاچێتـە قووڵاییەوە چونکە ئەو قەناعەتە موتلەقەی بارام هەیەتی بۆ مـاڵ گـوازتنـەوەکـەی دەبێ لە ئـەنجـامی بیـرکـردنـەوەو خۆخواردنەوەیەکی زۆرو دوورو درێژەوە بووبێ بۆیە گەر ئەم باسو خواس و سەربردەیە لە چیـرۆکەکـەدا باسیـان بکرایـە زەمینەی تاقی کـردنەوەی رۆمـان نوسی و شێـوەکەیشی زیـاتر دەگرتە خۆی ، شتێکی تریش کە زیاتر پێزی دەدایە چیرۆکەکەو هەندێ مەلامیحی رۆمانیشی دەدایە ، ئەوە یە کە نووسەر تاکە ئەنجامی هێرشی گەلە گورگەکەو هێزی گەلە گورك دەشکێنێ بە دوو شت یەکەمیان خۆڕاگری بارام و هێزو پشتیوانی ژنەکەی رۆڵێکی باش دەبینێ لە یارمەتی دان و ورە دانەبەری هەروەها وەك هاندەرێکیش بۆ بەر پەچ دانەوەی هێرشەکە ، ئەمە خۆی لە خۆیدا کارێکی هەرەوەزی و کۆمەلایەتی دەنوێنێ و رەنگیش دەداتەوە سەر هۆشیاری بارام ، دووەمیش رۆژ هەلاتنەکەیە کە دڕ بە هەردوو هێزەکە دەدا کە بارام و گەلە گورگن جا ئەمە دەبێتە مایەی هەلاتنی ئەو هێزەی کە بە تیشکی رۆناکی ئاشنا نییەو وەدەست هێنانی سەرکەوتن بـۆ ئەو هێـزەی کە پێی ئاشنایە . لێرەدا کاك حسین ئەو پێشبینییەمان دەداتێ کە لە گەڵ خۆر هەلاتن چیرۆکەکە دەبرێتەوە بارو چۆنێتی گەرانەوەی خێزانەکەش بزرە ، بەلام گەلێ رۆمان یان هەر رۆمان بە گشتی پاش کۆتـایی هێنان بـەرووداوە گەورەکـەو گەیشتنـە ئاکـام یـەکسەر نـابڕێتـەوە سەیـری (پیرەمێـردو دەریا) بکـە پاش سـەرکـەوتنـە گـەورەکـەیش کـە گـرتنی مـاسییـەکـەیـە زۆرانبازییەکی نوێ دەست پێ دەکاتەوە تا پـاش گەیشتنـە کـەنار ئـاوەکە بـاری ژیان و هـەڵس و کەوتی پیـرەمێردەکـەو ئەوانەیش کە پەیـوەندییـان پێوەی هـەیە بـە جوانی روون دەکاتەوە ، ئێمە ئەم قسانەی سەرەوەمان تێکرا هەر لەوەوەیە کە ئەم چیرۆکە چۆن شوێنی خۆی پاراستووە وەك چیرۆکێکی درێژو چۆن دەگاتە سەر سنوری رۆمـان و لێی دەکشێتەوە ، ئیتر هیوای سەرکەوتن بۆ کاك حسین و هەموو هەوڵێکی نـوێ دەخوازم .

ئومێد کاکە ڕەش

# ڕوونکردنەوەیەک لەسەر ژیان و دیوانی میرزا غەفوور

ئەگەر سەیری کتێبی «شاعیرە ناو ون بوەکانی کورد» بکەین لە کۆکوونەوەی مامۆستای خوالیخۆشبو «عەلی کەمال باپیر» کە لە ساڵی 1973دا خستیە بەر دەست خوێندەوارانی کورد دەبینین کورتە باسێکی دەربارەی ژیانی میرزا غەفوور نوسیوەو ئەم پارچە شیعرەشی تێدا بڵاوکردۆتەوە

**ئەمن دەردو مسیبەت وا لە جێی باب و براو کەسمە**
**بەڵێ فەریادو ناڵەی شەو فەلەک گەر لێم گەرێ بەسمە**

لە کۆتای ژیانەکەیدا نوسیویەتی «لە بەر ئەوەی کە ئەولادی نەبوو شیعرەکانی فەوتاوە» ئەگەر چی ژیان و شیعری ئەو شاعیرەی لە کەشکۆڵێکی دەستنووسی من وەرگرتووە[1] کە کاتی خۆی منیش لە ڕۆژنامەی ژین ژمارە (1261) ساڵی 1955 دەرم هێناوە بەلام ئەو دێڕەم تێدا نەنوسیوە .

لەم چەندانەدا کە شکۆڵێکی شیعرم کەوتە لا کە شیعری چەند شاعیرێکی کوردی تێدایە وەکو «حەسەن کەنۆشی کە ناز ناوی (جنونی) یە - مەلا محەمەدی فکری - مەحاکی باجەلانی - ڕەنجووری - ئەمین فەیزی - مەحوی - دیوانی ئەحمەد موختار بەگی جاف[2] - شەکیب - فائیز - هەژار - کمالی - میرزا غەفوور» (23) بیست و سێ پارچە شیعری میرزا غەفووری تێدایە کە ئەو شیعرانەش لە دیوانە دەستنووسەکەی شاعیر خۆیەوە وەرگیراوە کە کاتی خۆی لە سەردەمی خوێندا نوسیویەتەوەو داوێتی بە مامۆستا نەجمەددین مەلا کە خوشکەزای بووە ... کەواتە شاعیر خاوەنی دیوانەو شیعرەکانی نەفەوتاوە وە مامۆستا وای دەرخستووە کە منداڵی نەبووە ئەوەتە لە پەراوێزی کەشکۆڵەکەدا نوسراوە «لە دەم حاجی غەریب کوری میرزا غەفوورەوە وەرم گرتووە - لە کاتی خوێندا میرزا غەفوور دەچێتە حوجرەی خواجا ئەفەندی لە گەڵ حاجی سەعید ئاغادا دەبێ بە شەڕی . حاجی سەعید ئاغاش منداڵ دەبێ بە چاوی گریاناوییەوە دەچێتە لای مامۆستاکەیان ... خواجا ئەفەندیش میرزا غەفوور بانگ ئەکا لێیبدا ، ئەویش ڕائەکا ئیتر واز لە خوێندن ئەهێنێ ، هەر ئەوەندەی خوێندوە .

وە بە نسبەت ساڵی لە دایکبوونی شاعیرەوە لە ڕۆژنامەی ژین وەکتێبی ناوبراودا بە هەڵە نوسراوە چونکە شاعیر لە ڕۆژی 5 شەممە 3 مارتی/ ساڵی 1938 کە بەرامبەر بە 1/محەرەمی/ 1357 کۆچیەو لە تەمەنی (80) هەشتا ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە بە مانا ساڵی لە دایکبوونی شاعیر ساڵی 1858 ی زاینیە کە بەرامبەر بە ساڵی 1277 کۆچیە نەک ساڵی 1287ی کۆچی ئەمەش پارچەیەک هەڵبەستی بڵاونەکراوەی شاعیر لەو (23) پارچەیەی کە لەلامە . هیوادارم دیوانی ئەم شاعیرە ناو بوەمان بکەوێتە بەرچاو تا زیاتر لە بەهرەو توانای ئەم شاعیرە بیر چووەمان بکەین و ئامادەم هەموو شیعرەکان بدەم بەو کەسەی ئەمکارە دەگرێتە ئەستۆ .

بە بولبول : مژدە بێ فەسڵی بەهارە
بە سەیادان کە وەختی کەو بوارە
بە قومریش هەم بە شارەت بێ لە مەولا
لە پای سەرووا دا سەدای شینی هەزارە
ئەسەف بۆ حاڵەتی عاشق لە بەرچی
بەهارو پایزو زستان خومارە
بە عوشاقان بڵێن با بەس بناڵن
زەمانەی عوشرەتو بوس و کەنارە
لە سایەی ڕەحمەتو لوتفی ئیلاهی
کەژو کۆهـ ، دەشتو سەحرا ، لالەزارە
لە خۆشی فەسڵ و خۆشی وەسڵی یاران
کە لامی خاڵە (میرزا) زەڕ نیگارە .

(1) لە گۆڤاری بەیان ژمارە (54) ساڵی 1970 ئەو باسەم نوسیوە .

(2) خەریکی ئامادەکردنی دیوانی (ئەحمەد موختار بەگی) جاف م بۆ چاپ و تائێستا (101) پارچە شیعری شاعیرم لایە کە (80) شیعری لەو کەشکۆڵەدا هەیە و سەرجەمی دیوانە چاپکراوەکەی شاعیریش کە مامۆستا گیو موکریانی کردویەتی (66) پارچە شیعرە هیوادارم هار بکاریم لە گەڵدا بکرێت بۆ ئەم مەبەستە .

# چی تریش لە بارەی زمانی کوردییەوە نووسراوە

د . ئەورەحمانی حاجی مارف

**- بەشی یەکەم -**

بە مەبەستی نیشاندانی ئەوەی لە مەسەلەی لێکۆڵینەوەی زمانی کوردیدا چی نووسراوە ، لە چەند ژمارەیەکی ڕۆژنامەی « برایەتی » ی مانگی مایس و حوزەیرانی سالی 1973 دا زنجیرەیەك وتارم بلاوکردەوە[1] . پاشان لەسەر داوای چەند دۆست و برادەرێك کە داوایان لێکردم ئەو وتارانەم کۆبکەمەوەو پاش ئەوەش کە هەندێ سەرچاوەی ترم دۆزییەوە ، سالی 1974 بە شێوەی کتێبێك پێشکەشم کرد[2] .

ئەگەرچی لەو کتێبەدا باسی زۆربەی ئەو کارانەم کردووە ، کە لە بارەی زمانی کوردییەوە نووسراون ، بەلام لە پەی خەریکبوونی کاری زمانەوانییەوە هەندێك بەرهەمی دیشم دیوەتەوەو هەروەها لە ماوەی ئەم دە سالەی دواییشدا گەلێ شتی تر نووسراوە .. جا دەمەوێ ئەو کارانەی ناویان لە کتێبی « چی لە بارەی زمانی کوردییەوە نووسراوە » دا نەهاتووە بخەمە سەر خەرمانی ئەو نووسینەم و بە چەند وتارێك بیخەمە پێش چاوی خوێنەری بەڕێز[3] .

## کتێب و نامیلکە :

1 — قرائەتی کوردی ، نووسراوە بە واسطەی موحەمەد زەکی ئەفەندی وە میرزا موحەمەد باشقە موعەلیمانی مەکتەبی حکومەتی سلێمانی . تەرتیب کراوە بە واسطەی مێجەر ی . ب . سۆن وە کەپتان و . ج . فاریلل . نەشر کراوەتەوە بە واسطەی دایرەی مەعاریفی بەغداد ، 1920 .

واتە سالی 1920 محەمەد زەکی ئەفەندی و میرزا محەمەد باشقە ، کە مامۆستایانی قوتابخانەی حکومەتی بوون لە سلێمانی بە هاریکاریی ی . ب . سۆن و و . ج . فاریلل بە ناوی « قرائەتی کوردی » یەوە ئەم نامیلکەیان بلاوکردۆتەوە . ئەم کارە (34) لاپەڕەیەو نووسەرانی باسی ئەلفوبێی کوردییان

کردووەو لە بارەی نووسینی کوردی بە پیتی لاتینی دواون . (بۆ شێوەی بەرگی ئەم بەرهەمە ، بڕوانە : وێنەی ژمارە 1) .

**2 – ژ نشریات هێوی جوانا طلبە کوردان ، هینکر زیمان کوردی ، چاپخانەی نجم استقبال – باب عالی – ابو السعود ، 1921 .**

ئەمە ڕابەرێکە بۆ فێربوونی زمانی کوردی لە لایەن قوتابیانی کۆمەڵەی هیواوە دانراوە . بریتییە لە کۆمەڵێك وشەو ڕستەو گفتوگۆ . لە سەرەتادا بە تورکی ، دوایی بەرانبەری بە کرمانجیی ژووروو ؛ لە ڕیزی سێیەمیشدا بە کرمانجیی خواروو . ئەم بەرهەمە (64) لاپەڕەیەو لە گەلێك ڕووەوە کارێکی سەرکەوتووە . (بڕوانە : وێنەی ژمارە 2) .

**3 – مەعرووف جیاوك ، بەرگی ئیملای کوردی ، بەغدا ، 1930 .**

نووسەر لەم کارەیدا پتر دەربارەی جۆری دەنگەکانو شوێنی دەربڕینیان دواوە . سەبارەت بە ڕێنووسی کوردیو چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی هیچ شتێکی ئەوتۆی نەوتووەو شتێکی نوێی وای پێشنیار نەکردووە ، شایانی باس بێ .

**4 – میر هەرەکۆل ئازیزان ، ڕێزانا ئەلفابێیا کوردی ، چاپخانا تەرەقی ، شام ، 1932 .**

ئەم بەرهەمەی میر هەرەکۆل ئازیزان (جەلادەت عالی بەدرخان) بیست لاپەڕەیەو بە پێنج زمان (کوردی ، فەرەنسی ، تورکی ، عەرەبی ، فارسی) یە . نووسەر لەم نامیلکەیەدا دەربارەی دەنگەکانی زمانی کوردی دواوە و (31) دەنگ : (8) ی بزوێنو (23) ی کۆنسۆنانتی دەستنیشانکردووە . هەرچەندە ئەمە باسێکی کورتە لە بارەی ئەلفوبێی کوردییەوە ، بەلام کارێکی وردەو تا ئێستا نرخی هەر دیارە . (بڕوانە : وێنەی ژمارە 3) .

**5 – جەلادەت عالی بەدرخان ، ڕووپەلنەن ئەلفابێ ، چاپخانا تەرەقی ، شام ، 1932 .**

هەر لە ساڵی 1932 دا جەلادەت عالی بەدرخان نامیلکەیەکی تری بە ناوی « ڕووپەلنەن ئەلفابێ » وە بلاوکردەوە . ئەم نامیلکەیەی بۆ فێربوونی زمانو نووسینی کوردی داناوەو بریتییە لە (28) لاپەڕە . (بڕوانە : وێنەی ژمارە 4) .

**6 – ئەحمەدی عەزیز ئاغا ، ئەلفبای کوردی ، چاپی سێیەم(*) ، چاپخانەی فورات ، بەغداد ، 1936 .**

ئەم نامیلکەیە (40) لاپەڕەیە ، ئەلفبایەکە بۆ خوێندنی منداڵانی کورد دانراوە . شایانی باسە ، نووسەر لە سەرەتادا لە هەندێ کێشەی پیتەکانی کوردی دواوەو ئەو گیروگرفتانەی لە نەبوونی هەندێ پیتی چاپدا هەبووە دیاری کردووە ... سەرنج ڕاکێش ئەوەیە ، کە مامۆستا ئەحمەدی عەزیز ئاغا (د) ی کلۆر نەکردووە . (بڕوانە : وێنەی ژمارە 5) .

**7 – د . کامەران عالی بەدرخان ، ئەلفابێیا کوردی ، چاپخانا تەرەقی شام ، 1938 .**

ئەم نامیلکەیە (48) لاپەڕەیەو بۆ فێربوونی زمانی کوردییە . لە کۆتاییەکەیدا هەندێك چیرۆكو مەتەڵی کوردیی تۆمارکراوە . (بڕوانە : وێنەی ژمارە 6) .

**8 – د . کامەران عالی بەدرخان ، ئەلفابێیا من ، چاپخانا تەرەقی ، شام ، 1938 .**

هەر لە ساڵی 1938 دا د . کامەران بەدرخان نامیلکەیەکی بەناوی « ئەلفابێیا من » وە لە شام بلاوکردەوە ، نزیکەی (30) لاپەڕە دەبێت . نووسەر بە سەرەتادا لە چۆنیەتی دەربڕینی دەنگەکانی زمانی کوردی دواوەو بۆ ئەم مەبەستە گەلێ نموونەی جوانو لەباری هێناوەتەوە . وەك لە پاشکۆشیدا کۆمەڵێ چیرۆكو تێکستی کوردیی تۆمارکردووەو ئەمەش هێندەی تر فێربوونی زمانەکەی ئاسانکردووە . (بڕوانە : وێنەی ژمارە 7) .

**9 – ئەکرەم جەمیل پاشا بورجو چەند هەڤاڵ ، ئەلفابێیا کوردی ، شام ، 1945 .**

ساڵی 1945 لە شام ئەکرەم جەمیل پاشا بورجو چەند هەڤاڵێکی نامیلکەیەکیان بە ناوی « ئەلفابێیا کوردی » یەوە بلاوکردەوە . ئەم نامیلکەیە بۆ فێرکردنی منداڵانی کورد دانراوە . لە سەرەتادا (ل 1 – 36) پیتەکانی زمانی کوردییان بە نموونەو وێنەوە نیشانداوە . لە کۆتاییشدا (ل 37 – 56) هەندێك چیرۆکی کوردیو چەند شیعرێکی قەدری جانو عوسمان صەبرییان تۆمارکردووە . بێگومان ، ئەمەش بۆ منداڵانی کورد گەلێك سوودو کەڵکی هەیە . (بڕوانە : وێنەی ژمارە 8) .

**10 – محمد کیوان پور ، نامهای پرندگان در لهجەهای کردی ، طهران ، 1326 خورشیدی .**

ئەم نووسراوە ، کە (155) لاپەڕەیەو ساڵی 1947 ی زایین بڵاوکراوەتەوە ، فەرهەنگێکی ناوی باڵندەیە بە بەشە دیالێکتە جۆربەجۆرەکانی کوردستانی ئێران . (بڕوانە : وێنەی ژمارە 9) .

**11 — عوسمان صەبری ، ئەلفبێیا کوردی ، شام ، چاپخانەی کەرەم ، 1955 .**

ئەمە نامیلکەیەکی (56) لاپەڕەیی‌یەو بریتییە لە ژمارەیەك دەرسی ڕێك‌وپێك لە فێربوونی زمانی کوردیدا . لە کۆتاییشدا هەندێ چیرۆك‌و شیعری کوردیی تێدا تۆمارکراوە . (بڕوانە : وێنەی ژمارە 10) .

**12 — توفیق وهبی ، قواعد اللغة الکردیة ، الجزء الاول ، « الف باء » . مجموعة من المحاضرات التي القيت في نادی الارتقاء الکردی ببغداد في سنة 1955 — 1956 ، بغداد ، 1956 .**

ئەم نووسراوە بە ڕۆنیۆ ڕاکێشراوە . نوسخەیەکی کە من دیومە لە کتێبخانەی کۆڕی زانیاری عێراق پارێزراوە . تێکڕای ئەم نووسراوە لەگەڵ دەستکاری‌یەکی زۆر کەمدا بووە بە کەرەستەی کتێبی « قواعد اللغة الکردیة » ، الجزء الاول ، الباب الاول ، بغداد ، 1956* . دەتوانرێ بووتری ئەم کتێبەو ئەو نوسخەی ڕۆنیۆیە یەك شتن ، چونکە لە چەند شوێنێکی کەمدا نەبێ جیاوازییان نییە . تەنانەت پێشەکی‌یەکانیشیان تەواو وێك‌دەچن .

**13 — ڕەشید کورد ، ڕێزمانا زمانێ کورمانجی ، چاپخانەی کەرەم ، شام ، 1956 .**

ئەم کتێبە (114) لاپەڕەیە . نووسەر لە چەند لاپەڕەیەکی ئەم کتێبەدا لە دەنگەکانی زمانی کوردی دواوەو لە چەند شوێنێکی کەمدا باسی ڕستەی کوردیی کردووە . بەشی هەرە زۆری ئەم بەرهەمە دەربارەی مۆرفۆلۆژی‌یەو گەلێك کێشەی گرنگ‌و پێویستی تێدا باس‌کراوە . (بڕوانە : وێنەی ژمارە 11) .

**14 — جەمال نەبەز ، خوێندەواری بە زمانی کوردی ، بەغدا ، 1957 .**

ئەم نامیلکەیە لەو کۆسپ‌و گیروگرفتانە دەدوێ کە لەسەر ڕێی بڵاوبوونەوەو پێشکەوتنی زمانی کوردی‌دان .

ئەوەی لەم کارەدا پتر بە بایەخ و سەرنج ڕاکێش بێ ، ئەو دوو بەشەیە کە بە ناوی « فەرهەنگ » (ل 56 — 67) و « دەستووری زمانی کوردی » (ل 67 — 69) یەوەن . مامۆستا نەبەز لە بەشی « فەرهەنگ » دا باسی کاری فەرهەنگ نووسیی کردووەو بیرو ڕای لە بارو زانستی‌یانەی بۆ دانانی فەرهەنگی کوردی دەربڕیوە . لە بەشی « دەستووری زمانی کوردی » یشدا هەندێ پێشنیارو زانیاریی باشی خستۆتە پێش چاو .

**15 — د . ن . مەکەنزی ، نووسینێکی تازە بۆ زمانی کوردی ، 1958 .**

ئەمە نامیلکەیەکی (16) لاپەڕەیی‌یە بە زمانی کوردی نووسراوە . (8) لاپەڕەی بە ئەلفوبێی عەرەبی‌یەو (8)یشی بە ئەلفوبێی لاتینی‌یە . باسی ئەلفوبێی کوردی بە لاتینی دەکات‌و لەسەر شێوازێکی زانستی ئەلفوبێ‌یەکی ڕێك‌و پێك‌و ئاسانی لاتینی بۆ نووسینی کوردی داناوە ئەگەرچی لەگەڵ هەندێ پێشنیارو بیروڕایدا نیم ، بەلام تێکڕا کارێکی زۆر سەرکەوتووو زانایانەیە .

**16 — سالار ـ مستەفا قەرەداغی ، زبان چۆن پەیدابووە ؟ سلێمانی ، 1958 .**

مامۆستا مستەفا قەرەداغی لەم نامیلکە (38) لاپەڕەیی‌یەدا بە گشتی ئەو تیوری‌یانەی خستۆتە پێش چاو کە باسی پەیدابوون‌و گەشەکردنی زمان دەکەن ، بەلام لە کۆتاییدا لە بارەی میللەتانی زووی کوردستان‌و باری ئەمڕۆی زمانی کوردیش دواوە .

**17 — ئەمینێ عەفدال ، خەبەرناما کوردییا ڕاستنفیساندنە ، یەریفان ، 1958 .**

ئەم کتێبە (214) لاپەڕەیەو بریتی‌یە لە : پێشەکی (ل 5) ؛ پیتەکانی نووسینی کوردی بە ئەلفوبێی سلافی (ل 7) ؛ باسی وێنەی دەنگەکان و چۆنیەتی نوسینی وشەکان‌و خالبەندی (ل 9 — 53) ؛ فەرهەنگی ڕاست‌نووسینی وشە (ل 54 — 181) ؛ کۆمەڵێ تێکست بۆ خوێندنەوە (ل 182 — 211) ؛ فەرهەنگۆکی زاراوەی کوردی ـ ئەرمەنی (ل 212) . (بڕوانە : وێنەی ژمارە 12) .

**18 — عصمت شریف وانلی ، مسالة توحید اللغة الکردیة ، بغداد ، 1960 (ترجمة الدکتور صدیق الاتروشی) .**

ئەمە ئەو نامیلکەیەیە کە (عصمت شریف وانلی) لە سویسرە بڵاوی کردبووەوە ، دوکتۆر صدیق ئەترووشی بە ناوی « مسألة توحید اللغة الکردیة » هوە وەری‌گێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی‌و ساڵی 1960 (حافظ مصطفی قاضي) لە بەغدا لە

چاپی داوه .

19 — ص . هەژار ، سۆرانی یا کرمانجی ، سلێمانی ، 1960 .

ئەم نامیلکە (39) لاپەڕەییە ، کە وەرامی کتێبی « مسألة توحید اللغة الکردیة » ی عیسمەت شەریف وانلی‌یە ، لە دوو بەش پێکهاتووە : یەك ـ پێشەکی ( ل 5 — 20 ) ؛ دوو ـ وەرامی نووسینەکەی کاك عصمت شریف (ل 21 — 39) .

20 — گیو موکریانی ، ئەلفوبێی کوردی وێنەدار بە تیپی لاتینی ، هەولێر ، چاپخانەی کوردستان ، 1960 .

نامیلکەیەکی (44) لاپەڕەیی‌یەو شێوەی نووسینی کوردی بە لاتینی نیشان دەدات .

21 — کامەران بەدرخان ، زمانی کوردی ، چاپی دووەم ، پاریس ، 1964 .

لە ساڵی 1964 دا کامەران بەدرخان بە زمانی فەرەنسی چاپی دووەمی کتێبی « LANGUE KURDE » ی بڵاوکردەوە* . ئەم کارە (170) لاپەڕەیەو (27) موحازەرەیە دەربارەی زمانی کوردی . بە زۆری باسی فۆنەتیك‌و مۆرفـۆلۆژی‌یە . (بـڕوانە : وێنـەی ژمارە 13) .

22 — کـامەران بـەدرخان ، زمـانی مـادەر ، پـاریس ، 1965

کامەران بەدرخان لە ساڵی 1965 یشدا هەر لە پاریس بە ناوی « زمـانی مادەر » ەوە نـامیلکەیـەکی بە ڕۆنیـو ڕاکێشراوی بڵاوکردەوە . ئەم بەرهەمە کە نزیکەی (40) لاپەرە دەبێت بـۆ فێربوونی زمانی کوردی دانراوە ـ واتە لێکۆڵینەوە نییـە . بە ئەلفوبێی لاتینی نووسراوەو لە ڕێگـای ڕستەوە خـەڵك فێری دەنگەکانی کوردی دەکات . لە کۆتاییشـدا هەنـدێ چیرۆك‌و شیعری کوردیی تێدا تۆمارکراوە . (بڕوانە : وێنەی ژمارە 14) .

23 — کەمال بادیللی ، کورتچە گرامەری ، ئەنقەرە ، 1965 .

ساڵی 1965 لە ئەنقەرە کەمال بادیللی بـە زمانی تـورکی بەناوی « کورتچە گرامەری »واتـە (ڕێزمـانی کوردی) یـەوە کتێبێکی گـەورەی بـڵاوکـردەوە . ئـەم لێکـۆڵینـەوەیـە (160) لاپەڕەیەو بریتی‌یە لە : پێشەکی (ل 3 — 7) ، کە بە گشتی لە زمانی کوردی‌و دیالێکتەکانی دواوە تێیدا . دیالێکتەکانی زمانی کوردی بەسەر (لوڕی ، گۆرانی ، کەلهوڕی ، کـرمانجی) دا دابەش‌کردووە . لە لاپەڕە (8 — 14) دا هەندێ زانیاری لە بارەی فۆنەتیکی زمانی کوردییەوە خستۆتە پێش چاوو لە دەنگـەکان کـۆڵیـوەتـەوە . بـەشێکی فـراوانی (ل 15 — 150) لە بـارەی مـۆرفۆلۆژی‌یـەوەیە . دوا بـەشی ئـەم کتێبـە (ل 151 — 160) سەبارەت بە سینتاکسە . (بڕوانە : وێنەی ژمارە 15) .

24 — نەسرین محەمەد فەخری ، کردار لە زمانی کوردیدا ، باکۆ ، 1965 .

ئەم نامیلکەیە کورتەی نامەی دوکتۆری یەکەیەتی و بە زمانی ڕووسی‌یەو (23) لاپـەڕەیەو لە پێشـەکی‌یەك‌و سێ بـەش پێکهاتووە : پێشەکی ( ل 4 — 5 ) ؛ بەشی یەکەم ( ل 5 — 12 ) ؛ بەشی دووەم (ل 13 — 16) ؛ بەشی سێیەم (ل 17 — 23) .

25 — ز . یوسف ، پریپۆزیشن‌و پۆستپۆزیشن لە دیالێکتی خوارووی زمانی کوردیدا ، لێنینگراد ، 1965 .

ئەم کارە کورتەی نامەی دوکتـۆری زاریٚ یوسفـەو بە زمانی ڕووسی‌یەو (19) لاپەڕەیەو لە سێ بەش پێکهاتووە :

1 — پێشەکی ؛ 2 — خاسیەتی ناو لە ڕووی مۆرفۆلۆژی‌یـەوە ؛

3 — پریپۆزیشن‌و پۆستپۆزیشن .

26 — کامەران بەدرخان ، فێـربوونـا خوەنـدنا کـوردی ، پاریس ، 1968 .

ئەم نامیلکـەیە (60) لاپـەڕەیە . بـە شێوەیـەکی گشتی فراوانکردنی نـامیلکەکـەی ساڵی 1965 یێتی ـ واتـە نامیلکـەی « زمـانێ مادەر » . لە م بـەرهەمـەدا ، جگە لە هێنـانەوەی شیعرو باسی هەندێ لە شـاعیرانی کـورد ، هەنـدێ تێکستی فۆلکلوری کوردییش تۆمارکراوە . (بڕوانە : وێنەی ژمارە 16) .

27 — م . ئەمین بوز ئەرسەلان ، ئەلفابێ ، ئەستەموول ، 1968 .

ئەم بەرهەمە (64) لاپـەڕەیەو وێنـەدارەو بە ئـەلفوبێی لاتینی‌یەو بۆ فێربوونی زمانی کوردی دانـراوە . نووسـەر لە پێشەکی‌یەکەیدا دەڵێ : « ئەم هیڤی بکن کو ب ئالیکاریا ڤێ ئەلفابێ خوەندن‌و نڤیسین‌د ناڤا خەلکێ مەدا بەلاڤ ببەو گەلێك خۆرتین مەو دەمکی کورتدا بـ ناڤبـاریا ڤێ ئـەلفابێ خـوە ژ تاریتیا نەخوەندنی‌و نەزانییـا دەرخینن ، بـ گیژن ڕۆنـاهیا خوەندن‌و زانینێ » (ل 3) .

28 — مصـطفی خرم دل ، مکـا لهء روزمرهء زبـان کردی ، طهران ، 1347 .

ئەم بەرهەمە ساڵی 1968 ی زایین بڵاوکراوەتە .

لە پێشـەکیدا (ل 3 — 4) کـەمێ باسی زمـانی کوردی‌و دیالێکتەکانی کراوە . دوا بە دوای پێشەکی بـاسی ئەلفـوبێی

کوردی کراوەو وێنەی پیتەکانی کوردی نیشان دراوە (ل 5 — 8) . لە لاپەڕە (9 — 170) دا فەرهەنگێکی فارسی ـ کوردی بەرچاو دەکەوێ ، کە لەسەر بنچینەی باس‌و بابەت دانراوە . لەم فەرهەنگەدا گەلێك باس‌و بابەتی هەمەچەشنە جیاکراوەتەوە ، وەك : (وشەکانی ناو قوتابخانە ، ل 9 — 23 ، (نێوی مانگەکان‌و ڕۆژەکانی هەینی ، ل 24 — 28) .. (نێوەکانی دارو گیاو گوڵ‌و میوە ، ل 36 — 51) .. (ئایین ، ل 83 — 86)٭.. لە لاپەڕە (125) یشەوە هەندی باس‌و بابەت بۆ گفتوگۆ دانراوە ، وەك : (ڕاوێژکردن ، ل 131 — 132) ، (پیرۆزبایی ساڵ ، 133) .. (لە لادێدا ، ل 166 — 168) ..

وێکچوونێکی زۆر لە نێوان ئەم فەرهەنگەو « دەستووروە فەرهەنگی زمانی کوردی ـ عەرەبی ـ فارسی » (1962) ی مامۆستا عەلائەدین سەجادی‌دا بەدی دەکرێ[7] .

**29 — جەلادەت عالی بەدرخان ، ڕێزمانی کوردی ، پاریس ، ؟.**

ئەم کتێبە بە زمانی فەرەنسی‌یە ، (184) لاپەڕەیەو لە دوو بەشی گەورەو گرنگی زمان ـ فۆنەتیك‌و مۆرفۆلۆژی ـ پێکهاتووە . لە بەشی فۆنەتیکدا (ل 3 — 70) بە دوورو درێژی لە دەنگەکانی زمانی کوردی‌و چۆنیەتی دەربڕینیانی کۆڵیوەتەوەو چەند خشتەیەکی بۆ دەنگە بزوێنەکان‌و کۆنسۆنانتەکان سازکردووە .. لە بەشی دووەمی ئەم کارەدا . کە دەربارەی مۆرفۆلۆژی‌یە (ل 71 — 184) باسی (ناو ، جێناو ، ئاوەڵناو ، ئاوەڵکار ، کردار / چاوگ ، پێشگر ، پاشگر .. ) ی کردووە .

شایانی باسە ، ئەم بەرهەمە پاشان بووە بە بنچینەی نووسینی کتێبێکی گەورە لەگەڵ ڕۆژێ لیسکۆدا :

**30 — ئەمیر جەلادەت بەدرخان‌و ڕۆژێ لیسکۆ ، ڕێزمانی کوردی (دیالێکتی کرمانجیی ژووروو) ، پاریس ، 1970 .**

ئەم کتێبە بە زمانی فەرەنسی‌یە ، (372) لاپەڕەیەو لە سێ بەشی گرنگ‌و گەورە پێکهاتووە : فۆنەتیك (ل 1 — 60) ؛ مۆرفۆلۆژی (ل 61 — 297) ؛ سینتاکس (ل 301 — 353) . لەم سێ بەشەدا بە شێوەیەکی زانستی‌و فراوان لە گەلێك کێشەی گرنگ‌و پێویستی زمانی کوردی‌یان کۆڵیوەتەوە . بڕوانە : وێنەی ژمارە

**31 — حەمە کەریم ڕەمەزان هەورامی ،**

**بەرگی یەکەم « سایکۆلۆجی‌یەتی خوێندنەوە » ، سلێمانی 1968 .**

**بەرگی دووەم « بنچینەی وتنەوەی زمانی کوردی » ، هەولێر ،1970 .**

مامۆستا حەمە کەریم ڕەمەزان هەورامی لەم کتێبە دوو بەرگی‌یەدا لە بارەی چۆنیەتی وتنەوەی زمانی کوردییەوە دواوەو هەوڵی داوە بە پێی پێویست لە زمانی کوردی بکۆڵێتەوە .. بەداخەوە لەم کارەدا زانیاری ناڕاست‌و کەم‌و کورتی زۆر بەرچاو دەکەوێ .

**32 — حاجی عەبدولڕەحیم وەفی ، چۆن فیری زمانی کوردی ئەبیت بە بێ مامۆستا ؟. چاپی دووەم[*] سلێمانی ، 1970 .**

ئەم کتێبە (186) لاپەڕەیەو لەم بەشانە پێکهاتووە : ئەلفبای کوردی بە پیتی عەرەبی ل 23 — 26 ؛ وشەی کوردی ل 29 — 102 ؛ ڕستەی بچکۆلانەی زۆر بەکارهێنراو ل 105 — 134 ؛ نووسینی نامە ل 137 — 151 ؛ هەندێ چەپکەی ئەدەبی ل 155 — 163 ...

**33 — د . مەکسیمی خەمۆ ، لەبارەی ئیدیۆمی زمانی کوردییەوە ، یەریڤان ، 1971 .**

ئەم کتێبە (100) لاپەڕەیەو بە زمانی ڕووسی‌یە نووسەر لە سەرەتادا بە شێوەیەکی زانستی لە ئیدیۆم دواوەو ئنجا بە وردی هەموو ڕوویەکی ئیدیۆمی کوردی بەنموونەو بەڵگەوە باس کردووە .

**34 — د . عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ ، سەرنجێ لە زمانی ئەدەبی‌ی یەکگرتووی کوردی ، بەغدا ، 1971 .**

ئەم کتێبە (80) لاپەڕەیە : نووسەر بۆ مەبەستی لێکۆڵینەوە لە زمانی ئەدەبی‌ی یەکگرتووی کوردی لە سەرەتادا ڕوونی کردۆتەوە ، کە زمانی ئەدەبی چییەو لای گەلانی‌تر چۆن سەری هەڵداوەو گەشەی کردووە . بە دوا ئەمەدا لە مێژووی زمانی ئەدەبیی کوردی دواوەو ئنجا هاتۆتە سەر زمانی نووسینی ئەمڕۆمان‌و بۆ چەسپاندن‌و گەشەکردنی ، هەندێ بیروڕای لەبارو زانستی خستۆتە پێش چاو.

**35 — ئەورەحمانی حاجی مارف ، مێژووی فەرهەنگ‌نووسیی کوردی‌و شێوازی دانانی فەرهەنگی ڕووسی ـ کوردی ، لێنینگراد ، 1972 .**

ئەم نامیلکەیە کورتەی نامەی دوکتۆری‌یەکەیەتی‌و بە زمانی ڕووسی‌یەو (21) لاپەڕەیە . لە پێشەکی‌و دوو بەش‌و سێ

فەسل و ئەنجام و پاشبەند پێکهاتووە .

**36 – گیوی موکریانی ئەلفوبێی وێنەدار بە تیپی لاتینی ، هەولێر ، 1972 .**

ئەم کتێبە (160) لاپەڕەیە . بە زاراوەکانی (سۆرانی) و (بادینی) و ( فەیلی) و (هەورامی) یە . ئەگەرچی مەبەستی ئەم کارە بە زۆری فێرکردنی زمانی کوردییە ، بەلام لەگەل ئەوەشدا بە شێوەیەکی فراوان باسی ئەلفوبێ و ڕێزمانی کوردی گرتوتە خۆ .

**37 – دکتر محمد تقی ابراهیم پور ، دستور زبان کردی (اورامی ، سنندجی ، کرمانشاهی ، مهابادی) ، طهران ،؟.**

ئەم نامیلکەیە (51) لاپەڕەیە و بە زمانی فارسی یە . سەرەتا (ل 1 – 3) باسی ئەلفوبێی کوردی یە . لە لاپەڕە (4) یشەوە تا کۆتایی دەربارەی بەشەکانی ئاخاوتنە .

**38 – موحەمەد ئەمینی میسری سەییدیان ، خود آموز سەزبان کوردی – فارسی – عربی ، مەهاباد ،؟**

ئەم نووسراوە (101) لاپەڕەیە . فەرهەنگۆکێکی کوردی – فارسی – عەرەبی یە ، کە نزیکەی هەزار وشەیەکی هەمەجۆری تێدا تۆمارکراوە .

**39 – کۆڕی زانیاری کورد ، زاراوی کارگێڕی ، بەغدا ، 1973 .**

ئەم کتێبە (169) لاپەڕەیە. کۆکراوەی ئەو دوو لیستەی زاراوانەن ، کە لە بەرگی یەکەم و دووەمی گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورددا چاپ کراون . نزیکەی (2500) زاراوەیەک دەبێ . شێوەی ڕێکخستنی عەرەبی – کوردی یە .

**40 – محەمەد ئەمین هەورامانی ، سەرەتایێک لە فیلۆلۆژی زمانی کوردی ، بەغدا ، 1973 .**

ئەم بەرهەمە (182) لاپەڕەیەوە بە شێوەیەکی گشتی لە دوو بەشی سەرەکی پێکهاتووە :

**بەشی یەکەم – بریتی یە لە :**

**أ ) کورتە مێژووی زانستی زمان .**

**ب ) زانستی زمان و ناوونیشانی .**

**حـ ) لقە گرنگەکانی زانستی زمان .**

**بەشی دووەم – بریتی یە لە :**

**أ ) ڕەسەنیی زمانی کوردی .**

**ب ) زمانی کوردی لە ڕووی زانستی زمانەوە – واتە لە ڕووی (فۆنۆلۆژی و مۆرفۆلۆژی و سینتاکس) ەوە .**

**41 – مەسعوود محەمەد ، وردبوونەوە لە چەند باسێکی ڕێزمانی کوردی ، بەغدا ، 1974 .**

ئەم کتێبەی ماموستا مەسعوود محەمەد کە (212) لاپەڕەیە ، بە پێشەکییەک و دوو وتار پێکهاتووە :

پێشەکی (ل أ – أ/ت) .

وتاری یەکەم « بەکارهێنانی (ی) لە ڕێزمانی کوردیدا » (ل 1 – 60) .

وتاری دووەم « سووڕێکی خامە بە دەوری (ڕاناو) دا » ( ل 61 – 160) .

وتاری یەکەمی ئەم کتێبە لە ژمارە یەک و وتاری دووەمی لە ژمارە دووی « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » دا بلاوکراوەتەوە .

**42 – ئی . ئا . سمیرنۆڤا ، شێوەی ژمارەی ناو لە زمانە ئێرانی یەکاندا ، لێنینگراد ، 1974 .**

ئەم کتێبە (224) لاپەڕەیی یە ، کە باسی شێوەی ژمارەی ناو لە تێکڕای زمانە ئێرانی یەکاندا دەکات ، لە (ل 158 – 190) دا دەربارەی ژمارەی ناو لە بەشە دیالێکتی موکریدا دەدوێ .

**43 – کۆڕی زانیاری کورد ، زاراوی هەمەچەشنە ، بەغدا ، 1974 .**

ئەم نامیلکەیە (56) لاپەڕەیە . لیستەی سێیەمی ئەو زاراوانەیە ، کە لە ژمارەی بەرگی دووەمی « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » دا بلاوکراوەتەوە . نزیکەی هەزار زاراوەیەک دەبێ و شێوەی ڕێکخستنی عەرەبی – کوردی یە و لە سێ بەش پێکهاتووە : 1 – زاراوی کارگێڕی (ل 7 – 21) ؛ 2 – زاراوی زمان (ل 22 – 24) ؛ زاراوی پزیشکی (ل 25 – 55) .

**44 – د . ئەورەحمانی حاجی مارف ، وشەی زمانی کوردی ، بەغدا ، 1975 .**

ئەم کتێبە (127) لاپەڕەیە . بریتی یە لە پێشەکی (ل أ – ح) و دوو بەش :

1 – لێکسیکۆلۆژی زمانی کوردی

أ) واتاناسی (ل 4 – 24) ؛ ب) ئێتیمولۆژی (ل 25 – 58) ؛ حـ) فریزیۆلۆژی (ل 59 – 68) .

2 – فەرهەنگ نووسی و کاری فەرهەنگنووسی کوردی

(ل 69 — 102) .

**45 — ئیبراهیم عەزیز ئیبراهیم ، ڕستەی لێکدراوی شوێن کەوتووخوازلەگەڵ ڕستەی شوێن کەوتووی دیارخەری لە دیالێکتە ناوەندییەکانی زمانی کوردیدا ، مۆسکۆ ، 1975 .**

ئەمە کورتەی نامەی دوکتۆرییەکەیەتی و (23) لاپەڕەیەو بە زمانی ڕووسییەو بریتییە لە پێشەکیو سێ بەش و ئەنجام . سێ بەشەکەش ئەمانەن : 1 — ڕستەی شوێن کەوتووی دیارخەری بە ئامراز لە ناو ڕستەی لێکدراوی شوێن کەوتوودا ؛ 2 — ڕستەی شوێن کەوتووی دیارخەری بێ ئامراز لە نێو ڕستەی لێکدراوی شوێن کەوتوودا ؛ 3 — دەوری وشەی تەناسوبی لە نێو ڕستەی لێکدراوی شوێن کەوتوو ڕستەی شوێن کەوتووی دیارخەر ی،دا .

**46 — ضیاء الدین باشا الخالدی المقدسی ، الهدیة الحمیدیة في اللغة الکردیة . معجم کردی — عربي . (حققه وقدم له مع دراسات لغوية الدكتور محمد مكري) ، بيروت 1975 .**

ساڵی 1310 ك / 1893 ز یوسف ضیائەددین پاشای خالدی فەرهەنگێکی کوردی — عەرەبی لە ئەستەموول لە چاپدا . د . محەمەد موکریش ساڵی 1975 ئەم فەرهەنگەی بە ئۆفسێت لە چاپداوەتەوە لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانیشی بۆ نووسیوە (ل 9 — 56) .

**47 — کۆڕی زانیاری کورد ، لیستەی چوارەمی زاراوەکانی کۆڕ ، بەغدا ، 1975 .**

ئەم نامیلکەیە (46) لاپەڕەیە . لیستەی ئەو زاراوانەیە ، کە لە بەشی یەکەمی بەرگی سێیەمی « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » دا بڵاوکراوکراوەتەوە . نزیکەی (700) زاراوەیەك دەبێ و شێوەی ڕێکخستنی عەرەبی — کوردییەو لە سێ بەش پێکهاتووە : 1 — زاراوی زمان ؛ 2 — زاراوی کارگێری ؛ 3 — زاراوی کتێبی فێرکەکان .

**48 — کەمال جەلال غەریب ، فەرهەنگی زانیاری وێنەدار ، عەرەبی — ئینگلیزی — کوردی ، بەغدا ، 1975 .**

کۆمەڵێك وشەو زاراوەی زانیارییە لە بابەت گیاندارو ڕووەكو ئامرازەکان و فیزیاو کیمیاو ئەستێرەوانییەوە . (102) لاپەڕەی گەورەیەو نزیکەی (1500) زاراوەیەك دەبێت .

**49 — د . ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، زمانی کوردی لەبەر ڕۆشنایی فۆنەتیکدا ، بەغدا ، 1976 .**

ئەم بەرهەمە (86) لاپەڕەیە ، بریتییە لە پێشەکی (ل 3 — 13) و ئەو کێشانەی پێوەندییان بە فۆنەتیکی زمانی کوردییەوە هەیە .

**50 — ئەحمەد حەسەن ئەحمەد ، ڕێزمانی کوردی ، بەغدا ، 1976 .**

ئەم کارە (296) لاپەڕەیەو بە کوردیو عەرەبییە . جگە لە سەرەتاو کەمێ باسی فۆنەتیك ، ئەوی دی هەمووی دەربارەی بەشە جۆربەجۆرەکانی ئاخاوتنە .

**51 — ڕ . ل . تسابۆلۆف ، لەبارەی مێژووی فۆنەتیکی زمانی کوردییەوە ، مۆسکۆ ، 1976 .**

ئەم کتێبە بە زمانی ڕووسییەو (104) لاپەڕەیە . دەربارەی پەیدابوون و گۆڕان و گەشەکردنی دەنگە بزوێنەکان و کۆنسۆنانتەکانی زمانی کوردییە .

— ماوێتی —

**پەراوێزەکان :**

(1) د . ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، مێژووی لێکۆڵینەوە لە زمانی کوردی ، ڕۆژنامەی « برایەتی » ، 1973 ، بەشی یەکەم ، ژ 53 ؛ بەشی دووەم ، ژ 55 ؛ بەشی سێیەم ، ژ 57 ؛ بەشی چوارەم ، ژ 58 ؛ بەشی پێنجەم ، ژ 60 .

(2) د . ئەوڕەحمانی حاجی مارف ، چی لە بارەی زمانی کوردییەوە نووسراوە ، بەغدا ، 1974 .

(3) لەبەر ئەوەی ، بەر لە کتێبی « چی لە بارەی زمارەی زمانی کوردییەوە نواسراوە » بە واتای سەربەخۆ لە کاری فەرهەنگنووسیی کوردی دوابووم ، باسی فەرهەنگانەش دەدوێم کە لە باسی فەرهەنگ نووسیدا ناویان نەهاتووە .

(4) ئەوکتێبەی ئەحمەدی عەزیز ئاغا من تەنیا ئەو بەرگەیم دیوە ، کە لە سەری نووسراوە چاپی سێیەم بێگومان ، دەبێ چاپی یەکەم و دووەمیشی هەبێ . جا چاپی سێیەم کە لە 1936 دا چاپکرابێ ، ئەوە دەبێ چاپی یەکەمی ئەو بەرهەمە ، ساڵی (1929) بڵاوکراوەتەوە (بڕوانە : سۆران ، کتێبخانەی سۆران ، لەندەن ، 1979 ، ل 22 ، 106) .

(5) لەسەر لاپەڕە یەکی ئەم کتێبە ، نووسراوە : بغداد ، 1956 . کەچی لە دوا لاپەڕەدا نووسراوە : مطبعة البیان ، بیروت ، 1956 .

(6) چاپی یەکەمی ئەم کتێبە لە ساڵی 1953 دا بڵاوکراوەتەوەو لە لاپەڕە (35) ی کتێبی « چی لە بارەی زمانی کوردییەوە نووسراوە » دا باس کراوە .

(7) وەك ئاشکرایە ، مامۆستا سەجادی چەند ساڵێك بەر لە مامۆستا خورەم دل فەرهەنگەکەی لە چاپداوە . جا ئەمە وا دەگەیەنێ ، کە مامۆستا خورەم دل کەڵکی لە کارەکەی مامۆستا سەجادی وەرگرتووە .. یاخود لەوانەیە هەردووکیان سوودیان لە یەك سەرچاوە وەرگرتبێ .

(8) تەنیا چاپی دووەمی ئەم کتێبەم بینیوە ، بەلام وەك نووسەرەکەی لە پێشەکیدا (ل 11 — 14) پەنجەی بۆ ڕاکێشاوە ، چاپی یەکەمی ساڵی 1959 بڵاوکردووەتەوە .

# بەسەرداچوونەوەی ڕێزمانی کوردی

- ڕەئووف ئەحمەد ئالانی -

1984/3/2

لەم دواییەدا بەپەرۆشەوە ئەم کتێبەم خوێندەوە کە بەڕێزان ( د . نەسرین فەخریو / د . کوردستان موکریانی ] دایان‌ناوە ، بۆ پۆلی یەکەمی بەشی زمانی کوردیی زانکۆی سەلاحەددین — 1982 — .

هەر لە سەرەتاوە دڵفراوانە داوای هاوکارییان لێکردوین کە نووسیویانە : « سوپاسبژێری هەموو کەسێکی هاوکارین » منیش بۆی‌ڕەتامو ڕەگەڵ کاروانە پیرۆزەکەیان کەوتم . چۆنی لێبڵێم ئەوەم لە بەرچاوەکە دوو خوشکە کوردی پسپۆڕو دڵسۆز ئەو بەرهەمەیان ڕەنێوهێناوەو مایەی ڕێزلێنانە .

**نێوەرۆکی کتێبەکەو لایەنی باشی :**

- باش بیریان لەوەکردوەتەوە کە چ جۆرە بابەتێك هەڵبژێن ، لەگەڵ ئاستی ئەو قۆناغەدا بگونجێ . بە لای منەوە بابەتەکان چڕوپڕن‌و زنجیرەیەکی ڕێك‌وپێکیان بۆ داناون .
- خستنە ڕووی وشە لەبارەی سەربە خۆیی‌و ناسەربە خۆیی‌و سادەو ناسادە .. ئەوجا جۆرەکانی بڕگەو گۆڕانکاری لەناودا بەهۆی جۆراوجۆری پاشگرەکانەوە ، هەنگاوێکە بەرەپێش‌و قوتابیان لێی سوودمەند دەبن .
- پەرەپێدانی وشەی داڕێژراوو لێکدراو بەوشێوە بۆچوونەیان کارێکی سەرکەوتوانەیەو سەرنجی قوتابیان ڕادەکێشێ .
- پێك‌هاتنی بڕگە بە تاکە بزوێن‌و یەك نەبزوێن‌و دوو نەبزوێن .. شی کردنەوەی جۆرەکانیان ، بە ڕێگەیەکی زانستیانەو قوتابیان لەسەریان ڕامدەهێن .
- هەڵبژاردەی دەقە ئەدەبییەکان ، کارێکی بەجێیەو ماندووبوونی ئەو بەڕێزانەی پێوەدیارە ، بە چاوپۆشین لە زێدە هێنانەوەیان بۆ بڕێ بابەت .
- مامەڵەو لکانی پاشگرو پێشگرەکان لەتەك ناوو ئاوەڵناودا ، بە گوێرەی ئاستی قوتابیانەو زۆر بەجێیە .
- بابەتی ڕاناو : بۆ ئەو قۆناغە ، تێروتەسەلە . ئەمە ئەگەر مەبەست هەر ئەوەبێ کە بەجۆراوجۆری ڕاناوەکانی ئاخاوتنی کوردی ئاشنابن .. بەڵام کە باسەکە ببەستینەوە بە زمانی نووسینەوە ، بۆچوونی تایبەتیم هەیە .

- لەبەشی پێنجەمەوە (چاوگ‌و فرمان) : لە ڕووی جۆرو چەندو سەودایان لەگەڵ پێشگرو پاشگرەکاندا ، تەوژمێکی باشیان‌پێ داون‌و زۆر لایەنیان لێ بەسەرکردونەتەوە . ئەمەش بەگشتی کارێکی سەرکەوتوە . بەتایبەتی لە بارەی قەدو ڕەگەوە ، زانستانە نیگایان داونەتێ .
- کە دێنە سەرباسی جۆرەکانی ژمارەو بەتایبەتی ژمارەی لێکدراو ، وردبینیان تێداکردون .

کەواتە بۆم هەیە کەبڵێم ، ئەو بەرهەمە بەگشتی سەرکەوتوەو بابەتی زۆری نێوخۆی گرتوە . ئەوجا بێتو لەهەندێ خاڵدا یان لەبارەی زمانی داڕشتنەکەیانەوەو

یەکبوونی زاراوەوە .. یان فریانەکەوتبن باش بەسەریدا بچنەوە هەندێ شتیان لەدەست چووبێو سەرنجی تایبەتیم دابنێ ، ئەوە هەرگیز لە نرخو پایەی کتێبەکەو ئەوان کەم ناکاتەوە .. بگرە خزمەتێکی تەواوکەرە بۆ کارەکەی ئەوان .

*** زمانی داڕشتنی ئەو کتێبە :**

أ ـ لەرووی موفرەداتو هەندێ مۆرفیمەوە ، دووتوێی پێوەدەیارە .. هەندێ زاراوەی زانستی زمانیان لە بەشێکیدا بەڕاست بەکارهێناوەو لە بەشەکەی دیدا باریان لێ گۆڕیوەو جێگای سەرنجن . ئاڵوگۆڕیەهەندێ وشەش ـ ناڵێم هەڵەن ـ پەیوەندییان بە لایەنی هونەرییەوە نیە ، بەڵکو دیاردەیەکی هەمە جۆری ئاخاوتنو پەیوەندییان بە خواستی زمنی پەسندەوە نیە . دەشێ هەندێ پاشو پێشو داش دانانی شی کردنەوەکان سەربە هەڵەی چاپ بنو خوێنەریش هەستیان پێ دەکاو هەرچەندە بەسەربکرێنەوە نابنە ماڵ بەسەر ئەوانەوە . هەرچۆنێک بێ لە تاریکیەوە چێوناکوتم . کەواتە بۆ ئەم لیستەیە : ـ

| لەنیوەی یەکەمدا | لەنیوەی دووەمدا |
|---|---|
| نێو = اسم . | ناو = اسم . |
| نێو = ڤ ، اوف . | ناو = ڤ ، جوف . |
| دی ، دیکە = ئاوەڵناو . | تر ، ئیتر = ئاوەڵناو . |
| تر = نیشانەی بەراورد . | تر ، / هەر وەك خۆی . |
| تەنێ = تەنها | تەنیا = تەنها . |
| کردار ، کار = فعل . | فرمان = فعل . |
| پار . | فەسڵ ، بەش ، |
| نیشانەی ناسیاری . | ئامرازی ناسراو ، ناسراوی . |
| نیشانەی نەناسیاری . | ئامرازی نەناسراو ، نەناسراوی ، |
| دارگیز (دارگۆیز . | — |
| شایەن . | شایان |
| پەلار . | پلار . |
| تیپەڕ / هەڵەیە . | تێپەڕ / راستە . |
| لە ..دا = ڤ = من ؟ | لە ... ەوە . |
| پێناس . | پێناسین . |
| بناخەی چاوگ . | بنکە . |
| نیشانەی کۆ / راستە . | ئامرازی کۆ / هەڵەیە . |
| نێو ، ناو ی بەرکار ؟ . | ناوی کراو (مفعول) ؟ |
| راهێنان . | راهاتن (تمرین) |
| ئاوە ڵنێوی سادە . | ئاوە ڵناوی سادە . |
| جێ‌نێو ، جێ‌ناو . | راناو . |
| هێندێك . | هەندێك . |
| ئامرازی پێوەست . | ئامرازی پەیوەندی ... هتد . |

بە چاوپۆشین لە راستو هەڵەی بڕێکیان ، داڕشتنی کتێبەکەیان دووفاق کردوە ؛ ئەمەش بۆ دانانی بابەتی زانستی ، کارێکی رەوانیە .

**ب ـ لەرووی جۆشدانی رستەو دەستەواژەوە .**

لەم رووەوە زمانی کتێبەکە بە رەوان نازانم .. لە زۆر شوێندا چاودێریی تاك‌و کۆی راناوەکان نەکراوە ؛ دەشێ لەبەر پەلەلێکردن ، فریانەکەوتبن بە سەریدا بچنەوە . وەك هاوکارێك چەند رستەیەك دەخەمە بەرچاو : ـ

1 ـ لە رووی پێناسەی سەرەوەدا . ل 11 / لە ... سەرەوە .

2 ـ موچڕك [ موچرك ] ی پیا [ پێدا ] ئەهات . ل 48 .

3 ـ یەك ـ هەرچواریان . ل 100 / یەکە م ...

4 ـ وە ئەوانەی پێویستی هەیە بەگۆڕانیان . ل 120 / واتە : ئەوانەی‌کە پێویستیان بە گۆڕان هەیە .

5 ـ ئەو چاوگانە کە تێنەپەڕن ، بەلام ناکرێت بە تێنەپەڕ . ل 122 . راست : « .. بەلام ناکرێن بە تێپەڕ » .

6 ـ بەشەکانی ئاخاوتن لە چی پێك‌دێت . ل 147 / .. پێك‌دێن .

7 ـ هەر زمانە ئەنجامی پەرەسەندنو بەرەو پێشەوەچوونی کۆمەڵە گەشەدەکات وشەی دروست‌کراوو لێکدراویش ـ دران ، دڕین ـ یەکێکن لەو رووەوە روونو ئاشکرایەی خاسیەتی ئەم دەخاتە روو . ل 148 . / ئەم داڕشتنە ـ بەلای منەوە ـ پچڕپچڕو بێ ئەنجامە ؟!

8 ـ ئەم لە پشووی هاویندا دەچم بۆ هاوینەهەوارێك . ل 160 / .. ؟!

9 ـ بۆ پێناسی [ فعل مبني للمجهول ] ئەمەیان نووسیوە :

« بنکەی دووەم فرمانی بکەر نادیار بەپاریدەی فرمانی بکەر نادیار بەپاریدەی فرمانی پارمەتیدەر ـ هاتن ـ بە گۆڕینەوە بۆ رابووردووو ئێستاو داهاتوو . ل 161 / بەلای

منەوە . ئاڵۆزو بێ ئەنجامە ؟!
10 — « بە وونبوونی یان لادانی بکەر لەرستەدا کراو بەرکار کەوتووە مەفعوول دێتە جێگەی‌و ئەو ئامرازانە دەلکێن بەدواوە . ل 161 / دەقی قانوون‌و دەستوور ، بەو ئاڵۆزی‌و بێ‌چێژیە ، داناپێژرێ . دیسان نیشانەی ـ را ، رێ ـ هیچ پەیوەندییان بە رستەسازیەوە نیە ، تا ناوی ئامرازیان بەسەردا بسەپێ ، دیسانەوە یاسایەکی رستەسازی‌و یاسایەکی وشەسازی ، کراون بەیەك ـ گوژمە ؟!
11 — هەیە پێکەوە لە رستەدا دەردەکەون . ل 189 / هەیانە ...
12 — ئەم ناوانە بۆ ئەو وشانە دانراوە . ل 191 / .. دانراون .
13 — پێناسین بۆ هەریەکە دانراوە . 191 / .. بۆ هەریەکەیان .
14 — بەڵێ ئەگەر ئەوانە بزانێت هەرچییەو بۆچی بەکاردێت‌و لەکوێ (ل 194 . پێویستە ، ئەم جۆرە رستانە دابڕێژرێنەوە .
15 — تاکوتەرا لەم لاولا باسیان هاتۆتەوە . ل 194 / . باس هاتنەوە .. یان باس کردنەوە ؟.
16 — ئەگەر ئەو ئامرازانە بناسین ، دەتوانین ئەو مەبەستانەش دروستبکەین . ل 195 / ئایا مەبەست دروستدەکرێت ؟!.
17 — ئامراز جۆری رستەکان نیشان دەکات . / نیشان دەدات ؟
18 — هەوڵی کۆکردنەوەی ئامرازی پرسیار بدەن ، بە گەڕانەوە بۆ چەند سەرچاوەیەك . ل 206 . / گەرانەوە بۆ چەند سەرچاوە ؟.
19 — هەر وەك هەر وشەیەك لەوی‌تر ، بەتایبەتێتی خۆی جیاوازدەکرێنەوە . / زۆر ناڕەوانە .
20 — وەك ئامرازێکی لێکدراو دەچنەوە رستە . ل 205 . / راست : دچنە رستەوە .
21 — دوور لە رستە بۆیە دەڵێین ئەگەر مەبەستی ئەم ئەم ئامرازە چییەتی ، یان ئەم ئامرازە ئەم مەبەستە روون دەکاتەوە . ل 205 / بەش‌بە خۆم لەم پەرەگرافە تێناگەم ..؟ ، دەشێ کەتنی چاپ بێ ..؟.
22 — بە توانینی بە کارهێنانی ئەم رێگەیەو روون کردنەوەی بەوەش دەگەن کە لە باسەکانی پێشو گەیشتون. ل 192 / لە کوردی گوتەنی دوورکە وتوەتەوە .
23 ـ جۆرەکانی ناو دوو جۆرە . ل 10 / ... جۆرن .
24 — دوو : بە لادانی نوونی چاوگ . ل 100 / دوەم ...

**ئاو رێك :**

أ ـ ئەو رستانە ئەنجامی سەرژمێری‌ی تەواونین .. بەڵکو چەند نموونەیەکن‌و لە پاڵ‌خۆیاندا ، وەڵامی راست یان راستترم دانەوە .

ب ـ نموونەی دەقە ئەدەبیەکان بە چاو برێ شوینەوە ئەوەندە زەبەندن بابەتە زانستیەکانیان شاردوونەتەوە ، وەك : لە [ ل 48 — 55 ] دا چلوسێ پارچەیان هێناوەتەوە ، بۆ ناوی مەعریفە = بەردەکە ـ و ناوی نەکیرە = بەردێك ، بەردێ . لەپاڵ ـ ئەوەشدا ـ وەك لەمەولا چەندوچۆنی لەسەردەکەم ـ نەچوونەتە ناخی ئەو بابەتە سالکارەوە . هەر ئەوەیەکە قوتابیان لە قۆناغی سەرەتاییدا فێری‌دەبن .

*** بادانەوەیەکی بابەتی :**

1 — ل 29 : أ ـ بناخەی کردار + پاشگری ـ آر . وە ك : (لە وتارێکدا کە لەسەر کۆڕی زانیاریم نووسیوە) ئاسۆی زانکۆیی — 4 — .

ب ـ سەرپی و پەرستار

مەموزین .

جـ ـ سەهێونیەکان کوشتارێکی زۆریان لە عەرەبی فەلەستینی کرد .

2 — ل 30 : رەگی کردار + پاشگری ـ دیار ـ وە ك : (پرسیارێکە کەس تێی ناگا) .

ئەو دوو پاشگرە کاری سادەیان کردوە بە نێوی داڕێژراو » .

قوتابیانی کۆلیجی ئاداب ، چاوەڕوانی قوڵ‌داگرتن دەکە ن ، دلنیاشم کە پسپۆڕن‌و زاڵن بەسەر بابەتەکەدا .. خوێندکاران ، بەو بۆچوونە ساکارە رواڵەتیە ، چێژ لە شی کردنەوەی زمان وەرناگرن .

ئەوە راستە کە دوو پاشگری هاوبەش لە زمانی فارسی‌و

کوردیدا هەن‌و لە قالبی ـ ار ، یار ـ دان . بەلام گۆڕانێکی تایبەتی‌و سەربەسەری لەنێوانیاندا رووی‌داوە ؛ پێویستمان بەوە هەیە کە دوورو نزیك لێکدییان هەلاوێرین . آر ـ بناخەی کار دەکاتە ناو .. پاشگری ـ یار ـ رەگی کار دەکاتە ناو » . ئەگەر ماوەم بووایە دەقی ئەو لێکۆڵینەوەیەم کە لە گۆڤاری دەنگی مامۆستادا بلاوکردوەتەوە ، راگوێزی ئێرەم دەکردەوە[1] .

وەك گوتم ئەوەندە ئالوگۆڕیان بەزاراوە ڕێزمانیەکان کردوون ، زمانەوانیش کاری لێ‌چەواشەدەبێ ؛ کە نووسیویانە : ـ بناخەی کردار ـ و دواتر ـ رەگی کردار ـ یەکەمیان قەد دەگرێتەوە = چاوگ ـ ن . دوەمیشیان جەز دەگرێتەوە = چاوگ ـ ن و دەنگی پێش نوونەکە . لەو نموونانەدا هاوکێشەکە لە قەدو رەگی چاوگەوە هەل دەستێت ، کەچی ئەوان باریان لێ‌گۆڕیوەو لە کارەوە دای دەمەزرێنن !

پاشگری یەکەمیان لەقالبی (آر = ئار) دا پیشان داوەو راستنیە ، چونکە بریتیە لە (بزوێن ا + نەبزوێنی ـ ر ) نەك لە نەبزوینی (کۆنسونانت) هەمزە + ری . ئەگەر ئەم بۆچوونەو رای برێ زمانەوانی دیکەش کە هەمزە = ء ، بە ـ فۆنێم دانانین‌و لەگەل هەلکشاوی « ا » دا ، یەك حیسابی بۆدەکەن ، راستبێ ، ئەوا دەتوانین هەمان روخسارو برگەی ـ گا ، مار ـ یش بەیەك مەلبەند دابنێین . هەر چۆنێك‌بێ لە چاولێ‌کەری‌ی پیتی لاتینیەوە ـ کە رەمزی « A » بۆبرگەی « ئا » وبزوێنی « ا » دانراوە ، زەینیان ترازاوەو تووشی ئینکاری لە بەداهەت بوون . لە عەرەبیشدا چونکە نیشانەی هەمزە « ء » بەتەنێ نە بە پێش‌و نە بە پاشی هیچ پیتێکەوە دەنووسێ نەلکانی هەمزەیە ئاژاوەیەکی لە رێنوسی عەرەبیدا سازاندوەو تائێستا بەرچاوم نەکەوتوە کە بلێن گرفتەکە سەربە سروشتی نەلکانەکەیەتی بە خۆنازین‌نیە کەبلێم باشی بۆچووم . لە لاتینیەکەشدا ، دەها خراپتر . بەلام لە کوردیدا چوکلە کورسی بۆ دانراوەو هیچ گرفتێکی تێدا نیەو کورسیەکەی بەپاش وپێشەوە دەنووسێ وەك [ ئی ، ئا ، ئو ، ئۆ ، ئێ .. هتد . نەبوونی نیشانە نابێتە هۆی نەبوونی دەنگ . کەواتە چەندە لەسەری بڕۆم کوتانەوەیەکی ئاشکرایە . بۆ جیاکردنەوەیەکی لەبارتر ، هانادەبەمە بەرئەم شیعرەی حاجی قادری کۆیی :

« هەروەك ئەلفی ـ جان ـ ستوونی لە سکووندا
نەك تابیعی غەیرەو موتە حەررێك ، وەکو هەمزە[2] »

ـ وشەی ـ وتار ـ لە قەدی چاوگی [ وتن ـ ن + ار ] وەردەگیرێ ، نەك لە قەدەکار کە تێکڕای رابووردوو دەگرێتەوە . ئاوەلناوی « پەرستار » بۆ کارایە : پەرستن + ار : نەخۆشەوان ، ممرضە ، زاراوەیەکی تازەیە[3] کەواتە لێرەدا ، ئاوەلناو سازدرا نەك ئەوان گوتەنی = ناوی رووت .

کوشتار ـ یش ئاوەلناوی بەرکارەو لە قەدە چاوگەوە وەرگیراوە نەك لە کاری رابووردووی رووت .

* بۆ پاشگری ـ یار ـ تەنیا ئەم هاوکێشەیان داوەیە دەستەوە : [ رەگی کاری پرس + یار = پرسیار . ئەوەیان ساغ نەکردوتەوە ئایا مەبەستیان ، سؤال ـ ە یان سائل ـ ە ؟ چونکە هەل‌دەگرێ هەردووکیان بێ :

أ ـ پرسین ـ ن = قەد پرسی + ار ، بە هەل‌چەرخانەوەی [ی] = پرسیار / بەچەشنی رەفتن ـ ن + ار = رەفتار . ئەوسا لە قەدەوە گەردان دەکاو بەرابەربە (سؤال) دەبێ .

ب ـ ئەگەر بەپێی هاوکێشەی [ فروشتن ـ تن = رەگ + یار = فرۆشیار ] بێ ، ئەوسا بۆ (سائل) دەستدەدا . ئا بەو شێوەیە مامەلە لەتەك ئەو دوو پاشگرەدا دەکرێ . چەندی بەشوێن بکەوین ، قسەیەکی رەبەقیان رەهاکردوەو هیچ زادەیەکی زانستی لێ‌بەدەست نایەو ، ئاوەلناویشیان خستوەتەوە خانەی ناوەوە . ڤاولیشیان کردوەتە کۆنسونانت ؟!

* ل 51 : نیشانەی ناسیاری دوانن .

1 — ەکە : منالەکە

2 — بزوێنی [ە] ؛ کوڕە بە کزیەکەوە وەلامی دایەوە » . لێرەدا کە ئەو مۆرفیمەیان خستوەتە خانەی نیشانەوە ، کارەکەیان زۆر بەجێیە .. بەلام لە لاپەرە ـ 190 ـ دا ، پێیان دەلێن : ـ ئامرازی ناسراو ـ ئەمەش بەگوێرەی دابەش کردنی کەرەسەی رێزمان هەلەیە ؛ چونکە ئامراز سەربە رستەسازیە .

ئەوان تاکە نیشانەی [ەکە] یان کردوەتە دوان . بەپێی لێکۆلینەوەی خوم ، تەنیا بریتیە لە [ەکە] . جاربە جاری

لەپێناوی سووك گوتەنیدا ، بڕگەی [کە] ی لێ دەقرتێ‌و تەنیا بزوێنە بەراییەکەی دەمێنێتەوە ؛ ئەمەش لە ئاخاوتندا کارێکی ئاساییە . بەلام بۆ زمانی نووسین باشتر ئەوەیە کە بەتێکرایی بینووسین . تەنانەت لەگەل بزوێنی هەلکشاویشدا ، بە نێوبڕ دەپارێزرێ جارجارەش بەبێ نێوبڕ تێ دەچێ کە دەلێن : چرایەکە ، گایەکە .. یان ـ چراکە ، گاکە . بۆ نووسین لایەنی پاراستنەکە رەچاودەکەین . هەرچۆنێك بێ نیشانەکە یەکێکەو دوان نیە .

ل 52 :

« نیشانەی نەناسیاری .. ئامرازی نەناسیاوی .. نەناسین : ـ یك ، ە ك ، ێك ، یەك ، یٚ ـ » .

سالانی پێشوو بەو نیشانەیەیان دەگوت : (ئامرازی شوناسی ئاشکرانەکەر) ! نەبێتە خۆدەربڕین لەسالی 1967 — 968 دا بۆ یەکەم جارم چاوم لەو دەربڕینە سەیرە هەلە نکوت‌و یەکەم هاندەرم‌بوو کە لەو سالانەدا ، شەقلم شکاندو فنی رەخنە سازیی ڕێزمانم لێ‌هات[4] .

نێرەشدا ، کە بە ئامرازیش لەقەلەم دراون تووشی رامانمان دەکاتەوە !

بەلای منەوە ئەو هەموو سۆرەو تۆرەیەی نێرە ، کەتنی فۆنەتێکی شێوەو دەستە شێوەکانمانن و ناشمەوێ ڕیسەی بدەمێ . بە دلنیایەوە دەلێم ، هەموویان لە ماکی [یەك] ن . کە لەدوای نەبزوێنەوە ـ بەردێك ـ دەشکێتەوە بە [ێك] ، بۆ ئەوەیە دەنگە وێستاوی پێش خۆی بە لارەبزوێن رەهابکاو نەلێین : ـ بەردیەك ـ کارەکە پەیوەندی بە سەغلەتیی سازگەوە هەیە . سوانەوەشی بە (یٚ) بە لارەژێر ، پتر سەربە کرکەی فارسیەو لە نووسینی باودا تەشەنەی کردوە . دەتوانین دەنگی [ك] لێ لانەبەین‌و نیشانەکە بەکاملی بە کاربهێنین .

بەچاو قالبی (ەك) ی شێوەی ژووروو دەستە شێوەی سۆرانەوە ، تازەبەتازە لە نووسینی باودا ، بەریان بۆ رەهاکردوە . ئەمەش بێجگە ، لە هەرەمەکاری چ هونەرێکی تێدانیە .. پەکمان لەسەر ئەم جۆرە تێچرانە نەکەوتوە . سەرەرای ئەوەش کە تووشی ئالۆزە زمانیمان دەکا لەگەل [ەك] ی ڕێژەناودا ، وەك [ کورتەك ، پەستەك ، دەستەك ، نێرەك ، چەوتەك ، .. هتد .

ئێستاش بەرەیەك لە نووسەرانمان ، لەدوای بزوێنیشەوە هەر کەیفیان بە تێوەگلانی (ێك) دێ ، ئەوە لێك نادەنەوە کە بەو شێوەیە تووشی چ گۆبە ندێکی دەنگسازیمان دەکەن : بۆ نموونە کوردەو دەلێ : ـ هەرمێ یەك ـ . منیش ئاوای دەنووسم . ئەوان نووسەنی دەبێتە [ هەرمێیێك ] واتە ناچاردەبین بۆ ترازاندنی جووتە بزوێنی ـ ێـ + یـ ـ نێوبڕی ـ بـ ساز بدەین : هەرمێ + یـ + ێك . لەوەش سەمەرەتر تاودانی (ێك) ە بە دوای داکشاوی نووسراو بەجووتە (ی‌ی) وە ، وەك [ لادێییێك ] شەش [ ی .. ی .. ] کەلەکە دەبێ .

لەلایەن خۆمەوە و بەرێگەیەکی ژیرانە چارەسەری ئەو قەتارە بێیەم کردوە[5] .

ئەوەی جێی رەخنەیە لەهەندێ شوێنی کتێبەکەدا ، نووسیویانە [ شێوەیەك ] و بەجێیە . کەچی لەنێوقەدی بەرەوژێر نووسیویانە [ شێوەییێك ] . بیریان لەو بارگرانیە رێزمانیە نەکردوەتەوە .. سەرەرای ئەوەش کە [ یەك ] گشتیترە لە شێوەی ژووررووشدا لەدوای بزوێنەوە قالبی [یەك] بەکاردەهێنن . وەك لە لاپەرە پەنجاوپێنجدا ، نووسیویانە :

« نێری‌یەکێ چار سال کوشت »

چیرۆکێت کرمانجی ـ 16 .

* ل 56 : ئەوشانەی بە پیتی دەنگداری [ آ = ئا ] کۆتاییان هاتوە ، لە کۆکردنەوەیاندا ، ئەبێ بلێین ـ بایان ، چیایان » .

چەندوچۆنی ئەوە ناکەم کە پیت ، رەمزونیشانە دەگرێتەوەو دەنگ شتێکی دیکەیە . زاراوەی [کۆکردنەوە = خڕکردنەوە] بە واتای « لمّ » وشتی‌وایە . لەبارتر : (کردنەکۆ) یە . مەسەلە گۆڕینی بڕگەی « ئا » لەباتی هەلکشاوی « ا » هاتەوە گۆڕی‌و هەلەیە .

لە لاپەرە 57ـ دا ، نووسیویانە .

« ئەگەر ناوەکە کۆتایی بە [ ەکە ] بوو ، نیشانەی ـ آن ـ لە شێوەی (ەکان) دا دەبێ ، وەك : شێتەکان »

جاری نیشانەی کۆ [ئان] نیەو [ان] ە . نیشانەی شێوە ـ گوژمە روالەتی دوو نیشانەیە . زانستی زمان ئەم هاوکێشەیە دەدا بە دەستەوە : [ شێتەکە ـ ە = شێتەك + ان = ] بە یاسای هەر وشەیەکی کۆتایی هاتوو بە بزوێنی سەر + نیشانەی ـ ان ـ ، بزوێنی سەر تێ‌دەچێ ، وەك [ پەنجەرە ـ ە + ان ، ... هتد . بەش بەخۆم هەر لە پۆلی پێنجەمی سەرەتاییدا ، قوتابیانم پێ رامکردون . ئیدی بۆ لە

قۆناغی زانکۆییدا دووچاربینەوە ؟ !.
* ل 57 — 58 ، ئامرازو نیشانەی کۆ ئەمانەن :
ـ ئان ، یەد ، یەن ، یەت ، گەل ، یەل ، یل ، یان ـ ... » .
هیچ کوردێك لاری لەوەدانیە کە لەزمانی ئاخاوتندا ، ئەوانەو چەند نیشانە یەکی دیکەشمان بۆ مەبەستی کۆ هەن . بەلام دەبێ بپرسین : ئەم کتێبەی دایان ناوە ، بۆ خوێندنە یان لێکۆڵینەوەو فەرهەنگە ؟.. یان ئێمە ڕێزمان بۆ ڕێزمان دەنووسین یاخود بۆ دابین کردنی زمانی ئەدەبی ؟
جاری هیچ لێکۆڵینەوەیەکی بەراوردی بـە بالای خـۆی نەبڕیوە . تەنیا بریتیە لە نمایشی ئەم مور ادیف و ئەو مورادیف و ‌وقە ئاخاوتنی ئەم شێـوەو ئەو شێـوە ، بەبێ دەست نیشـان کردنی هیچ ئامانجێکی ماقووڵ .
باری زانستو گونجان ـ لە پێناوی پێ فێـربوون و پێ فێرکردنی زماندا ـ داوای هـەڵ هێنجانی بـابەتی ڕەسـەنو بەئەندازەی پێویست دەکا . یەکێك لە خواستـەکانی زمـان ، دەربڕینی مەبەستی کۆیە ، کە بەهۆی مۆرفێمێك [ پتر لەیەك بگەیەنێ ] ئەمەش بە تاکە نیشانە یەك دێتەدیو زووبەزوو ، خۆیی و دەرەکی فێری دەبن . ئەو سەردەمە قاڵە کە بۆ تـاکە مەبەستو واتایەك ، دەیـان وشەو بێـژەیان جـەلە دەکردنو شانازیشیان پێوەدەکردن ، لەگەڵ خـواستی ئەم سـەردەمەدا ناگونجێ . بهش بە خۆم لە چەندان زنجیرە نووسینی خۆمدا ، ئەوەم گوتوە : بنکەی ـ ان ـ نیشانەیـەکی بنجیو گشتیە .. زۆرینەی ئەو جەڵەبە ڕوخسـارانە ، سـۆرەوتۆرەی ئـەون . جارجارەش نیشـانەی ـ گـەل ـ سەرهـەڵدەدا . بۆ زمـانی نووسین لەوە پتر گوناهە ، ڕەنێوبهێنرێ . بەلای زمانەوانەوە کارێکی ئاسانە ، کە جۆراوجۆری وشەو مـۆرفێم جەڵەبکـا .. بەلام دەبێ بەشی ئەوەندەشی تێدابهێڵێتەوە کە ئەو مەردومگەلە فریای ئەوەناکەون بۆ پیشـاندانی تـەنیا مـەبەستی (لەیـەك زۆرتر) پازدە ، بیست هاووتا بەکاربهێنێ و لەولایشەوە تاکـە یەکێکیانی بۆساغ نەبێتەوە !!
دوور نەڕۆین ئەوە پسپۆڕانی ڕێزمانو نیشانەی [ ان ] بە (آن ، ئان) دەنووسنو هەڵەشە ! یان خراپتر ، ڕواڵەتـانە قالبی [یان] یـان ، سەربـە خۆ داوەتـەقەڵەم ؛ بیـریان لەوە نەکردوەتەوە کە هەر « ان » ەکەیەو لەتەك ئەو ناوانـەدا کە کۆتاییان بە بزوێنە ـ بێجگە لە برێکیان ـ نێوبری (یـ) نەبزوێن وەردەگـرێو بـەم چـەشنـەیـە : ـ بـرا + یـ + ان = ـ خۆشیان باوەڕیان بە نێوبڕ هەیە ، کەچی لێرەدا لەبیریـان چوەتەوە و بە ئامرازیشیان داناوە ؟!
* ل 61 : جێ ناوی کەسی . دواتـر نووسیـویانـە ـ راناو » . زاراوەی ـ ڕاناو ـ ئەگەر لاوازیش بێ ، تەمەنێکی بەسـەردا تێپەڕیوە . بەش بەخۆم دەست بەرداری نابمو نانووسم : ـ جێ ناو ، جێ نێو ، بەرناف ، بەرنێف ، بری ناو ، بری نێـو ، بۆناو ، پەرێناو ... هتد .
لەم کتێبەدا فۆرمە ڕاناوی هەردوو شێوە سـەرکیەکـە خراونەتـە بەرچـاو کە لە شێـوەی سەرووددا دوو کـۆمەڵەنو سەرجەمیان دەگاتە سێزدە ڕاناوی سەربەخۆ .. لە شێـوەی خوارووشداو لەنووسیندا لەسـەر شەش قـالب ڕەتی خۆیـان گرتوە .
وەك دیاردەی زمانی ئاخاوتن ، گشتیـان دەخەمـە بان دیـدەم .. بـەلام کـەسێـك بـەسـەلیقـەی زگمـاك شێـوەو دەستەشێوەکـان نەزانێ زۆربـەزەحمەت دەتـوانێ ئەو دوو گـرووپە یـان چەنـد گروپێکی دیکـەش لەشوێنی خـۆیانـدا بـەکاربهێنێ . پێشـەکی پێـویستی بـەلەبـەر کـردنی بیست جەدوەڵێك دەبێ وشەی نێرومێ بە بیستەنی نەك قیاسی ـ لە بێجگەی گیانداردا ـ فێربێ . سەرەڕای دۆخەکانی کارایی ، بەرکاری ، ئیزافەو .. هتد . ئەمەش لەمەیدانی دابین کردنی ڕێزمانی زمانی نووسیندا ، هێجگار سەختە هیچ گەلێك ڕەچاوی نەکردوە ئەوا خۆیی و دەرەکی فێری گریی [ کتێبی وی ] بوو ، زۆر . ئەو زۆر کارێکی گرانە لەوێوە بازبـداتە سـەر [ کتێبێ وی ] بەلای منەوە ڕاستەو بەلای ئاخێوەرێکی دیکـەمانـەوە هەڵەیەو دەبێ بۆی بکرێتەوە بە [ ئەز کوردم ] یان فێرببم کە ڕستەی [ من چووم ] و [ ئەز کوشتم ] دەبێ ڕاناوەکانیان بە پێچەوانەوەبن دەنا هەردووکیان بەهـەڵە دەردەچن . ئەگـەر مـەسەلەکـە سـۆزکـاریبێ ، کـابـرای مـوکـریـانی داوای ـ ئەنگو = ئێوە دەکاو هەورامانی داوای ـ شان = یان ـ دەکـاو لە ئالانیش ، دێی شـاناخسێ داوای ـ وو = تـان ـ دۆخی ، بەرکاریو ئیزافە دەکاو ، دێی گرگـاشێی تەنشتی ، داوای ـ حەون ، ئەون = ئێوە ـ دەکاو .. هتد .
پێشنیازم ئەوەیە کە دەستگاروشنبیری و زانستیەکانی کوردی بکەونە خۆیانو بەتاوی لێکۆڵینەوەی بەراورد ، کتێبـە

ڕێـزمانێکی فـەرهەنگی بنیـاد بنێن و بی کـەنە سـەرچـاوە . هەرچەندە کۆڕی زانیاریی ئەوسای کورد ، لە ساڵی 1976 ـ دا (ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی) هینایـەبەرهـەم ، بەڵام ئـەویش بەرکوڵێکە بۆ هەمان مەبەست و هەمووڵایەکی نەگرتوەتـەوە . خـۆیشم وەك سەرەتـای کار ، لێکـۆڵینەوەیـەکی بـەراوردیم ڕەنیـوهێنـاوە ، لەپێنـاوی سـاغ کـردنـەوەی پـاشگـرێـك و نیشانەیەکدا لە ڕووخساری [ ەوە / وە ] دا . لە دواییەنەی ئەو کتیبەمدا* هەڵوێست و نیشانکردی خۆمم دەربڕیوە : « ئەو ڕەتانەم بۆ ئەوە بوو کە لە زمانی نووسیندا ، ئەو جووتە مۆرفێمە هەر لە قالبی ـ ەوە / وە ـ دا بەکاربهێنرێن .

جـا ئەگـەر مەبـەستی ئـەو بـەڕێـزانـە ، تـەنیا بـۆ شارەزابوونی جۆراوجۆری ڕاناوەکانی ئاخاوتنی کوردیی بێ ، نەك بۆ پەرەوکردنێکی بەرنامەیی لە زمانی ئەدەبیدا ، ئەوا ـ بووم نیە ڕەخنەیان لێ بگرم . لەبواری لێکۆڵینەوەشدا زۆرتریان بەبەرەوەیە .

* ل 72 : ڕاناوی لکاو : ـ ا ـ بۆ دەمی ڕانەبوردوو :

ـ دەچـ / م ، دەچـ / ی دەچـ / یَ ، دەچـ / یـن ، دەچـ / ن ، دەچـ / ون » .

بەدڵنیاییەوە پیشانیان داوە کە تێکڕای فۆرمی [ .. ون ] ڕانـاوی لکـاوە بـۆ کـەسی سێیـەمی کـۆ ، لەپـاش کـاری ڕانەبوردووەوە . بەڕلەوەی کە بڵێم کورد جۆرە ڕانـاوی ئاوای نیە ، با کەمە گەردانێك بە چاوگی « چوون » بکەم :

أ ـ چوون ـ وون = ڕە گ ، دە + چـ + ڕاناوی لکاو = کـاری ڕانەبـوردووی ئیخبـاری ، وەك : لەمـەولا ـ دەچم ، دەچیت ، دەچێ ، دەچن .

ب ـ چوون ـ ن = قەد ، دە + چوو + ڕاناوی لکاو = کاری ڕابوردووی بەردەوامی = الماضي الاستمراري ، وەك : ساڵانی پێشوو بەلباسەکان ـ دەچوون ـ بۆ هەوار .

ئا ، لەم خاڵەدا لێیان چەواشەبووەو ڕابـوردوویان بـە ڕانەبوردوو گەردان پێ کردوە . دەشێ لەدەستیان ترازابێ کە ڕابوردوویان لە ڕەگ وەرگرتوە ، بۆیە درێژەبۆری / وو ـ یان بـە کورتـە بۆری / و ـ هـەڵ هێنـاوەتـەوەو بـە تـاکـە (و) خستویانەتە ئـەو دیوی داشـەکەوەو ڕانـاوەکەشیـان ڕەگەڵ خستوە و بڕیاری نادروستیـان داوە : [ دەچـ / ون ] فیعل موزاریعەو تێکڕای « .. ون » ڕاناویەتی . هەرچۆنێك بێ لە دوو سەرەوە هەڵەیە .

ـ ل 72 : لە زمانی کوردیدا دوو پێشگر هەن کە ناوو ـ ئاوەڵناوی سادە دەکەنە ناسادە :

1 بێ ـ بێهۆش .

2 ـ بە ـ بەهێز .

ئەم حوکمـە ڕەبەقـە تەنـگەهەڵ هـاتوە ، پێـویستی بە وردکردنەوەهەیە ؛ چونکە دەیـان ئاوەڵنـاو بە بـەرچاوەوەن و ناسادەن و بەهۆی ئامرازی [ نە ، نا ] ی نەفی ، سازدراون ، وەك :

ـ خۆش ، نەخۆش ـ ناخۆش . مەرد . نامەرد ـ

* ل 82 : 9 ـ پاشگری ـ وو ، وەك :

مێری هەموو ڕۆژگاری پێشوو ناوی پێش + وو = ئاوەڵناوی داڕێژراو .

ـ ل 84 : 3 ـ پاشگری ـ وور ، وەك :

**لەناو زولفا ڕوو دڵداره مەستوور**
**دەسـوو تێنـێ لەشـەودا ، شـەمعـی کافوور .**

/ سالم » .

**تێڕامانێك**

أ ـ وشەی ـ پێش ـ لەباوی ڕێزماندا و بەپێی دابـەش کردنی کەرەسەی ئاخاوتن ، پێی ناگوتـرێ ناو .. بـەڵکو لە خـانەی ئاوەڵکار = ظرف دایە . ئەمەیان تاراددەیەك دەسە لمێنرێ ، کە بەیاسای مەنتیقی کۆنە یۆنـانیەکـان ، بەرنـاو دەکەوێ ، چونکە کارنیە .

ب ـ دوای ئەوەی کە پاشگری ـ وور ـ یان برداوە ، دووناویان لە شیعرێکی سالمدا بۆ دەست چن کردوەو لەم هاوکێشـەیەوە سەریان پێ هەڵ داون :

1 ـ مـەست = ئاوەڵنـاوێکی سادەی کـوردی + پاشگـری ـ وور = مەستوور = ئاوەڵناوێکی داڕێژراوی کوردی .

2 ـ کـاف = ئاوەڵنـاوێکی سـادە + پـاشگـری ـ وور = کافوور .

من نکـوولی لەپـاشگـری ـ وور ـ نـاکـەم ، بـەڵام نموونەکەیان بە هەڵە هێناوەتەوە . بەبێ هیچ نیگـەرانییەك ، زۆرجار ڕواڵەتی وشە گەمە بەزەینی نووسـەرو زمانـەوانیش دەکا ، پاکانە بۆخۆم ناکەم لە وشەیەکی عەرەبیداو لە مەیدانی

وەرگێڕاندا خراپترم بەسەرهاتوەو بانگی ئاشکرایان لێهەڵدام !

ئەم دوو زمانەوانەش لە رواڵەتی ـ مەستوور ، کافوور ـ یان هەڵروانیوەو خێرا وایان بەدڵدا هاتوە کە دوو وشەی کوردین و بەهۆی پاشگری ـ وور ، بوونەتە ئاوەڵناوی داڕێژراو .

راستیەکەی : یەکەمیان ـ اسم مفعول ـ ی عەرەبیەو لە (ستر ، یُستَر) وەوە گەردانی پێ کراوە ، (و) زێدەیەکەو «ر» یش ، بەشە رەگی کارەکەیەو چ دەخلێکی بەکوردیەوە نیە .

وشەی ـ مەستوور ـ لەسەر کێش مەفعوول ، مانای (داپۆشراو ، پەنادراو داوێن پاك) دەگرێتەوە[7] .

دیسان وشەی ـ کافوور ـ سادەیەو بە عەرەبی لە قەڵەمدراوە : دارێکە لە چین و ژاپۆن دەڕێ و دەرمانێکی بۆن خۆشی سپی رەنگی لێدەگیری[8] .

خوێنەگەر دوەمیشیان مەبەست نەبووبێ ، لەسەداسەد یەکەمیان مەبەستەو لەدەستیان دەرچووە . سەبارەت بەئێرە نموونەیەکی لەبار بۆهەمان پاشگر دەهێنمەوە . (رەنج : ئازار ، دەرد + وور = رەنجوور) کە دەبێتە ئاوەڵناوی کارای داڕێژراو = بیمار ، دەردەدار / . نیگایەك : لەو رەخنەگرانە نیم کە ناتوانن بچنە ناخی راستکردنەوەو تەنیا خەویش هەڵدەدەنەوە .

* ل 88 : ناو + ناوی بەرکار . وەك ـ ورگدراو ـ) . وەك لەسەرەتاوە گوتم بارلێگۆڕینی زاراوە بابەت دەشێوێنێ و هاوکێشەکانمان لێئاڵۆز دەکا . لێرەدا بۆ مەبەستی لێکدیگەیشتن . پەنایەك دەبەمە بەر زاراوە ـ عەرەبیەکان .. ئەوان تەبایانە ئەم زاراوانەیان مەیاندوون : فاعل = مسندالیه . اسم فاعل : الصفة المشتقة علی وزن خاص . اسم مفعول : الصفة المشتقة للذي يقع عليه الحدث . المفعول : ما يقع عليه الحدث .

ئێمەش ئەو دیاردانەمان هەن و بە گەردان و لکێنی لەمەڕ خۆمان لێکدیمان هەلاویشتوون :

ـ کارا : مسندالیه . بەرکار : مفعول . ئەوجا ئاوێی یان راناوێ . ئاوەڵناوی کارا : اسم فاعل ، صفة مشبّهة . ئاوەڵناوی بەرکار : اسم مفعول ـ .

بەنموونە :ـ خۆرام و پیازی پیشێنراو دەخۆم ـ

ـ خۆرا : کارایەو ئاوەڵناوی کارایە .

ـ پیاز : ناوی بەرکارە .

ـ ی : ئامرازی پەیوەندیە .

ـ پیشێنراو : سیفەیە و ئاوەڵناوی بەرکارە .

کەواتە ـ دراو ـ لە ـ ورگدراو ـ یشدا ، ئاوڵناوی بەرکارە . بەحەلێبی ئەوان ، ئەمەی خوارەوە دەرد ەچێ : لە ـ پیازی پیشێنراوم خوارد ـ دا پیاز ناوی بەرکارەو پیشێنراو ـ یش هەر ناوی بەرکارە ؟ ! ئیتی ئێمەمانان هەر ئەوەندەیە کە لە تاوتوودا هونەرمەندانە بێینەدەست . دەنا ئەوە زمانەو کاری میکانیکی خۆی رادەپەڕێنێت و وەستایەتی نەگەرەکە .

**نیگایەك :**

لەزۆر شوێندا کە دەکەومە شیکردنەوەو گەردانەوە ، تەنها رووی دەمم لەو بەرێزانەنیە کە بە هیمایەك لە بابەتەکان بەئاگادێن .. لەو بارەیەوە مەزنانە سەیریان دەکەم .. بەلام دەبێ لەم جۆرە ئیشانەدا پتر هەستی خوێنەران و بەتایبەتی قوتابیان بجوولێنین و لە کەینوبەینی نهێنیە زمانیەکان بەئاگابین و تووشی دوودڵی نەبن .

* ل 105 ، نموونەیەدا ئاشکرایە کە چاوگی ـ گروون / گام گروو ، سوون / چەقۆم سوو ـ تێپەڕن . نازانم چی ئەوەی لەدەست ترازاندوون کە چاوگی ـ بوون ، دەستکەوتن ـ بە تێپەڕ دابنێن ؟ کە خۆشیان قەناعەت دەکەن ، چاوگی (بوون) کاری یاریدەدەری تێنەپەڕەو ئاشکرایەو تێپەڕەکەشی بریتیە لە چاوگی (کردن) . هەروەها ـ دەستکەوتن ـ تێنەپەڕەو تێپەڕەکەشی بریتیە لە (دەست خستن) ... وەك : پارەم دەستکەوت ، پارەم دەستخست !

دیسان لە خشتەی لاپەرە ـ 106 ـ دا ، هەڵەیەکی زەقتر دەکەوێتە بەرچاو کە نووسیویانە :

«چاوگی رۆیین ، دروون ، هێنان ـ = تێپەڕن و چاوگی ـ درین ، نووستن ـ تێنەپەڕن»

**راست کردنەوە :**

أ ـ چاوگی ـ رۆیین ـ تێنەپەڕە . ئەوان گوتەنی دەبێ تێپەڕ = موتەعەددی بێ . وادیارە لێشی دڵنیابوون کە لە بەرامبەریدا فعل لازمی (رۆیشتن) یان بۆ نمایشکردوە .

ب ـ دیسان بەپێچەوانەوە ـ درین ـ یان بە لازم داناوەو بۆ

بەرامبەرەکەی ـ دراندن ـ یان هێناوەتەوە .
راستیە کەی ، ئێمەیە دوو چاوگمان بۆ ئەو کارە هەیـە ، کە ئەلفی بێ وەك (دڕان) تێنەپەرە : کراسەکەم بۆخۆی‌دڕا . کە یائی‌بێ ئەوا تێپەرە : کراسەکەی دڕیی هیچ جیاوازیی نیە لەگەل ـ کراسەکەی دڕاند ـ .
بۆ نموونەی پێشوو ـ رۆیین ـ ئەوەنـدە ئاشکـرایە تـەنانـەت مامۆستای مەردۆخ ، کـردوویەتی بـە نموونـەی کاری یـەك لائی = لازم (*) منیش لەم تاکە شیعرەی بێخود دا ، دەیـان لێمەوە :

«کـاروان هـەمـوو بـاری کـردو رۆیشتن
ئەتۆش خۆت گورجەوەکە رۆیینت نزیکە»

* ل 108 ، پێناسینی فرمان :
«نیشـانەی رووداوێکی کـارێکە لەکـاتێکی تایبـەتیدا ، واتـە رووداني فرمانەکە لە کاتێکی تایبەتیدا بەپێی پێویست» .
چونکە بادەی تەباییمان نـەنۆشیـوە ، وا خەمـلاوین : هەرکەســەمان‌و دەستگـاو قەڵەمی خـۆی .. زمان‌و زاراوەی خۆی ... پێناسەو هاوکێشەی خۆی !
بەخواستی ئێرە ، ئاورێك لەو پێناسەیە دەدەمەوە :ـ
بەگوێرەی مەنتیقی زمانی مرۆڤ لەم پەراوپەری جیهاندا ، کار هەر کارەو توخمێکی سەرەکیە لە کەرەسەی رێزماندا . هـەر لەسەرێنیی کۆنە یۆنانیە کانەوەلەسەر پێناسەی ئەو تـوخمە پێكهاتـون‌و دەمەقـاڵێ ناوێ ؛ گشت پێنـاسەیـەك دەبێ لە بـەراییـەوە بـە وشـەو دەربـرینێکی کـوگـر = جـامـع ، دەست‌پێ‌بکـا ، ئەوجـا بە وشـەیەکی کـۆنەگـر = مانـع ، قفل‌بدرێتەوە(10) .
پێناسەکەی لەمەڕ ئێرە ، بەناساز دەزانم :
1 ـ نیشانە ، بەگشتی تێکرای دیاردەی زمان‌و کەڵلە سەری سەر جمگەو پەردە رووخاوانیش دەگـرێتەوە .. فیکـەی تایبەتیش دەگرێتەوە ..
بەلام لە باوی رێزماندا ، کورت هەڵهاتوەتەوەو تایبەتە بـەبڕێ مـۆرفیمی دەست نیشـان‌کـراوەوە ؛ هـەرگیـز رەوانیەبە ـ فعل ـ بلێین نیشانە .
2 ـ رووداوێکی کارێکە : مەفهوومی ئەم دەستە واژەیە ئەوە دەگەیەنێ کە تاقە کارێك هەیە وخاوەنی دەیان رووداوە .. ئـەوجـا هـەر خـودی ئـەو کـارە دەبێتـە نیشـانـەی دانەیەکیان .. واتە کـار بەگشتی نیشـانەی یـەکێکە لە چەندان رووداوو کاری کار ، ئەنجام : (کار نیشانـەی رووداوێکی کاری کارە) کە بە یاسای ژێربێژی ، دەبێتە دەورو تەسەلسول . ئەویش شتێکی مەحاڵە .
3 ـ رووداني کارەکە بە پێی پێویست ، ئەمەشیان تێوەدانێکی نەگونجاوە ؛ کە گوتمان کار لە گەوهەری خۆیدا «رووداني دیاری کراوبەکات» ی تێدایە ، نـابەسترێتەوە بـەباری پێویستیەوە .. ئەوەیان داوەبەدەستەوە : ـ کار هەیـەو لەکاتی ناپێویستیدا ، نەرووداني تێدایەو نەکات ـ !! ئەو بۆچوونە دەقی ئەم قسەیە دەگرێتەوە : (پشکۆ : لەکاتی پێویستیدا ، گەرمەو لەکاتی ناپێویستیدا ساردە) !
گوتم ناتەباین . دەنائەوە (رێزمانی ئاخاوتنی کوردی) کە لیـژنەی زانستـەکانی زمـان لەوێدا ، بـۆ کار بـەراوردی سێ پێناسەی پێشینی کوردی‌و فارسی‌و ئینگلیزییان کردون‌و دوای لێکـۆڵینەوە ، پێنـاسەیـەکی لەبـاریـان وەدەست‌هێنـاوە کـە نووسیویانە : «کار ـ وشەیەکە رووداوو کـاتی تێدایـە» . بۆ هەمان سەرچاوە(11) .
ـ ل 109 ـ رەگی فرمان :
«ئـەوەی دوای ئامـراز ـ نیشانـە ـ ی (دە) و رانـاوی لکـاو دەمێنێتەوە ، وەك : ـ دەنووس ...» .
باوەڕم هەیە کەئەم بۆچوونەیان زانستانـەو پەسنـدە ؛ چونکە رەگی کار هەمووکاتێ دەقـاودەق لەگەردانـدا ، رەگی چاوگ‌و رەگی داخوازی ناگرێتەوەو بۆ چوونەکەی ئەم بەرێزانە باشتر دابین‌دەکرێ‌و پێویستە گشتمان پەیرەوی بکەین‌و لە رێزمانەکەماندا بی چەسپێنین .
* ل 118 ـ یەك : بناغەی کاتی‌رابوردوو .
دوو : بنـاغەی کـاتی ئێستـاو داهـاتـوو ، ئـامـرازی کـاتی ئێستا ...» .
ئـەمـانیش وەك هـەنـدێ زمـانـەوانی دیکـەمـان ، هەردەنووسن : کاتی ئێستا .. کاتی داهاتو ...
لەگەڵ ئەو لێدانەوەیەدانیم ؛ چونکە زەمان مـاوەیەکی رەبـەقی رووتە .. بـە وشەو بێـژەی تایبـەت ئەنـدازەی بـۆ دیاری‌دەکرێ .. وەك بلێـین : ـ پار : کـاتی رابوردوو بـوو .

هەنووکە : کاتی ئێستایە . سبەینێ : کاتی داهاتوە .. بەلام ناتوانین بڵێین : خواردم : کاتی رابوردوە ، دەخۆم : کاتی داهاتوە ..

راست ئەوەیە بنووسین : کاری رابوردوو ، کاری رانەبوردوو ، کاری ئێستا ؛ چونکە کار لە خۆیدا کات نیە بەڵکو رووداوێکە بە گەردان و نیشانەی تایبەتی کاتی بۆ دابین دەبێ .

- ل 121 : بوو + اندن = درواندن = تێپەڕ .

وەك لەمەوبەر چەند نموونەیەکمان خستنە بەرچاو ، ئەوە دەدابەدەستەوە کە باش بەسەر ئەم بابەتەدا نەچوونەوە . ئاشکرایە کە کاری (بوون) لە دووڵاوە چەواشەبووە : - لەمەوبەر (ل 105) کردیان بە تێپەڕ . لێرەشدا کردویانەوە بە تێنەپڕ بە پاشگوی (اندن) تێیان پەڕاندوە . ئەمیش راست نیە ، چونکە تیپەری لێسازنادرێ و چاوگێکی سەربەخۆ «کردن» تێپەرە کەیەتی . ئەوجا نازانم لە چ شێوە ئاخاوتنێکی کوردیدا دەبێژرێ : - (بواندی ، دەبوێنی) ؟ ئەمەیان نازانم .

چاوگی - درووون - یش لە خۆیدا تێپەرەو پێویستی بەوەنیە جارێکی دی بە هۆی ئەو پاشگرەوە بێتە دووجارەتێپەڕ .

* ل 124 - : پاشگری (اندن) تێنەپەڕیش دروست دەکات : ناوی سروشتی + اندن = لوورە - لووراندن . بزوێنی سەر (ە) ی لوورە - لەگەڵ (ا) ی - اندن - ادغامکراوە » . تائێرە .

جارێ ئەوگەردانەیان لێناسەلمێنم کە [ ب + ا ] لەنێو یەکدیدا ئیدغامکرابن ؛ ئیدغام لەنێوان دوو کۆنسۆنانتدا روودەدا .. وەك : کەللە ، پەکوو ... راست ئەوەیە کە بزوێنی بەرایی تێچووە ، لابراوە .

**بلادانەوەیەك** :

دکتۆر نەسرین ، ئیستا باوەڕی بەوە هێناوە کە ناوە دەنگی [ قرە ، لوورە ] راستەوخۆ بەهۆی ئەو پاشگرەوە دەبنە تێنەپەڕ .. بەلام ئەم رایەی ئێرەی - لەگەڵ ناچلیشدا - راستە ، پێچەوانەی ئەو نەزەریەیەتی . کە کتێبێکی بۆ تەرخانکردوە [ چاوگی بێواتا لە زمانی کوردیدا [18] لەوێدا بە ناهەق کۆمەڵێك چاوگی ریزکردون و ناوی کوێرەوەبوو و بێواتای لێناون . رێگەی پشکنینی نەگرتوە زوربەیان بە لە هەندێ شێوەو دەستە شێوەدا ، بەگورن . هەندێکیشیان گریمانەو فەرەزیی خۆین کە دەڵێ : (قران ، بوڵان ، بووران .... هتد چاوگی مردەو بێواتان . راستیەکەی هەندێ رووخسارە ناو و ناوە دەنگ لەخۆیاندا ، چاوگەنین و دوای پاشگری - اندن ، ەوە - دەبنە چاوگو گەردانیان پێدەکرێ . نایشارمەوە لەکتێبەکەمدا - کێشەیەك لەرێزمانی کوردیدا - چەندوچۆنم لەتەکدا کردوەو مەسەلەی چاوگی مردووم ، پووچ کردوەتەوە . وێرای ئەوانەش لێیان دەپرسم : ئەوە راستە کە بەبێ فەرزکردنی - لووران - ، یەکسەر - لوورە - بە اندن دەبێتە تێنەپەڕ .. بەلام بۆچی راناوی تێپەڕ وەردەگرێ ؟.. هەر لە کتێبەکەمدا ، باری سەرنجم داوەتە ئەو خاڵەش و وەك نۆبەرە کارێك بە وردی تاوتووی جووتە پاشگری [ اندن ، ەوە ] م کردوەو لەبارەی شەحن و گوڕپێدانەوە چەند نهێنییەکی زمانم دروووژاندوە .

دیسان ئەوەشم باسکردوە : بۆچی وێنەی بوڵ - بوڵاندن - دروستەو - بوڵانەوە - دروست نیە . یان بە پێچەوانە - لالانەوە - دروستەو نابێژرێ - لالاندی - کەچی دەبێژری (لالاندیەوە) ؟!

* ل 125 : هارەهار = هاراندن - تێپەرە . بەلام [ هارین ] تێنەپەرە » .

چەندە ئەو بەرێزانە هەندێ شتیان لەدەست چووبێ ، دەشێ لە ئەنجامی پەلەلێکردنەوە بووبێ .. لەلایەن خۆمەوە مەزنانە دەیانروانمێ و خاوەنی پەیامێکی پیرۆزن کە - زمانەوانیی کورد - یە . خزمەتی زمانەکەمان لە سەرووی گشت بەرژەوەندیەکەوەیە .. ئەگەر کارەکەیان سەنگین نەبوایە ، شەونخوونیم بە دیار بەرهەمەکەیانەوە نەدەکێشا .

**روونکردنەوە** : -

1 - هارە : ناوە دەنگە وەك دەنگی ئاوێکی زۆر کە هەڵبرژێتە خوارەوە .

هارەهار : هارەی یەك لەدوای یەك .

هارەکردن : رووخاندنی شوێنێکی بەرز بەجۆرێ کە هارەی لێوەبێ[19] .

2 - ناوەدەنگی - هارە - بە هۆی پاشگری - اندن - ناکەوێتە گەردان .. بەڵکو ، بەکاری یاریدەدەری کردن - دەکەوێتە گەردان . دەگوترێ [ هارەی کرد ، هارەدەکا .. ] نەمبیستوە کورد بڵێ : (هاراندی ،

دەهارێنێ) .
3– گریمان لە قوژبنێکی کوردستاندا وشەی [ هاراندن ] بۆ مەبەستی باسکراو دۆزرایەوە ، تێنەپەڕەو هەرگیز ئەوان گوتەنی تێپەڕ نیە .
4– هەموومان دەزانین کە – کردن – تێپەڕی – بوون – ەو دەمەقاڵێ ناوێ .. بەلام بێتو ببێتە بەشەپەیدایی ناوەدەنگ و کارێکی لێکدراو بسازێنێ ئایا دەوری تێپەڕی خۆی دەبینێ ؟... یان کە سەودای یەك وشەیی لەتەکدا دەکەین و دەڵێین : – هەرەسەکە . هارەی کرد – دەتوانین بە بەشی (هارە ..) بڵێین بەرکار ؟. ئەم وردبینیە هێشتا لە رێزمانی کوردیدا نەتەقێنراوەتەوە . ماوەی ئەوەشم نیە ئێرە بکەمە کێڵگەی تاقیکردنەوەی خۆم .. خۆ ئەگەر هەر ئەوەندە بدرکێنم [ هارە + کردن ] بە حەلێبی لێکدراو ، تێنەپەڕە لازمە ، هەندێ زمانەوان واقی لێوڕدەمێنێ !!
5– هارین ، ئالان گەنم دەهارێ – کە بە لازمیان داناوە ، لە دەستیان ترازاوەو موتەعەددیەو ریسەی نەگەرەکە .

* ل 137 : هەندێ چاوگ بە تەنێ و بەبێ پێشگر بەکارنایەن ، وەك : – هەڵواسین ، هەڵبزرکان ، هەڵکەندن – » .

لەمەوبەر گوتم حوکمدان بەسەر مردەچاوگدا ، بۆ شارەزایەك بگرە بۆ قوناغێك دەستدەدا کە سەرژمێریی فەرهەنگی نوێ و دێرینی کوردی کردبێ ، ئەم کارەش ئەوەندە ئاسان نیە بەڵکو هێشتا بۆمان نەرەخساوە . هەر لەو نموونانەدا راستە کە بە تەنێ – واسین – گەردان ناکا ، بەلام تا نەچینە بنجوبناوانی مێژووی ئەو وشەیەوە ، ناتوانین ناوی چاوگی لێبنێین چ جای ئەوەی کە بڵێیی لەخۆیدا چاوگەو بەپێشگر بووژاوەتەوە . لە وشەی « هەڵ تووتان » دا دەتوانین شتێك روونبکەینەوە :

1– تووتە – لە هەورامیدا ، ناوە بۆسەگ ، یەکسەر بەبێ فەرزکردنی – تووتان – بە زەبری پێشگری [ هەل ] بۆ رووخساری قنگەلە دانیشتنەکەی ، چاوگی – هەڵتووتان – ی لێپەیدابووە ، بە – هەڵتووتا ، هەڵدەتووتێ – گەردان دەکا . من لەلایەن خۆمەوە بەم گرووپەیان دەڵێم (رووخسارەناو) لەبەر هەمان تایبەتی بێتو بەکەسێك بڵێی : [ هەڵبتووتێ ] دەبێتە مایەی زویربوون و سووکردن !
کەواتە ئەو رایە پووچدەبێتەوە کە بگوترێ لە ئەسڵدا ، چاوگی – تووتان – مان بووەو کوێربووەتەوە .

2– کەنووسیویانە : – بزرکان ، کەندن – بەرووتی بەکارنایەن ، لێیان ناسەلمێنری و زۆر ئاشکرایە کە کورد دەڵێ : – بزرکا ، دەبزرکێ – ئێستاش لەبیرمە کە منداڵ بووین و دەچووینە بن دارەبنەکان کلۆکلۆ رێزەی بنێشتەتاڵمان دەچنیەوەو بە نەرمونیانیەکەوە بەزار خۆشمان دەکرد ، جارهەبوو بریکمان بە هۆی تێوەدانی شتی دیکەوە دەمەبنێشتەکەی لێدەبزرکا .. ئەوجا دەمان گوت « ئەوەی دەمی پاکە بنێشتی نابزرکێ » .

گەردانی [ کەندن ] یش زۆر ئاشکرایەو لەسەر – رۆیشتنی باشنیە . ئەگەر گوێ لە ئاخاوتنی گۆران بگرین ، پتر بەبێ [ هەل ] گەردانی پێدەکەن . روونتر وشەی « کەندە » مان هەیە کە ئامێرێکە بۆ هەلکۆڵینی دەمە کەوچکی دار . بەکاردەهێنرا . ئەو ئامێرە ناوەش لە [ کەندن ] سازدراوە(14) .

* 149 : فرمانی لێکدراو ، وەك :
**– خۆشوشتن ، نوێژکردن – » .**

ئەم باسە چەندوچۆنێکی قووڵی دەوێ و ئێرەش بە بەرێوەنیە . بەلای من (نوێژکردن) فرێزەو تاکە وشەیەکی لێکدراونیە ؛ چونکە هەڵیش بوەشێتەوە ، واتاکەی هەر وەك خۆیەتی کە بڵێی : نوێژم لەسەر تاتە بەردەکەی کانیی بەرمالان کرد . یان – خۆی لە نێو گەراوەکەدا پاك شوشت . هەستبەوەدەکەم ئەمانیش وەك زوربەی زمانەوانەکانمان ، لە زمانێکی دیکەوە تێیان روانیبن کە هەمان مەبەست بە وشەیەکی سادە دەردەبڕن : « غسل ، یغسل ، صلّ ، یصلّي » بەشبەخۆم لە کوردیەکەوە بۆی بادەدەمەوەو بە عەرەبی دەبنەوە بە « غسل نفسه ، أقام الصلاة » بەهەمان بیرکردنەوەیان دەشێ « زەکاتم دا ، سەرفترەم بەخشی » هەموویان تاکە وشەی لێکدراوبن . لەو دەربازکەیەوە زمانەکەمان تووشی گێچەڵبووەو دەبێ سنوورێکی بۆدابنێین .. دەنا بە « پیاز خواردن » یش دەڵێین وشەی لێکدراوی کوردی !!

لەم خۆ بەبالاگرتنەدا ، بارگرانییەکی کەم دێتەوەیاد : سەرنجمداوەتە تازە نووسینی شێوەی سەروو کە ئێرومێ ئەسڵ و بیستەنییان هەیە .. لە مەیدانی وەرگێراندا هەرچی وشەیەکی عەرەبیە مێ سەماعی بێ یان قیاسی بێ بەرامبەرە

کوردیەکەشی بە مێ لەقەڵەم دەدەن و لە دۆخی ئیزافەدا ، ئامرازی « ا » ی بۆ دادەنێن بەرەبەرە وای لێدێ کە دیاردەی مێ لەکوردیدا بەسەر دیاردەی نێردا ، زاڵ بێ !

* ل 175 : ژمارەی تەرتیبی ، ژمارەی ڕێکخراو : « ئەگەر کۆتایی وشەکە بە پیتە بزوێن هاتبوو ، بڕگەی ـ یە ـ دەکەوێتە نێوانیان ، وەك :
- حەفتا ، حەفتایەمین ، هەفتاهەمین »

ل 178 : ژمارەی تەرتیبی : - بەپاریدەی « م » و « مین » و پیتی پێوەندی ـ ە ـ کە دەکەوێتە نێوانی ئەمان و ژمارەکە ، وەك :
- حەوت + ە (یە) + م = مین = حەتەم ، حەوتەمین ـ .

**باری بۆچوونم :**

- بڕیاردانی بڕگەی « یە » لە وێنەی ـ حەفتایەم ـ دا کارێکی ڕواڵەتیی نازانستانەیە . ئەوان کە بە نادروستی بڕیاریان داوە پاشگرەکە بە کۆنسونانتی ـ م ـ دەست پێدەکا ، هیچ ناکۆکیەکی فۆنەتیکی لەرێگەدانیە کە بە ئاسانی بڵێی : « حەفتام ، حەفتامین » کوردیش ئاوایان نابێژێ و لەبەر زمانسەغلەتیش نیە . بەڵکو پەیوەندی بە وردەکارییەکی زمانەوە هەیە کە چەواشەیان کردوە . کە زمانەوان پەنجە بۆ ئینفۆنیك درێژدەکا ، دەبێ بزانێ کە بۆ ترازاندنی جووتە بزوێنە و لەبەر پارازتنی ساختمانی وشەکە نابێ هچیان تێبچن . ئا لەم حاڵەتەدا نێوان یان منگوتەنی نێوبڕ پەیدا دەبێ و بە دەیان نموونەی وامان هەن . دیسان بەپێی بڕیارەکەیان کە پاشگرەکان ـ م ، مین ـ بن ، ئەوا ـ نەبزوێنە و بە دوای بزوێندا گونجاوە و نێوانی نەگەرەکە . لەبارێکدا پێویستمان پێ هەبوو ، سەلیقەی زمانەکەمان ئەوەندە بەرەڵانیە بڕگەی « یە » بکاتە نێوبڕ یان بڕگە بکاتە بەندێکی فۆنیمی . بەڵکو تاکە نەبزوێنێك دەخاتە نێوان جووتە بزوێنەوە . بەپێچەوانەشەوە کە دوو دەنگی نەبزوین لەپەڕینەوە بەسەریەکدا ، ناکۆكبوون ، تاکە بزوێنێك دەبێتە بەندەفۆنیم .

دەمێنێتەوە ـ ئەوانگوتەنی ، پیتە پێوەندی [ ە ] وەك لە [ حەوت + ە + م ] دا ، ئەمەش پیتی پێوەندی نیەو هەڵەیە . فەرزەن پاشگر تەنها « م » یش بێ بزوێنەکە بەندەفۆنیمە . ئەگەر مەبەستیان بەندەفۆنیمیش بێ لەمەرجێکدا بڵێین « حەوتم » ناکۆکی بەرپانابێ . چونکە لەداب و نەریتی کوردەواریدا بە ئاگاین کە بۆ گیانی مردوەکانیان ، گایەك ، مەڕێك لە خودەگرن و بۆیانی سەربېڕن و دەڵێن : « ئەو گایەم لەسەر خۆم نەزرکردوە بیکەم بە ـ حەوتم ـ . مەبەستم ئەوەیە کە پێویست بەپیتی پێوەندی لەمەڕ ئەوان ناکاو بزوێنەکەش پیتی پێوەندو شتی وا نیە . کەواتە بەش بەخۆم سەرلەبەری ئەو ڕواڵەتکارییەیان لەمەیدانی وشەسازیدا لێناسەلمێنم .

**ئەنجامی لێکۆڵینەوەکەم :**

پاشگری ژمارەی وەسفی ، بریتیە لە تیکڕای / ٠٠ەم ـ نەك ئەوانگوتەنی / .. م ـ ئەوجا لەکوێدا بەرەنگاری بزوێنی بێجگەی ـ و ، وو ـ بوو ، ئەوا نێوبڕی / + یـ + ی نەبزوێن دەبێتە لەمپەر .. وەك : [ سێیەم ، یازدەیەم ، نۆیەم .. هتد .

دەمێنێتەوە قاڵبی [ سێهەم ، نۆهەم ... هتد وەك کۆڕی زانیاری لەسەر بەرگی گۆڤارەکەیان نووسیوە ـ بەرگی نۆهەم ـ . بەناهەق لەزمانی نووسیندا سەرەوبەرەیان پێدەکەن ، دیاردەیەکی خۆماڵی نیەو سەربە تایبەتی زمانێکی دیکەیە . لێرەشدا نەبزوێنی [ هـ ] بووەتە نێوبڕ . کەواتە نیوبڕی [ یە ] شتێکی بێبایەخی ڕواڵەتیی دروستکراوە . زێدەی [ ین ـ حەوتەمین ] لەبەرچیەو لە کوێوە هاتوە ، لێکۆڵینەوەی دەوێ و کورد دەڵێ [ نۆمینەی حاجییان ] ماوەی لەسەر ڕۆیشتنم نیە .

* ل 182 : وا دەردەکەوێت لە [ یانزە ، دوانزە ، پانزە ... دا ، ان ـ نیشانەی ژمارەی تەوەزیعیە ، ـ ز ـ لە وانەیە کورتکراوەی (نیز) بێ . فرێدانی ـ ان ـ لەبەر قورسیە » .

لێرەدا تێماوم ؛ ئەگەر بەخستی بەشوێن ئەم باسەبکەم ، زوری بەبەرەوەیە . بۆباری سەرنج ، جەمسەرێکی لێوەدەردەخەم و بەجێی دەهێڵم بۆ دەرفەتێکی دیکە :

أ ـ ئەم بۆچوونەی ئێرە ، هەمان بۆچوونی مامۆستا نووری عەلی ئەمینە کە ئەم پێکهاتنەی سازداوە :

« ژمارەی ئەسلی و دوای سوان + ئامرازی ـ ان ـ ی تەوزیعی + ئامرازی لێکدەری ـ نیز + 10 + یانزدە ، پانزدە[16] ... » بەرەورووبان دەبمەوە :

1 — کە ـ نیز ـ ئامرازی عەتفبێ ، بۆچی لە هەندێ لەو ژمارانەدا هەیەو لەوانیدیدانیە ؟

2 — بە چ کارلێککردنێکی فۆنەتێکی (دوانگزە ، پانگزە .. ) سەریان هەڵداوە ؟

3 — کەی و بە چ یاسایەك نیشانەی تەوزیعی دەخرێتە پاڵ ئەو ژمارانەو نیشانەکەش هیچ دەورێکی نەبێ ؟... لەو لایشەوە دەزانین کە فۆرمی ژمارەی تەوزیعی شتێکی دیکەیە ؟

4 — کە بڕیاری [ نیز ] دراوە، بۆچی دەنگی ـ ن ـ لە ـ یانزدە ـ دا ، پاشماوەی ئەو نەبێ ... ؟

ب ـ ئەوجا بادەدەمەوە بۆ وردەکارییەکی مامۆستا مەسعوود محەممەد ـ کە نووسیویە :

« گرفت لەژمارەکانی ـ 11 ' 12 ' 13 ' 16 ـ دا هەیە. لە لەهجەی سلێمانیدا ، دووجار مامەڵەت جیاوازیکردوە :

1 — دەنگی ـ د ـ ی ژمارە ـ 10 ـ ی پەڕاندوە ، ماوەتەوە ـ یازە ، دوازە ... ـ . هەست بە نالەبارییەکی فۆنەتێکی دەکرێ .

2 — لەولاوە نوونێکی بۆ ناواخنی ژمارەکان هێناوە ، بووەتە پارسەنگی دالە وەلانراوەکەو ناچارییەکی فۆنەتیکیە کە دەڵێی : ـ یانزە ، دوانزە ... »[16]

دیسان بەرەورووی مامۆستاش دەبمەوە کە لە جەرگەی ئەو سەرنجە وردەیەوە ، هیچ هێمایەکی بە دیاردەی جووتە دەنگی ـ ا ، ز ـ نەداوە ؟ ... سەبارەت بەچی پەڕیونەتە نێو ئەوژمارانەوە کە ئەو گرفتەیان تێدایە ؟! . لەلایەن خۆمەوە ، جارێ بۆی دەوەستم .

* ل 198 : ئەوەندەی بۆ تۆ / ئامرازی ـ بۆ ـ بۆ دابەشکردنە » .

لێرەدا ، خودی ـ بۆ ـ سەر بە خاوەنیەتە ، چەمکی بەشایەتی یان چەندیەت ، لە دارشتنی [ ئەوەندە ] وە ، هەڵدەستێت .

لەلاپەرە (200) دا ، نووسیویانە : پیتو ئامرازی بەستنەوە » .

لە زمانی کوردیدا ، پیت ـ بۆ ئەلفوبێ ، جێی خۆیگرتووە کارێکی نارەوایە بۆ ئامرازو نیشانەش بە کاربهێنرێ .

ئەگەر چاو لە ڕێزمانی عەرەبیش بکەین ، دابەشکردنەکەی ئەوان لەگەڵ هی ئێمەدا زۆرجیاوازە . بۆچوونەکەی ئەوانیش پەسندناکەم و بۆشمنیە لەسەری هەڵبدەمێ .

لە لاپەڕەی دواییدا ، دەڵێن : ئامرازی [ بۆ نزیکو دوورخستنەوەیە ، وەك : گەرماو سەرما ، تێکۆشانو سەرکەوتن .

دەڵێم : چەمکی دوورو نزیکی ، لە هاودژایەتیو سەبارەتیی وشە سەربەخۆکانەوەیەو هیچپەیوەندی بە واوی عەتفەوە نیە . ئەرکی ئامرازەکە ، جۆشدانیانە لە حوکمی ڕستەکەداو هیچیدی . دوا گوتەم :

هیوادارم ئەم ڕەتانەی منیش بخەنە پاڵ ماندووبوونەکەی خۆیان .

### پەراوێزەکان

1 — دەنگی مامۆستا ، ژمارە — 2 — ساڵی دوەم : « بەزاوردێك دەربارەی وشەی ـ زانیار » ئالانی .

2 — حاجی قادری کۆیی ، بەشی دوەم . ل 238 — لێکۆڵینەوەی مەسعوود محەممەد .

3 — فەرهەنگی عەمیدو بورهانی قانیع .

4 — ڕۆژنامەی ڕاپەڕین ، سلێمانی پایزی 1967 .

5 — کێشەیەك لە ڕێزمانیکوردیدا ـ 1981 / ئالانی .

6 — هەمان سەرچاوەی پێشوو .

7 — و — 8 — فەرهەنگی عەمید .

9 — فەرهەنگی مەردۆخ / کار یەك لائی .

10 — لە زاراوە زانستیەکانی کۆڕی زانیاریدا ـ 1976 ـ زاراوەی جامع ـ یان بە ـ کۆکەرەوە ـ کردوە بە زاراوەیەکی کوردی . لە گۆڤاری کارواندا / ژ — 1'2'3 ـ دا ، ئەو زاراوانەم هەڵسەنگاندون .

11 — ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی / کۆڕی زانیاریی کورد 1976 .

12 — چاوگی بێواتا لە زمانی کوردیدا ـ د . نەسرین فەخری / 1973 .

13 — فەرهەنگی خاڵ . جـ 3 چـ 1976 .

14 — گولگەشتێك بە میرغوزاری خانای قوبادیدا سلێمانی 1980 ـ ئالانی .

15 — گۆڤاری ژمارە ـ 9 ـ ی دەستەی کوردی کۆڕی زانیاری . ل 396 .

16 — هەمان سەرچاوەی پێشوو . ل 342 .

# نواندنی شانۆیی و ئەکتەری کورد

ياسين قادر بەرزنجي

**هونەری نواندنو ئەکتەر :**

مرۆڤ هەستدارترین گیانەوەری ئەم بوونەیە ، بەهۆی مێشكو ئەندامە چالاكەكانییەوە هەر لە خۆرهەلاتی ژیانو لەبەرەبەیانی دەركەوتنی تیشكی مرۆڤایەتی یەوەو لەهەلكردنی چرای هەلسوكەوتی هۆشیارانەوە بووەتە نزیكترین دۆستی ئەم سروشتە فراوانو بەربلاوە ، سروشتیش خۆی لەخۆیدا قوتابخانەیەو چاوگی هەموو جوانی یەكەو سەرچاوەی گشت هونەرێكە . چۆمەر لە « بەسەرهاتی پزیشكێكدا » ئەلێ : ـ [ سروشت بەتوانا مەزنەكەیەوە گەورەترین داهێنانو ئەفراندنی هێناوەتە گۆڕێ ، هەر وەك ئەوەی پێمان بلێت : بڕواننە منی سروشت ؛ بزانن چۆن توانیومە شت بخولقێنمو كەی ویستبێتم وێنەی جوان جوانم بۆ كێشاون ، جا ئیتر كێ لە باریدایە با بێت سوودم لێ وەربگرێتو لاساییم بكاتەوە ][1] .

مرۆڤ ڕەنگكێشی چارەنووسی سەردەمە جۆراو جۆرەكانەو بە چاكی ی هۆگری ژیانو بەرهەمو چالاكییەكانی بووەو مەزنترین دەوری لەمێژوودا بینیوە ، ئەم هۆگربوونە وای لە مرۆڤ كردووە كە گەلێك لایەنی ژیانی خۆی جوانو پڕ لەشەوق بكات ، هەر بەهۆی كارتێكردنو دەوری سروشت لەسەریو بەهۆی هەلكەوتنی دەوروبەرەكەیەوە كارێكو بەرهەمێكی ئەوتۆی وەدەست هێناوە كە هەر لەتوانای ئەودایە . ئادەمیزاد ئەو كاتەی نێچیریان ڕاوكردووە چۆنێتی كارەكەیان چەشنە جموجۆلی یەك بووە لەهەلسوكەوتی ڕۆژانەیان جیاوازبووە .. هەر بۆیە ناچاربوون چەند شێوازێكی لەنواندن چوو لە دەم و چاوو دەنگو جولانەوەیاندا بكەن .. یان ، بەكارهێنانی ئاگر لای مرۆڤی سەرەتایی دیسانەوە كرداری وەكو « نواندنی » هێناوەتە ئاراوە .. بەلێ ؛ نواندن هەر لەسەرەتای ژیانی مرۆڤەوە هەبووەو مرۆڤ بەگوێرەی پێشكەوتنی هەستو بیری گۆڕانی بەسەردا هێناوەو تا ئەمڕۆش بەردەوام لەناوەرۆكو شێوازی ئەم هونەرەدا گۆڕان هەر هەیە .. ئێستا هونەری نواندن بووەتە هونەرێكی سەرەكیو بلاو لە گشت شوێنێكی دنیادا وەك یەكێك لە هونەرە مەزنو سوودبەخشەكان بەهای لەشانۆداو پاشانیش لەسینەماو ڕادیۆو تەلەفزیۆندا دەركەوتووە . ژان لوی بارۆ وتویەتی : ـ [ بۆیە پیشەی ئەكتەریم هەلبژاردووە تا هەوو ڕێگای گەیشتن بە برا مرۆڤەكانم ببینمەوە ][2] .

نواندن لەژێر تیشكی سەلیقەی مرۆڤدایە ، تەنیا مرۆڤی بەهرەدارە ئەتوانێ خۆی بنوێنێت « واتە تەمسیل بكات » ، بەهرە ئەگەر لەمرۆڤدا نەبێت ئەوا ئەو مرۆڤە بێ بەهرەیەو نابێتە ئەكتەر ، خۆ ئەكتەر گەر لەپاڵ بەهرەكەیدا ڕۆشنبیریی فراوانی لە مەیانەی هونەردا هەبێت ئەوا ئەبێتە ڕابەرو هونەرمەندو پێشەوای هونەرەكەی .

ستانسلافسكی بڕوای وایە ئەكتەری بێتواناو بێ بەهرە ئەبێ شانۆ چۆڵ بكەنو ئاژاوە نەنێنەوە .. هەروەها ئەكتەری بەتواناو بەهرەداری هونەرمەندو ڕۆشنبیر نرخی هونەرەكەی ئەزانێو ئەبێت بە چاكی لە بەهای نواندنو شانۆو هونەرەكەی بگات ، ئەبێ بە چاكی لەو ڕاستی یە تێ بگات كە [ ئەمڕۆ هونەر

کاراکتەرەکانی ترەوە ئەو کەسەمان پێ ئەناسێنێت ][7] .
ئەکتەر بەپێچەوانەی گشتی هونەرمەندێکی ترەوەیە ، چونکە کەرەستەکانی دەربڕینی لەدەرەوەی خودی خۆیدا نامێنێ ، بەڵکو لەناو خۆیدایەتی ، ناوەوەی ئەکتەر جیهانێکی تەواوە [ بەجولانەوە وێنە ئەکێشێو بەدەنگ ئاواز لێ ئەداتو بە بێ دەنگی ئەنووسێت ... ] ، لەم کۆشەیەوە ئەبینین فرمانی ئەکتەر لەشانۆدا لەفرمانی نووسەر یان دەرهێنەر یان بینەر کەمتر نییە ، بەلام هەڵسوکەوتی ئەکتەر لەشانۆیەك بۆ شانۆیەکی ترو لەزەمانێك بۆ یەکێکی تر جیاوازە ، بۆ نموونە :

[ ئەکتەر لەشانۆی ئەرستۆییدا تەنیا خودی کەسێ لە شوێنو کاتێكو دەوروبەرێکی دیاریکراودا ئەگەیێنێت . ئەکتەری شانۆی مەلحەمیش شایەتێکەو ئاگاداری هەموو شتەکانە ، ئەو شت ئەگێڕێتەوەو بێ لایەنە ، قسەی خۆی ناکات ، ئەشزانێ باسی چی ئەکات ، لەم شانۆیەدا ئەکتەر وەك هەریەکێ لەهۆکانی ڕاگەیاندنی لێ دێت « بیر » لە ڕێگای وەسیلەکانی گوێ گرتنو بینینەوە ئەگەیێنێت . بەلام ئەکتەری شانۆی ئاهەنگ سازی « الأحتفالي » تەواو پێچەوانەی ئەکتەرانی شانۆی درامایی کۆنو مەلحەمییە ، چونکە تێکەڵە لە هەردوو جیهانەکەی واقیعو خەیاڵ ؛ وەهمو ڕاستی ، لەم شانۆیەدا ئەکتەر یارییەك ئەکات ، جیاوازە لە گشت یارییەکیش کە بە زۆر بهێنرێتە گۆڕەپانەوە .. ][8] .

یەکێك لەو مەرجانەی کە ئەکتەر هونەرەکەی پێ ڕازاوەو جوان ئەکات ڕاستگۆییە لە نواندنا ، ئەگەر بینەرببینێ ئەکتەرەکەی سەر شانۆ ڕاستگۆیەو بەبێ زۆر لەخۆکردنو دەنگ گۆڕینی درۆزنانەو هەڵچوونو داچوونی بێ سەروشوێن دەورەکەی ئەبینێ ئەوا بەباشی گوێ لەگشت ڕستەو دیالۆژی دراماکە ئەگرێتو بەسەرنجەوە لەبابەتو جولانەوەکان ورد ئەبێتەوەو ئەنجامی ئەم کارەش بە سوود وەرگرتنی هەردوولا ئەشکێتەوە ، واتە سوودی ئەکتەرو بینەر . شچیپکن لە نامەیەکیدا بۆ شەمسکیی قوتابی نووسیویە : [ تۆ دەورەکەت باش بینیو لەهەمان کاتیشدا خراپ بینیت ، گرنگ ئەوەیە لە نواندنی دەورەکەتدا ڕاستگۆ بوویت ][9] .

بە هەمان شێوەش ، لەلای ستانسلافسکی ڕاستگۆیی لەنواندنا ڕەگەزی سەرەکییە لە ئاوێتە بوونی توانای دەرکەوتنو خستنە ڕووی ئەکتەرو بەهرەی نواندنەکەی . ئەو « بەهرە » ئەکاتە یەکەم هۆی سەرکەوتنو لە هەمان کاتیشدا ڕستەی [ بڕواو هەست پێ کردنو ڕاستگۆیی ][10] ئەکاتە تابلۆیەكو بەسەر دیواری هۆڵی قوتابخانەکەیدا هەڵیئەواسێ .

لە وڵاتێکی وەك پۆلۆنیادا شانۆیەك بەناوی « هەزار » هوە دروستبوو ، دامەزرێنەری ئەم شانۆیە گرۆتۆفسکییەو ئەم ئەکتەری بە یەکەمینو تاقە هونەرمەندی شانۆ ئەزانی ، لای گرۆتۆفسکی وابوو کە ئەکتەر بە تەنیا لە باریدایە هەموو شتێ بە ئەنجام بگەیێنێ .. ئەوەتا سەبارەت بە شانۆو نواندنو ئەکتەر ئەڵێت : [ گرنگترین توخم لە هونەری شانۆدا ئەکتەرە ، موڵكو خاوەنی کاراکتەر ئەکتەری بەتوانایە ، ئەتوانرێت بێ ئارایشتو جلو بەرگو دیکۆر شانۆ بخرێتە بەرچاو ، تەنانەت تەختەی شانۆی تایبەتیش ؛ تیشكو کارتێکردنە دەنگییەکانیش گرنگ نییە ، ئەوەی مەسەلەکەی پێ ڕائەپەڕێت تەنیا هەر ئەکتەرەو ئەکتەر ][11] .



**ئەکتەری کورد**

ئەکتەری کورد وەك هەر هونەرمەندێکی تری ئەم نەتەوەیە جێگای دیاری خۆی لەزەمینەی خزمەتکردنا هەیە ، ئاشکرایە کە ئەکتەری بەهرەدار بزوێنەری شانۆو هۆی سەرەکییە لەسەرخستنی شانۆگەریدا . ئەکتەرانی خاوەن بەهرە لە هاملێتەکەی شەکسپیردا ئاوا ناوبراون : [ باشترین خزمەت ئەبێ بۆ ئەکتەرەکان بێت ، چونکە ئەوان کرۆکی ژیانی سەردەمو کورتەی مێژووەکەین ][12] .

شانۆ کە کۆی گشت هونەرێك بێت ئەوا پێویستە ئەکتەرانی بەتوانا ببنە پێشڕەوی کارکردنی ، هونەرمەندی شانۆش بەو کەسە ئەوترێت کە قاڵ بووی هونەرەکەی بێت ، کەسێك بێت تا ڕادەیەکی باش چووبێتە کرۆکی بیرو ڕواڵەتە جوانکراوەکان ، هونەرمەندی هۆشیار دروستکەری شانۆگەریی سەرکەوتووە . زۆر هونەرمەند هەن ڕەوڕەوەی مێژوو بەلایاندا وەرچەرخاوەو ماوەیەك لایان ئارامی گرتووە، دواجار ناویانی لە سەر سنگی تۆمار کردووە ، ولیەم شەکسپیر



دوای مەرگی خۆی لە پایەو مەقامێکدا سەیر ئەکرا کە پێی بووترێت (گەورەترین کەسە لەدوای خوا) ، تەنانەت لە وەسفی هونەرمەندی ڕاستەقینەدا ووتراوە : (ئەو کاتەی هەزارێك یان هونەرمەندێك ئەمرێت ئەستێرەیەکی ئاسمان ئەکوژێتەوە) . هەر بۆیە هونەرمەندی گەورە شایەتی ئەو سەردەمەیە کە تیایدا ئەژی . لۆرکا دەربارەی شانۆو دەوری هونەرمەندان ووتویەتی : - [ شانۆ بەر لەهەموو شتێك هونەرەو بەرزترین جۆری هونەریشە ، ئێوەش ئەی ئەندامانی تیپەکان بەر لەهەموو شتێك هونەرمەندن ، هونەرمەندن لەتەوقی سەرتانەوە تا قولەپێتان ، چونکە لەڕێی ئەفین و لەڕێی نیشتمانداو لەڕێی پیشەکاری هاتوونەتە جیهانی شانۆگەرییەوە ، ئەو جیهانەی پڕە لە خەیال و پریشنە لە هیواو ئاوات ، ئێوە هونەرمەندن بە هیواو حەزی خۆتان ](*) .

ئەکتەری کوردیش وەك هونەرمەندی دلسۆزی ئەم گەلە بەشێکی دیارن و ئەستێرەیەکی پرشنگدارن لەئاسمانی هونەری کوردیدا ، ئەکتەری کورد لەو کاتەوەی شانۆگەری کوردی وەك دیاردەیەکی تەمسیلی ساکارو وەك چالاکییەکی کۆمەلایەتی نێو قوتابخانەکان و نێو دەستەی لاوانی کورد دەرکەوتووەو وورده وورده لەگەل ڕەوتی بەرەوپێشەوە چوونی تێکستی شانۆگەری و لەگەل هاتنە پێشەوەی ئافرەتەوە بۆ بواری نواندن و دەرکەوتنی چەند دەرهێنەرێکی لێ هاتووتر لەوانەی پێش خۆیان و پاش ئەوەی جەماوەری کوردستان بە بەرۆشترو لەڕوانگەیەکی تازەترەوە ڕوانیویانەتە شانۆگەرییە کوردییەکان ، ئەوا ئەکتەری کوردیش هەنگاوەکانی خێراترو جێگیرتر کردووە . خۆ دەرچوونی دەستەیەك قوتابی خوێنگەرم لە پەیمانگای هونەرە جوانەکان ئەوا کارێکی چاك و بە سوودی هەبووە لەسەر بەرهەمی شەستەکان و بەرەودوا . بەهەمان شێوەش ، کە سالانی حەفتا بارێکی نوێ و گونجاو وەپێکەیشتووتر بۆ نەتەوەکەمان خولقاوە ئەوا بەهرەی هەلکەوتووتر لەوانەی پێش خۆیان لەریزی ئەکتەراندا بینراوەتەوە . هەر لەم قۆناغەدا ، واتە دوای حەفتا ، هاتنە پێشەوەی چەند هونەرمەندێکی بەتوانای دەرچووی ئەکادیمیاو پەیمانگای هونەر زیاتر نواندن و دەرهێنانیان بەرەو زانست و هونەرکاری بردووەو دیارترینی ئەو هونەرمەندانەش « أ . سالارو بامەرنی و تەلعەت سامان و کاکەیی و سەعدون و نەوزاد مەجید » ن . ئێستاش ، لەپال خزمەتکردنی بەردەوامی هونەرمەندانی خاوەن بەهرەی کورددا « کەبەردی بناغەی بزوتنەوەی شانۆی کوردین ، ئەکتەری تێگەیشتووو بیرڕوناکی بەتوانا لەڕیزی قوتابیانی پەیمانگای هونەرە جوانەکانی سلێمانی « کە کردنەوەی ئەم پەیمانگایە خەونی دێرینی بیرڕوناك و هونەرمەندانی کورد بووە » ڕوو لەبەرهەم و شانۆگەریی سەرکەوتووترن لەوانەی پێشوو ، هیواش زۆرە ئەم لاوە دلسۆزانە بە ڕوویەکی گەشەوە دەرکەون و لە خەباتی ڕۆشنبیریی ئەم گەلەدا دەوری شیاوی خۆیان بە لێوەشاوەییەوە ببینن .

شانۆی کوردی ، لەهەر سێ قۆناغەکەی گەشەسەندن و بەرەو پێشەوە چوونیدا

**واتە : ا - قۆناغی سەرەتای شانۆی کوردی لەبیستەکان تا پەنجاکان .**

**ب - قۆناغی پەنجاکان بۆ حەفتاکان**

**حـ - قۆناغی حەفتاکان تا ئەمڕۆ .**

ئەکتەری کورد بە درێژایی ئەو سێ قۆناغە کەم تا زۆر خزمەتی بەرەو پێشەوە بردنی هونەری نواندنیان کردووەو ئەمەش خۆی لەخۆیدا خزمەتێکی گەورەی بزوتنەوە شانۆییەکەیە . لەهەر قۆناغەدا چەند ئەکتەرێك دەرکەوتوون و بوونەتە خۆشەویستی تەماشاکەرانیان و بوون بە دیارترین هونەرمەندی ئەو چەند سالەی بەرهەمیان تیا پێشکەش کردووە . بۆنموونە لەقۆناغی یەکەمدا مامۆستا فوئاد ڕەشید بەکر ئەکتەرێکی دیارو ناسراو بووەو خەلکی بەچاوی ڕێزەوە تێیان ڕوانیوە . لەقۆناغی دووەمیشدا چەند ئەکتەرێکی وەك ڕەفیق چالاك و ڕەووف یەحیاو نوری وەشتی و کەمال ڕەشید موختار بە چاکی خۆیان بەبینەران ناساندووەو باشترین ئەکتەری پەنجاکانی سلێمانی بوون . تەنانەت هونەرمەندێکی وەك ڕەفیق چالاك ڕای ماقوول و جوانی لەسەر نواندن و ئەکتەر



هەبووە ، ئەوەتا خۆی ئەڵێت :

[ لەساڵی 1950 — 1956 دا مامۆستا « حەقی‌شبلی » م ناسی کە لە بەشی عەرەبی کاری دەکرد (دیارە مەبەستی بەشی عەرەبی ی ئێستگەی بەغدایە ـ ی . ق) وەك مامۆستایەکی شارەزای هونەر سوودی چاکم لێ وەرگرت ، فێری دۆزینەوەی نوێنەری باش بووم بۆ دەورەکانیان ، ڕێگای بەکارهێنانی مایکروفۆن‌و دوورکەوتنەوەو نزیك بوونەوە لێ ی ، باش بەکارهێنانی قورگ‌و دەم بۆ دەربڕینی ووشەکان‌و قسەکان ، تەرکیز لەسەر چیرۆکەکەو بیر نەڕۆیشتن بەهیچ لایەکدا ، باش گەیشتن لە چیرۆکەکە خۆی‌و ناوەرۆکەکەی لەگەڵ باش بەکارهێنانی ئاوازی گونجاوی مۆسیقاو کار تێکەرەکان = المؤثرات » ][14] . هەر لەم قۆناغەی پەنجاکاندا ژمارەیەك ئافرەتی بەهرەدارو دڵسۆزو چاونەترس چوونەتە سەرشانۆکانی کوردستان‌و هونەری کوردی بەچاوی ئەمەك‌و ڕێزەوە لەو ئافرەتە خزمەتگوزارانە ئەڕوانێت ، دیارترینی ئەو هونەرمەندانەش « نەجات مەحوی‌و گوڵزاری عومەرتۆفیق‌و نەرمین‌ناکام » ە . هەرچی ئەکتەرانی دوای ساڵانی حەفتاشە ئەوا ڕوو لە دنیایەکی نوێ تری هونەری نواندنەکەیانن ، خۆ بەرەو پێشەوە چوونی شانۆکەمان بەگشتی‌و بینینەوەی تێکستی شانۆگەری سەرکەوتوو بوونەتە هۆی پاڵ پێوەنانی ئەکتەروو تا چاکتر سۆراغی هەر سێ مەوداکەی نواندن « سروشتی‌و سایکۆلۆژی‌و کۆمەڵایەتی » کە خاڵی دەستپێکردنی ئەکتەرن بۆ بەرەو ئەفراندن چوون‌و خزمەتکردن بەو دەورانەی پێیان ئەسپێرێت ، بۆیە ئەڵێین : ـ ئەمرۆ کە زیاتر بینەرانی هونەری کوردی بوونەتە خاوەنی ڕۆشنبیریی گشتی‌و تا ڕادەیەك ڕۆشنبیریی هونەرییش ، ئەزانن کام ئەکتەرە بەتوانایەوە کامەش کاڵ‌و کرچ‌و مایە بەتاڵە ! .

خۆ هەرچی مەسەلەی یەکەمی‌و دەرکەوتوویی‌و ناسراویی ئەکتەریشە ئەوا ئێمە بەمەسەلەیەکی نیسبیی ئەزانین‌و ئەکتەری کورد تواناو بەهرەی خۆی لەبەرهەمێك بۆ یەکێکی تر جیاوازن ، هۆکانی ئەمەش زووتر لێیان دواوین‌و ئەوەی لێرەدا پێویستە تۆماری بکەین ، ڕایەکی هونەرمەند تەها بابانە کەتەواو نزیکە لەم مەبەستەمان ، مامۆستای بابان ئەڵێت : [ ئەو قسەیە هەڵەیە کە دەربارەی ئەکتەر ئەکرێ‌و هەندێك ناو ئەنێت « یەکەمین ئەکتەر » ، بەڕای من ئەکتەری باش‌و ئەکتەری خراپ هەیە ، واتە بەتواناو بێ توانا ، باشترین ئەکتەریش هەیە بۆ بینینی دەورێکی دیاری کراو کە هۆی ئەمەش لەگونجانی توانای ئەو کەسەدایە لەگەڵ چۆنێتی‌و هەڵکەوتنی سروشتی ی کاراکتەرەکەدا ، باشترین بەڵگەش بۆ سەلماندنی ڕاکەی ئێمە خەڵاتەکانی ئۆسکارە کە هەرساڵەو ئەدرێت بەئەکتەرێك ، ئێمە ئەکتەری کوردمان هەیە لەدەورێکی دیاری کراودا سەرکەوتووەو لەهی تردا دواکەوتووە ، بۆنموونە کەمال سابیر لە « حاجی ئەبو بەکر » هکەی چەخماخەدا سەرکەوتووەو لە « قازیی » خانمی مەکربازدا بە پێچەوانەوەیە ، مستەفا ئەحمەدیش لە « وەستا عەلێکەی » لانەوازاندا گەیشتووەتە لوتکەی داهێنان بەڵام لە ترێ‌و ڕێوی‌دا وانی‌یە !.. ][15] .

ئێمە ئەمرۆ پێویستمان بەو ئەکتەرە هۆشیارە بەهرەدارانەیە کە بە ڕەوشت بن بەوێنەی ئەو ئەکتەرانەی ستانسلافسکی ی مامۆستای گەورەی شانۆ مەبەستین ، ئەو ڕەوشتی ئەکتەر لەم سێ‌جێگایەدا داوائەکات : ـ

[ 1 — **ڕەوشتی ئەکتەر لەشانۆدا** .

2 — **ڕەوشتی ئەکتەر لەدەرەوەی شانۆدا** .

3 — **ڕەوشتی ئەکتەر لەپەیوەندی نێوان لایەنەهونەری‌و ئیداری‌یەکانی شانۆدا** ][16] .

هەروەها ئەو دژ بە ناو دەرکردنی ئەکتەرە بە [ ئەستێرەی سەردەم‌و پاڵەوانی هونەرو دەرکەوتووی تیپ ... ][17] .

ئێمە بڕوای تەواومان بە ڕۆشنبیریی ئەکتەری شانۆیەو بەهای خۆ فێرکردنیش دەمێکە لەلای زۆربەی خەڵکەکە ناسراوە ، هەرچەندە تا ئێستا سەرچاوەی لێدوان‌و شیکردنەوەی قوتابخانە نواندنی‌یەکان نەگەیشتووەتە نێو کتێبی کوردی‌و بەرچاو ، بەڵام پێویستە هەوڵی زیاتر بدەین لەگەڵ ئەو مەسەلەیەو بەجێ هێنانی ، پێویستە ئێمەی ئەکتەر بە پلەی



یەکەم پشت بەو سەرچاوە خاوەن تیۆرییانە ببەستین کە دەمێ ساڵە بوونەتە پێڕەو ورێباز بۆ تێگەیشتن و کاری پراکتیکی هونەرمەندانی وڵاتە پێگەیشتووەکانی هەندەران و لەهەمان کاتدا سوود لەو چەند ڕەخنەو بۆچوون و سەرنجە بەجێ و ماقووڵانە وەربگرین کە بەقەد قەوارەی بزوتنەوە شانۆییەکە نووسراوەو هەندێکیان وەك ڕەخنەن و هەندەکەی تریان وەك باری سەرنج و لێکۆڵینەوەن .

ئەکتەری وریا پەیامبەری شانۆیە بۆ هیواو ئاکامەکان ، پێویستە نوێ بوونەوەو گرنگی پێدان لە کاری ئەکتەردا هەردەم ببنە نیشانەی نەوەستان و بەرەو پێشەوەچوونی ئەکتەرو شانۆگەری . لویچی بیراندیللۆ ئەڵێت : [ کاری ئەکتەر ڕەنگدانەوەی بەرهەمی نووسەرە ، ئەو سەر لەنوێ ئەیگۆڕێتە سەر زمانی ژیان و بزواندن ، کەپێشتر نووسەر نەیتوانیوە ئەو بزواندنەی بداتێ .. ئەو شێوەو دارشتنە نوێیەی ئەکتەر ئەیکات بەبەریدا ، جۆرێکی نوێ وەر ئەگرێ کە لەگەڵ قەلافەت و تواناو بەهرەو هەستی ئەو ئەکتەرەدا گونجاوەو بەهۆی لەشی و دەنگییەوە دەری ئەبڕێ و داهێنانێکی نوێ دەرەخسێنێ کە جیاوازە لە داهێنانی نووسەرە شانۆییەکەدا ][18] .

کاتی خۆی چەند کێشەیەکی زیندووی نواندن و ئەکتەری کوردمان بەگوێرەی بۆچوونی خۆمان لەووتارێکدا بڵاوکردەوە[19] ، هەر لەو باسەدا وتمان : ئێمە دەیان ئەکتەرمان هەیە کەسەرەتای کارکردنیان مایەی دڵخۆشی بووەو ئومێدی ئەوەیان لێکراوە کەببنە ئەکتەری هەڵکەوتووی خاوەن ئەزموونی دەوڵەمەند .. ئەوان [ زۆربەی نواندنەکانیان پاك و سەرکەوتوو بووە ، « بێگومان بەگوێرەی توانای ئەو دەمەی خۆیان » ، بەلام دواکەوتنیان لە کاروانی ڕۆشنبیری و خۆ فێرنەکردن و مەشق نەکردن بۆتە هۆی دواکەوتنی بەهرەکەیان و لەهەمان کاتدا سەرەتاو دەرکەوتنی ئەکتەری لاوی ڕۆشنبیرو مەشقکەر بوونەتە هۆی کوژانەوەی چرای توانای ئەوان و وەستانی ئەو ئەکتەرانەی پێشوو ][20] .

پێویستە ئەکتەری ئەم چەرخە تیژڕەوەی بیررووناکیی تیشکی خۆی بەگشت لادا پەخش و بڵاوکردووەتەوە ، پێویستە زیاتر لەجاران ئاگادارترو بیرفراوان تربن ، پێویستە مەشقی بەردەوام لەدەنگ و بزوتنەوە ببێتە پرۆگرامی ژیانی هونەرییان ، بۆ ئەوەی (وەك ئەو شلەیە وابن کە ئەیکەنە نێو شووشەی جیاجیای تاقیگەوە ؛ هەموو جارێك باری تایبەتی خۆی وەرئەگرێت) ، پێویستە ئەکتەری کورد ئاگاداری بەرهەمە ڕابووردووەکان بێت و لە تێگەیشتنی مێژووی هونەرەکەی دوورەو پەرێز نەبێت و هەرگیز خۆی لەو هەڵسەنگاندنە بە دوور نەگرێ کە ئەرکی سەرشانی هونەرمەندانی هۆشیارە .. ئەبێ ئەکتەرێك بێ لە ئەنجامی هەموو چالاکی و بەرهەم و دەرکەوتنێکدا مەزنی و پیرۆزیی شوێنی کارکردنەکەی کە شانۆیە لەیاد بێ ، ئەبێ هەردەم ئاگای لەوەبێ کە شانۆ شیللەر وتەنی « دامەزراوێکی ڕەوشت بەخشە » و لەچاوی چیخەفەوە بڕوانێتە شانۆ کە ئەو « واتە چیخەف » لەسەرزاری یەکێك لە پاڵەوانەکانی یەوە وتویە : - [ ئەوە چییە ؟ .. لەسەر شانۆ فیکە لێدەم ؟!... بۆ تۆ ئەتوانیت لە کڵێسە فیکە لێ دەین ؟! ئەی بۆ ، شانۆ وەك کڵێسە نییە ؟!.. ][21] .

هونەر بەگشتی ئەبێت سەربەست بێ بۆ ئەوەی پەردە لەڕووی گشت دواکەوتنێکی کۆمەڵ و گشت کێشە ئاڵۆزەکانی ئەم ژیانە لابدات ، هونەری سەربەرزو ڕاست هونەرمەندی ڕاستگۆو دلێرو سەربەرزی ئەوێ ، ئەبێ ئەکتەری ئێمە بەباشی لەوەبگات کەهونەرمەندێ بووە داردەستی نیازی تایبەتی دەستگایەك ئەوا بەهای هونەدەکەی نامێنێ و تواناکەی بەرەو کزبوون ئەچێت و لە جەماوەریش دائەبڕێت . لۆرکا لەم بارەیەوە ئەڵێت : [ تا ئەکتەرەکان ژێردەستەی ئەم دەستگا بازرگانییانە بن کە هیچ شتێك جڵەویان ناگرێت ، نە چاودێرییەکی ئەدەبی یان سەر پەرشتییەکی میری لێیان ئەپرسێتەوە ، بگرە هەموویان بەردەستەی دەستگای وان کە فریان بە ڕۆشنبیری و هونەرەوە نییە ، جابۆیە وەك سەرەنجامێ هونەرمەندو خاوەن بەرهەمەکان شانۆو خۆیان لە نزم بوونەوەیەکی بەردەوامدا ئەبیننەوە ، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ دێنە دواوە بێ ئەوەی هیچ هیوایەکی ڕزگار بوونیان هەبێ ][22] .

# شانۆگەری «میوانی

بۆ یەکەم جار لە شەوی نەورۆزی ئەمساڵدا شانۆگەری «میوانی ناوەخت» لە تەلەفزیونی (التأميم) پێشکەش بە بینەرانی ئازیز کرا . لە راستیدا جوانترین دیاری بوو بۆ جوانترین بۆنە . من بەش بەحاڵی خۆم دەمێك بوو بە پەرۆشەوە چاوەروانی ئەم شانۆگەریەم دەکرد ، وەك بینەرێك تامەزرۆی بینینی بووم . ئەوەی زیاتر سرنجی راکێشام ئەو چاوپێکەوتنە بوو کە لە گەڵ کاکی دەرهێنەر (ناصر حسن)و کاك جەمال نوسەری سیناریوکەدا سازکرا ، پێش پێشکەش کردنی شانۆگەریەکە .

ئەم شانۆگەرییە لە گەلێ روەوە بە شاکاریکی نایابو بێوێنە لە بواری شانۆگەری کوردیدا کە لە دەرەوەی ئستودیۆدا گیرابێ لە قەڵەم دەدرێ . هەر ئەمەش پاڵی پێوەنام کە هەندێ تێبینی تایبەتی بەپێی بۆچوونو شارەزایی خۆم لە کاروباری کوردەواریدا بخەمەرو . هیوادارم لە هەردوو حاڵەتەکەدا چی ئەم تێبینیانەم توانیبێتیان ئەوکەمو کوریانەی پێکابێ یا نا ، برادەرانی خاوەن پەیوەندی لێمان دلگران نەبن ، چونکە مەبەستی ئەوەڵو ئاخیرم تەنیا خزمەت کردنو خۆشەویستی سەرکەوتنو پێشکەوتنی شانۆگەری کوردییە ...

تیبینیەکانم لەم چەند خاڵەی خوارەوە خۆیان دەنوێنن :-

یەکەم : ناونیشانی شانۆگەریەکە «میوانی ناوەخت» .

بێگومان ناونیشانی هەر بەرهەمێکی ئەدەبی شانۆگەری بێ یا هەر بەرهەمیکی وەك چیرۆكو شیعرو ... هیتر ، واچاکترە کە تەعبیر لە لایەنە زاڵبوەکانی ناوەرۆکی ئەو بەرهەمە بکات واتە دەرخستنی روداوە سەرەکیەکانە لەو بەرهەمەدا . لەم حاڵەتەدا بینەری شانۆگەری یان خوینەری بەرهەمەکە راستەوخۆ بۆی دەردەکەوێ کە ئەم بەرهەمە چارەسەری چ جۆرە گیروگرفتێ دەکاو لە دەور چ کارەساتێ دەسورێتەوە .

دەگەرێینەوە سەر باسەکەی خۆمان «میوانی ناوەخت» بینەر لەم شانۆگەریەدا دەبینێ ئەم پەندە پێشینانە کوردەواریە لەم شانۆگەریەدا سوچێکی یەکجار بچوكو نەبینراو لە شانۆگەریەکەدا پردەکاتەوە . ئەگەر بەووردی لە فەلسەفەی شانۆگەریەکە وردبینەوە دەبینین ئەم شانۆگەریە لە دوو روداوی سەرەکی لە دوو رەوشتی سەرەکی دەدوێ کە هەردوکیان هەریەکەی بەجۆریکی جیاواز لەوی دی رۆڵی خۆی لە دەرونی

سەرچاوەکان


1 — مارجۆری بۆڵتن ـ تشريح المسرحية ، ترجمة : دريني خشبة ، قاهره ، مكتبة الانجلو المصرية ، ص143 .

2 — ئەحمەد سالار ـ کۆمیدیا ، چاپخانەی زانکۆی سلێمانی ، 1981 ، ل 22 .

3 — مجلة الثقافة ـ العدد 11 — 12 ت 2 ، ك 1 ـ بغداد ، 1980 ، ص41 .

4 — فوئاد میسری ـ خەجو سیامەند ، بەغدا ، چاپخانەی علاء ، 1979 ، ل 4 .

5 — وليم شكسبير ـ هملت ، ترجمة : خليل مطران ، ص73 .

6 — گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ ، ژمارە 96 ساڵی 1982 ، قوتابخانە شانۆییەکەی ئەلکساندەر تایرۆف ـ وەرگێرانی : نووسەری ئەم لێکۆڵینەوەیە .

7 — هەمان سەرچاوەی پێشوو . ل 56 .

8 — محمد اديب سلاوي ـ الاحتفالية في المسرح المغربي الحديث ، سلسلة الموسوعة الصغيرة / 134 ، بغداد ، دارالرشيد ، 1983 ، ص117 .

9 — قسطنتين ستانسلافسكي ـ اعداد الممثل ، ترجمة : محمد زكي العشماوي ، قاهرة ، دار نهضة مصر ، قاهرة ، ص33 .

10 — هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ل 172 .

11 — هاوکاری ـ ژمارە 692 ' 16 / 6/ 1983 ، گرۆتۆفسکیو شانۆی هەژار ، نووسینی : د . عوني كرومي ، وەرگێرانی : نووسەری ئەم لێکۆڵینەوەیە .

12 — وليم شكسبير ـ هملت ، ص69 .

13 — گۆڤاری بەیان ـ ژمارە 80 ساڵی 1982 ، ل 22 .

14 — ڕەفیق چالاك ـ دەستنووسی یاداشتەکانی ، ل 66 .

15 — تەها بابان ـ چاوپێکەوتنی تایبەتی ، ڕۆژی 11/ 2/ 1984 .

16 — قسطنتين ستانسلافسكي ـ فن المسرح ، ترجمة : لويس بقطر ، قاهرة ، دار الكتاب العربي ، 1968 ، ص315 .

17 — هەمان سەرچاوەی پێشوو . ل 316 .

18 — هەندێ مەسەلەی شانۆیی ـ زنجیرەی ژمارە « 2 » بڵاوکراوەکانی کۆمەڵی هونەرو ویژەی کوردی ، مەڵبەندی گشتیی سلێمانی ، بەغدا ، چاپخانەی الحوادث . ل 40 ، لەنێوان نووسەری شانۆگەریو ئەکتەردا ، وەرگێرانی : محەمەد فەریق حەسەن .

19 — پاشکۆی شۆڕشی کشتوکاڵی ـ ژمارە 10 ساڵی 1981 ، ئەکتەر لەبزوتنەوەی شانۆی کوردیدا ، نووسینی : یاسین قادر بەرزنجی .

20 — هەمان سەرچاوەی پێشوو .

21 — الفنان في عصر العلم ومقالات اخرى ـ ترجمة : فؤاد دوارة ، ص123 .

22 — گۆڤاری بەیان ـ ژمارە 80 ساڵی 1982 .


تێبینی : ئەم باسە بەشێکە لەو لێکۆڵینەوەیەی لەسەر خواستی هاوڕێ خۆشەویستەکانم ئەندامانی تیپی نواندنی هەڵەبجە نووسراو ڕۆژی 28 / 8/ 1983 لەکۆڕێکدا کە ئەوتیپە بۆی سازکردم پێشکەش کرا «لە هەڵەبجە» . بۆ دووهەم جاریش ئێوارەی 17 ی شوباتی 1984 لەکۆڕێکی بەڕێوەبەرێتی ڕۆشنبیری جەماوەردا لە هۆڵی کرێکاری سلێمانی خوێندرایەوە .

# ناوەخت» و چەند تێبینیەك

نصرالدين مجيد شريف
كركوك

خەڵكی كوردستاندا دەگێڕێ ، یەكەمیان ، مەسەلەی وەفاواریو نمەكداریە ئەم مەسەلەیە لەناو كوردەداری خۆماندا پلەو بایەخێكی تایبەتی خۆی هەیە هەروەها لە ناو گەلانیتری ڕۆژهەلاتیشدا بەشێوەی جۆراوجۆر بایەخی تایبەتی پێدەدرێ . ئەم ڕەوشتە لە ئاینی ئیسلامیشدا بە شێوەیەكی فراوان ڕێزی لێگیراوەو وەك واجبیكی ئاینی لە قەلەم دراوە . وەك وتمان ئەم چیرۆكە لە زۆربەی وێنەو وتووێژەكاندا باسی وەفاداریو برایەتی عەزیز برای سوارەی كچ هەلگرو باپیری برای كچ هەڵگیراو دەكەن . ئەوە دەخەنەوە یاد كە كاتی خۆی دوو برابونەو بەلكو زیاتریش ، هەروەها بە وێنەش ئەمە پیشاندرا . وەك دەركەت ، هەر ئەمەش پالی بە باپیرەوە نا كە چاو لەسوارە بپۆشێ . هەرچەندە داوین پاكی سوارەو فاتەیشی بۆ دەركەوت كاتی كە لە مالیمەلادا بوونو ئەویش گوێی لە گفتوگۆی نێوان مەلاو سوارەبوو وە ڕاستی مەسەلەكەی بۆ دەركەوت هەرچەندە لەسەر ئەمەش تێبینی خۆمان هەیەو لە جێگەكیتر لەم ووتارەدا دەستنیشانی دەكەم .

لەبەر ڕۆشنایی ئەم ڕاستیانە دەبوایە ناو نیشانی شانۆگەریەكە لە دەوروپشتی وەفاداریو برادەری خۆی پیشانبدایە یاخود دووەمیان كە بریتیە لە نەریتی كچ هەڵگرتن كە كارەساتێكی یەكجار شومە لە زۆربەی زۆری ناوچەی كوردستاندا . گەورەترین نەگبەتی بەسەر خێزانێكدا بیت نەگبەتی كچ هەڵگرتنە ئەمەش بە شێوەیەكی زەق لە ناو شانۆگەریەكەدا ڕەنگ دەداتەوە تەماشا دەكەین خەڵكی گوندەكە پێشتر لە چ خۆشیەكدا بوونو دوا جار چ ماتەمیەك لە دوای كچ هەڵگرتنەكە پەردەی ڕەشی بەسەر دانشتوانی دێكەدا كێشا . بۆ هەر كوێ دەچوی باس باسی ئەو كارەساتەبوو . لێرەدا پرسیارێكی گەورە سەر هەڵدەداو خۆی دەسەپێنیو دەلێ باشتر نەبوو كە عینوانی شانۆگەریەكە لە چوارچێوەی ئەم دوو خاڵەی كە دەست نیشانمان كردن خۆیان بنوێنن چونكە ئەسلو هۆی ناوەرۆكی كێشەكە بوون ؟ ؟ .

دووەم : ڕۆلی باپیر برای كچ هەلگیراو لەقسەی زۆربەی دانشتوانی دێكە لەوانە باوكی عەزیز وادەركەوت كە باپیر پیاوێكی پیاوانەو بەوەفایەو هیچ جۆرە كارێكی نامەردانەی لێ ناوەشێتەوەو بەدوای تۆڵەسەندندا ناگەرێ . واتە ڕۆلێكی ئیجابی گێرا . لە شانۆگەریەكشدا بەتایبەت لە كۆتاییدا وای دەرخست . ئەمە خۆی لە خۆیدا ناكۆكیەكی «تناقض» یەكجار سەخت دەردەبڕێ . بینەر لێرەدا بۆی هەیە پرسیاركاو بلێ دەی كەوابو كاك باپیر تانەت ووت «ئەڵلاو تەبەق نەت ووت ئەڵلاوو سەدەق» بۆ لەسەرەتاوە قایل نەبووی كەخوشكەكەت بەپێی عورفو شەریعەتی ئیسلام لە سوارە مارەببرن ؟ ؟ .

مادام باسی باپیر دەكەین پێویستە پەنجەش بۆ ئەوە ڕاكێشین كە ڕۆلی باپیر لەهەموو لایەكەوە ڕۆلێكی نارێكو سلبیو پر لەناكۆكی بوو . دەبینین بەقسەی هەموو پیاو ماقولانی دێكە قایل نەبوو كە لەگەل عەزیزدا ڕێك بكەوێ ، سەرەرای ئەوەی كە عەزیز دەریخست كە باپیر چی دەوێ من ئەیدەمی بە مەرجێ لەگەڵماندا ڕێكەوێ ... ئەمە لەلایەكەوە لە لایەكیترەوە كە سواربوو بە نیازی تۆڵەسەندن ، كورد واتەنی «بەن برشی پێ نەبوو» كەوابو چۆن حەق دەسێنێ . لەم حالەتەدا دەبوایە دەمانچەیە خنجێری شتێكی پێبوایە بەلای كەمەوە نەك حەق بسێنێ بەلكو بەرگری لە خۆی بكردایە ، تەنانەت لە دزو جەردەو درندەی كێوی» .

سێهەم . بە شانۆگەریەكەدا وا پیشاندرا بە تایبەتی لە گفتوگوكانی نێوان سوارەو مەلادا كە مەبەستی سەرەكی لە هەڵگرتنی كچەكەدا ئەوەبوو كە ببنە شەریكی ژیانی یەكتروە بە هیچ شێوەیەك مەبەستی داوین پیسیان نەبووە . هەرچەندە ئەم بەلگەیە زۆر لاوازەو ناتوانێ قەناعەت بەبینەر بكا بەلام با ئەمەش لێرەدا ڕاوەستێو بگەرێینەوە سەر كردەوەی ژن هەڵگرتن ، لەبەر ئەوەی وەك لەپێشدا باسم كرد ئەم كردارە خۆی لەخۆیدا كردارێكی یەكجار ناپەسەندو چەپەڵە جا لەبەر ئەمە دەبوایە دووشتی سەرەكی لەم بارەوە پیشان بەبینەر بدرابان . یەكەمیان پێشماوەیەك بەهەڵگرتنەكە یان لە دواجاردا ئەوە ساخ بكرابا كە سوارەو كچەكە حەزیان لەیەك كردوەو دوو دلداری داوینپاكنو هەندێ گفتوگۆی میسالیان پێكەوە بكردبا ئەمە لە لایەكەوە لە لایەكی ترەوە دەبوایا بایەخ بە داخوازیو داوا كردنی كچەكە بدرابا ، تاكو سەرەنجام بینەر حەقیان بە كورەو كچەكە بدایە وەكو چارەسەرێكی ناچاری كە هیچ ڕێگەیەك نەما لەبەر دەمیاندا نەیگرنەبەرو هیچ دەرفەتیكی تریان نەما تەنیا ئەوەنەبێ كە هەردووكیان سەری خۆیان هەڵگرن كە ناودەنرێ ژن هەڵگرتن . هەروەها وەك باوە لە ناو

کۆمەڵگای کوردەواریدا کە ئەم جۆرە کارانە بە شەو دەکرێ چونکە کورد دەڵێ «شەو قەڵای مێردانە» . دەبوایە کچ هەڵگرتنەکە بەشەو بکرابا نەك بەڕۆژی نیوەڕو وەك رویداو پیشاندرا :

چوارەم : خەڵکی لادێ کە بیانەوێ چارەسەری کێشەیەکی ئەوتۆ بکەن وەك مەسەلەی چارەسەری کێشەی کچ هەڵگرتن و دووبەرەکی و مەسلەحەت کردن و شتی‌تر لەم حاڵەتانەدا کۆبونەوە لە ماڵی خاوەن پەیوەندیدا دەکرێ یان لەماڵ مەلایاقویخا دێ یاریش سپیەك ، خاس‌وعام حەقی ئەوەیان نیە بەشداری بکەن بەڵکو کەسانی دیاری و لێهاتو بەشداری دەکەن ، نەك وەك دیتمان لەسەر حەوزی مزگەوت ، چونکە لەم حاڵەتەدا لەوانەیە خەڵکی گێرەشێوێن و ناحەز دەوری تێکدان بگێرن وەك رویدا . چونکە مزگەوت هی هەموو خەڵکی دێیە نەك هی کۆمەڵێکی تایبەتی .

پێنجەم : هەندێ پەندی‌پێشینان هەن وەك رەمزوان و تەعبیر لە نەریت و رەوشتی جۆراوجۆری ژیان و بەسەرهاتی کوردەواری دەکەن . وەهەریەکەیان لە جێگەی تایبەتی خۆیاندا دەووترین و هەڵەو کەم و کوریش قبوڵ ناکەن .

بۆ نمونە «میوانی ناوەخت نانی لەسەر خۆیەتی» وەکو لە شانۆگەریەکدا ووترا ئەمە هەڵەیەو راستیەکەشی ئەوەیە «میوانی ناوەخت گلەیی لەسەر خۆیەتی» ئەمەش لەو حاڵەتانەدا دەوتری کە میوان درەنگ وەخت گەیشتبیت و کاتی ئەوە نەمابێ چێشت پێ‌بکا یاخود حەیوانێك سەر ببرێ و گۆشتەکەی پێ‌بکاو فریای میوان بکەوێ .

چونکە جاری جاران وەك ئێستا نەبوو کە کەرەسەی چێشت لێنان ئاوەها زۆربێ و بە زوویی چێشت پێ‌بکا . یان لەو حاڵەتانەدا ئەم پەندە دەوترێ کە میوان پەلەی بێ و نەتوانێ زیاتر چاوەروان بکا خاوەن ماڵ لەم حاڵەتانەی سەرەوە روودەکاتە میوان و دەڵی : میوانی ناوەخت گلەیی لەسەر خۆیەتی .

بێگومان لەهەمو حاڵەتەکاندا میوان هەر نانی لەسەر خاوەن ماڵ دەبێ بانانەکەش کورد واتەنی «دەرویشی بێ» .

جا لەبەر رۆشنایی ئەم راستییە ! هەڵەیە ئەگەر بوترێ میوانی ناوەخت نانی لەسەر خۆیەتی ! ..

لە کۆتاییدا هەندێ تێبینی بچکۆلەی‌تر هەن پێویستە فرامۆشیان نەکەین کەبریتین لەمانە :ـ دەبوایە کۆتایی شانۆگەریەکە یاخود جوانتر وابوو کە بەزەماوەندو شایی و هەڵپەرکێ کۆتایی پێ بهاتابا . چونکە لەراستیدا خەڵکی دێکە هەموو لە ناخۆشی و ماتەمیدا بوون بەهۆی ئەو کارەساتەوە بەکۆتاییشی کەوتنە خۆشی و شادمانی . ئەگەر قوتوەکەی عەزیز چەند دانە جگەرەیەکی تێدا بوایە باشتر شپرزەیی و لێقەومانی عەزیزی دەردەخست بەلام لەچۆڵی و بەتاڵی لەوانەیە والێکبدرێتەوە کە خۆی فەرییدابێتن . ئەم تێبینیانەی کە من لەم ووتارەدا دەرم خستن ، ئەگەر بەراورد بکرێن لەگەڵ جوانی و شاکاری شانۆگەریەکە لەهەموو روویەکەوە لەوانەیە بەشتێکی بچوك دابنرێن بەلام ووردەکاری لە بواری شانۆگەریدا بەتایبەتی شانۆگەریەك کەروداوەکانی فلکلوری‌بن کاریکی پڕ بایەخەو سود بەخشە . لێرەدا رای کچە هونەرمەندێکی لێهاتوی عەرەبم بیرکەوتەوە کە لەچاو پێکەوتنێکی رۆژنامەنوسیدا ووتبوی :

من کەپێویست‌بوو رۆڵی کچە لادێییەك بگێرم لە فلیمێکدا ناچار چووم بۆ لادێ تاکو بەتەواوی شارەزای هەڵسو دانشتن و رەفتاری لادێیەکان بم تەنانەت لەپێکەنینی کچە لادێیەکان سودم وەرگرت ، چونکە ئەوان کە پێدەکەنین دەستیان بۆ لای دەمیان دەبردو یان بەسەر پۆشەکەیان لایەك لە دەمیان دا دەپۆشی . لەم بارەوە ئەگەر دەرهێنەری شانۆگەری‌یان ئەکتەرەکان تازیاتر لە رەوشتی لادێیی شارازابن هێشتا هەرکەمە . دوا تیبینیم لەسەر رۆڵی کچەکەیە . ئەگەر بینەر بە ووردی تەماشای رۆڵی کچەکە بکا بۆی دەردەکەوێ کە ئەم کچە لە ئەوەڵەو تا دوایی وەکو کەرەسەیەك وابو ، کەرای‌کرد پەلەکێش دەکرا ، کە گەرایەوە وەکو نەخۆشێك یان پیرەژنێك خۆی بەسەر ئەسپەکەدا کێشابوو . ئەمە بەپێچەوانەی سروشتی کچی لادێین . چونکە کچی لادێ بەتایبەتی کە بتوانی بریاری رەدو کەوتن‌بدا دەبێ ئافرەتێکی جەربەزەو ئازابێ .

لە رێگەوباندا کچە لادێ خۆی هەڵدەکاو بەگورجی رێگە دەبرێ . عادەتێکی‌تر هەیە لە ناوکوردەواریدا زۆر باوە ئەمەش ئەوەیە کە ئافرەتی لادێیێ بەتایبەتی جوان و جاهێڵەکان کە نزێك ئاوایی بکەونەوە زۆر بە دەگمەن سواری وولاخ دەبن پێش نزیك بونەوە ئەگەر سواریش بن لە وولاخەکە دادەبەزن و بەپێ رێ دەکەن تەنیا بووك و باخەسو نەبێ .

# ڕوونکردنەوە

لە ژمارەی پێشوودا «22» تەمووز 1984»و لە لاپەڕە «20، 21»دا ، نووسینێکی مامۆستا حسین ڕەشوانی لەژێر ناونیشانی «دوو نامە بە دوو چامە»دا بڵاوکرایەوە کە دەبوو وێنەی دەستنووسەکانی لەگەڵدا بووایە . بەڵام بەداخەوە لەوەختی خوێندا لەبیرکرابوون . بۆیە وا لێرەدا وێنەکانیان بڵاو دەکەینەوەو داوای لێبووردنیش لەهەموو لایەک دەکەین ..

«کاروان»



دەستنووسی ژمارە ١



دەستنووسی ژمارە 2



دەستنووسی ژمارە 3

# هاودەم

شێرکۆ بێکەس

ئێوارەت باش ! ئەی «فورات»ی
لە شاخەوە بە ڕێکەوتووی
هەناسە سوار ! .
ئەی دایکی ئەگریجە تەڕی ، کوڵوانە : تەم
ئەی پشتی دەس دەماراویی
شین‌و دیاری هەر دوو کەنار
ئەی هاوڕێی شڵەژاوی خوارو خێچ ڕۆی
دەمێ تیژو
دەمێ هێواش
ئێوارەت باش !

* * *

تۆ نەبی چۆن ، من ئەم ژەنگی بێزاری‌یە
کە سەعاتی ژینی گرتووم .. لێم بێتەوە ؟ !
هەرتۆی تەنیا لەم مەڵبەندە تەریکەدا
بێمە لات‌و گوێم لێ بگری‌و لە باوەشتا
لە ناو جۆلانەی شەپۆلی بێ‌سرەوتتا
وەك کوڕی خۆت
دەس بەقژی بژما بێنی‌و
شهرزەییم ڕابژەنی .
منیش لە سەرخۆو بە چرپە
ئاخ‌و داخی
شیعری خۆمت بۆ هەڵڕێژم
لە قوڵایی‌و نسێی سنگتا
گرەی هەناسەم بنێژم .
تۆ نەبی چۆن من ئەم ژەنگی بێزاری‌یە
کە سەعاتی ژینی گرتووم . لێم بێتەوە ؟ !
هەر تۆی تەنیا لەم بەستێنە خامۆشەدا
ئەی هاودەمە شیرینەکەم !
من دڵم پێت بکرێتەوە .

* * *

لەبەر دەممای چاوم لێتە
وەك لەسەرلا ڕاکشابی
دەستێکت وا لە ژێر سەرتاو
ئانیشکت خستۆتە سەر لم .
شەپۆلی نیگات پرشە پرش
تیشکێکی زەرد ئەدەن لەمن .
منیش لەسێبەری کری
دار هەنجیری گەلا پانا
کە هەتاوی تین تیا نەماو
بە بێ دزکێ بە باڵایدا هەڵ ئەزنێ ..
ئینجا وەك سەرەتاتکێ
لە ناو پەنجەرەی چلانا
ناو بە ناوێ
دەرئەکەوێ‌و دەرناکەوێ
من لەوێدا بەچوارمشقی دانیشتوم‌و
خەیاڵیشم وردە وردە
وەك خۆری ئێستەی باکوورت
پشکۆ ئاسا
لە ناو تۆدا نوقم ئەبێ .

* * *

دوور لە یاران
دوور لە وڵاتی گوڵ عومەر
ڕۆژانی ڕەنگ خۆڵەمێشیم تێ ئەپەڕن
پەرت پەرت وەکوو دووکەڵی سەر
ماڵانی دێی لای ئێواران .
پەستی‌ی وەکوو قەوزەیەکی
مەلاسی لینج
گیانی گرتووم .
ئازارێکی گرنج .. گرنج
وەك گرنجی‌ی بەژنی ڕەقەڵەی دارخورما
دڵنیاییم ئەپوشێنێ‌و
چرۆی هەستم زامدار ئەکا .
گەلێ خەونم
وەکوو ماسی‌ی لە ئاوکراو
هێشتا چاویان زەقەیان دێ‌و
بەلام خنکاو .
ئەم ڕۆژانە وەکوو ژاڵە
لەناو زاری عومری مندا
تامیان تاڵە .
بەلام ئەی ئازیزانی دوور !
ئەی هاوەڵە شیرینەکان !
لە هەر کوێ هەن .
یادتان وەکوو سێبەرەکەم
لە گەڵمایە
نامەو وێنەی ڕەنگاو ڕەنگتان
لەناو گیرفانی دڵمایە
خۆشەویستی‌و تاسەی دیداری ونبووتان
دیوانی شیعری تازەمەو
لەناو دەفتەری ناخمایە .

* * *

شەوباش ! شەوباش !
تۆ شەوکوێرنیت
ئەی دایکی نامۆیی‌و سەفەر
ئەی هاوڕێ
ئەی فوراتی بەناو تاریکیا ڕاکەر .
گەرچی ئێستاکە تەماشام
وەکوو مەلێکی باڵ شکاو
ناگاتە لات
تا مل هەڵسوێ لەژێر چەنەو
ماچت بکات .
بەلام هاژەت وەکوو دەنگی
مێژووی بە سام
وەك دەنگدانەوەی دەربەندی
کێی لەبەر شەوقی مانگە شەودا سەرسام
زوڵاڵ .. زوڵاڵ
ئەگاتە لام
ئەی هاوڕێی قەت نەنووستوو
من خەوم دێ‌و
ئەچمەوە لای ماڵی چۆڵ‌و
ژووری تەنیای هەناسە سارد
تا سبەینێ لەم ئاستەدا
بە یەکتری ئەگەینەوە
ئەی هاودەمی تاق‌و تەنیای
غەریبی‌ی من
شەوێکی شاد !

ئەم هەڵبەستەی خوارەوە یەکەم هەڵبەستمە کە لە ساڵی 1952 دا دامناوە ئەوا بۆ «کاروان»ی بەڕێزی دەنێرم وەکو یادگار .

(بێبەش)

# پەیمانی پەیمان شکێن

بێبەش 1952

چ پەیمانێکە ئەم پەیمان شکێنە
بەخوێنی جەرگی من پەنجەی بەخوێنە
سەری شێواندووم ماوم بەبێ سەر
دڵی بردم خودا ئەم دڵ ڕفێنە
لە عومرا سێزدە یا چواردە ئەمەندە
جوانی وام نەدیوە نیتی وێنە
دەمێک بوو جار بەجار ماچی ئەدامێ
دەشیکو مەستی بێ مەی چاو هەڵێنە
کەچاوم هەڵدەهێنا من بەجارێ
زیادە مەست ئەبووم ئەمکرد وڕێنە
کەچی ئێستاکە ئەمکاتێ ئەڵێ پێم
نەما مووچەت لەماچم مەمدوێنە
ئەوا ماوەک دەبێ ماوم بەبێ ماچ
منی (بێبەش) وەرە حاڵم ببینە

# ئەمن و تۆ

کاکە زیاد لادێیی

هاوڕێکانم : وەك باڵندەیەکی بریندار هەڵکوڕما بووم ،
کەچی سوورکە بەردی مامە خەمە بێ سەنگەر بووم ،
ویزەی دەنگی گوللەیەك بووم ،
نەدەبیسترام ....
نەدەبینرام ....
بەلام وەکو خڕکە بەردێك ،
لۆ سوانی داسی دەستی جوتیارەکان !
وەك پیمەرە ... وەك پیرشەقان
لۆ ناولەبی هەڵقلیشاوی ، هەرزەکارەکان ..
کیژۆڵەی دامەن شۆڕو بەئەنگوچك
بەتاسەوە داگیر دەکرام ....

* * *

ئەمن و تۆ : وەك کاو دەغڵی ورد کراو ،
تێکەڵ یەك بووین ...
بوك و زاواش : لۆیەکەم شەو ،
وەك دەستکەنەی گوڵە گەنم ،
وەك نەرمەگیاو نێرگزو کەنێرەی لەکوێستان ...
وەك بارگەو بارگە خانەی ڕەوەندەکان ،
وەکو شەغرە ،
بەسەر پشتی ئەسپی پەیدەست شەتەك کران
دووهەمین شەو : کەئێوارە بەسەر داهات ،
دوگمەو پولەکەی سەر سینگی بووکی بێناز
لێك ترازان ...
بەلام من و تۆ قەت و قەت لێك نەترازاین

د . بدرخان سندي

# هەرسێ لێدانێت دلێ من ...

(لێدانا ئێکێ)

من گوتە بچویکەکێ ساڤا
بکەنە ...
گری
بکەگری
کەنی
کەتم هزرا
ئەڤە من چ گوت
ئووی چ کر
دیارە بچویکە .. لەوا
بچویکێن ئەڤان مەژی خاڤا
لێ کەڤوکەك ژ دویر
ژ هنداڤا
خواند .. ستراند .. گوت
شاعرو
هزرێت خونەکە
ئەو راستە
کەنی یا بفەرمان بت
گری یە
گری یا بێفەرمان بت
کەنی یە
دورستە بچویکێ ساڤا
چاڤ روهنە
مەژی تەرە

هێشتا بێ پاکە
بچویکێ ساڤا

(لێدانا دووێ)

من گوتە سویارەکی
پەیا نەبە
را نەوەستە
من هیڤی ژ تە هەیە
نە وەستە
ڤان دو قەسێت من
بکەهینە دلبەرامن
دلبەر سلە
سلە ژمن
سویارو دزانم
تو و هەسب دێ تێهنی بن
رێ دویرە ..
ئەفرازی و نشیڤن
هەسب کەنی
گوت :
ئەڤە ستوییێ من
بلا سویار ڤەخوتن
گەر تێهنی بی
خوینامن
دلخوشبە .. کاغەزاتە
دێ گەهت

گەر ئەز و سویار نەگەهشتین
دلبەراتە ..
دێ هەردو قەسێتە
خوینتن
لسەر کەڤلێ من
لسەر زینا گرێدای
سەر پشتا جانیکامن

(لێدانا سییێ)

من گوتە بیرەمێرەکێ
پیرنەبە
راوستە
من هیڤی ژ تە هەیە
نەمرە
تژی دەستێ ئەڤیا
ئونەڤی چرکا
نێرگزن
دونیا ژنێرگزا
مشتە
ها .. ها دێ هێت
ببینە .. بەرێ چوناخو
ببینە کاکلا ژیناخو
گوت .. مامو
من ژ مێژە وێ دیتی
من خەونەك وێ دیتی
سالەك دێ هێت
ناڤێ جیهانامە دێبتە ..
نێرگز
پەیڤێن ئەزمانێ مە دێ بنە ..
نێرگز
نڤێژاخو ئەم دێکین ..
لێ لسەر شەملکەکاپر
نێرگز

# تەمەنێك چاوەنواڕی

جەلال مەدحەت خۆشناو
هەولێر 1984/3/11

(1)

شیرینەکەم ...
چاوم شلبوو .. هەر نەهاتی
دیارە ، یارە ، تۆش وەکو من
بە کوێرایی چاوی دوژمن
هەر گیرۆدەی سات و کاتی !
ئای دەتزانی چەند بەربادم
لە ئەشقی شەم چی فەرهادم
نە ڕۆژم ڕۆژ ، نە شەوم شەو
نە دەچێتە چاوانم خەو
وای دەتزانی چەند دڵدارم
چەند دەردەدار و زامدارم
برینی تەشەنەی کولم
پەریوەتە پەردەی دڵم
لە بۆ سارێژی ئەو دەردەم
هانام بردە بەر زانستی
لە بۆ دۆزینەوەی ڕاستی
پزیشك و دەرمانی ئیمرۆ
چارەی نەکرد !
ئای دەزگیران
پەنام بردە چاك و پیران
بۆ ئەو مرازەی کە تۆی ... تۆ
چارەی نەکرد !
هەر ژێردەستی ئەو چەپگەردەم !

(2)

شیرینەکەم ...
دەڵێن بۆ عادزی توتن
کەچی جگەرە کێشانم
سیپەلکی کردوومە ئەنجن
هەر لە دەردەکەی پێشانم
تا درەنگی شەو لەگەڵ رادیۆ
خەریکی ئێستگە و شەپۆلم
هەزاران بیستوون دەکۆڵم
بە ئومێدی باسێکی تۆ
شەو خەونی سامناك دەبینم
درەختی بێبەر دەچینم
کەچی ئەنجام ...
هەر درۆیە و کراوە بە بووك
هەر پەیامە و گفتی چرووك
هەر بەڵێنە و دەفرۆشرێ سووك
منی دڵدار لە ڕاستەوخۆ
کەوتوومە داوی هەشت و نۆ
نازانم نێچیری کام لام
ماومەتەوە دڵگیر ، سەرسام !

(3)

شیرینەکەم ...
لە گەڵ زرینگەی هەر تەلەفۆن
دائەچڵەکێم ... تۆبڵێ چۆن ؟
ئەڵێم بەڵکوو
سۆراخێکی تۆیە لە ڕوو
ئای دەزگیران
کەی دێیتە ژووان ؟ !

(4)

شیرینەکەم ...
هاوین ڕۆیشت ، دیار نەبووی
پایز ڕۆیشت ، بەتەنیا چووی
لەگەڵ کاروانا نەت بردم
زستان بەسەر چووە لە زووی
تۆیە بەفرت تێ نە گرتم !
وابەهار هات
نەورۆزە پێشوازی بۆ لات
چاوم شلبوو ... توخوا وەرە
ئەو دەردەی دڵم لابەرە
چی نەبێ وەك هەوری ئەمساڵ
بەبێ باران
بەسەر خاکم وەرەو بڕۆ
هەر خۆشە دیتنی یاران
تابکەومەوە گرو گاڵ ،
بنووشتێمەوە سەر ئەژنۆ
لە پەرستگای چاوانی تۆ !

(٥)

شیرینەکەم ...
چاوم شلبوو .. لە چاوەڕێ
ئاخۆ کەنگی یاری من دێ
چەندەم چاو گرتووتە گەزەنگ
تیشك و ئاسۆ
ئەلێم بەلکوو برژانگی تۆ
چەشنی خەدەنگ
بێتە ناو جەژن و نەورۆزم
بڕواتە سەیرانی هۆزم !

(٦)

شیرینەکەم ....
چاو ئەبڕمە مانگی شەوێ
تا باسێکی تۆم دەستکەوێ
ئەلێم بەلکو گفتی «بێکەس»
سۆراخێکتم بنێتە دەس
بێ ئەزانم
هەموو کۆستەکانی پێشووت
نالەبارن ، سەنگەبارن
ئاخۆ کارەساتی لە ڕووت
چ سەربارن !
چ هێرشی لە شکری خەم
دێتە سەر باخ و ڕەزانم
چەند ساویلکەم ،
چەند زۆرزانێکی نەزانم !

(٧)

شیرینەکەم ...
چاوم شلبوو ... کەی ڕێ ئەکەی
کەی وەکو میوە پێ ئەگەی !
چوومە ناو هاژەو خورەی ئاو
چوومە ناو ڕوناکیی هەتاو
بۆ هەوالێك تۆی تیا ڕوابیت
یا ئازادی تۆی لەدوا بیت
توخوا وەرە
دلەی دیاریم بۆ خۆت بەرە
ئەگەر بە خۆشت پێت ناکرێ
دەرفەتی ژووانت پێ نادرێ
هەوالێکی خۆت بنێرە
موژدەییکم پێ ڕاسپێرە
های هوو شیرین
کەی دێتە لای یاری ئەوین !

(٨)

شیرینەکەم ...
چاوم شلبوو ... ئێستای بەهار
دلزارە بەبێ بەزمی یار
حاجی لەقلەق «لە گوێی چەما»
وا کەوتووتە بەزم و سەما
گول لەگەل هەنگ
بە چرپەو دەنگ
بە ڕاموسانی ڕەنگاو ڕەنگ
چۆلەکەو مەل
شەهین و قەل
چەند هێلانەیان بەستووە
چەند ئاهەنگیان هەلخستووە
تۆ هێلانەت بۆ من نەبەست
تۆ دەستێکت نەدامە دەست
تۆ ماچێکت لە ڕووم نەگەست !

(٩)

شیرینەکەم ...
پەرەسێلکەکانی کۆچبار
هاتن بەرەو هەواری پار
ڕیزیان لەسەر تەلی ڕێگا
چەندە ڕێکە
کرداریان بۆ هێلانەو جێگا
نەخشەی کۆنیانە دەمێکە
کوا ڕیزی تۆ ؟
کوا دیاری یاری زیزی تۆ ؟
کوا جێگەی تۆ ؟
کوا ڕێگەی تۆ ؟
وادیارە تۆش ، وەکو قەرەج
کەوتویتە مەیدانی هەرەج
هەر وەرزێکت : هەوارێکە
هەر خەوێکت : دەوارێکە !

(١٠)

شیرینەکەم ....
کە بەهار دێ
تیشکی خۆری نوێ هەلدێ
پشکۆ دەکەونە گڕوکال
وەکو مندال
ئەچمە ناو نەهێنی ژیان
بۆ تەماشای ڕازی گیان
ئەلێم بەلکوو
ئەوەی چوو ... چوو
سەر لەنوێ
ئەتۆی پشکۆ تازە دەڕوێ
بەلام گیانە
کاروان کوژەی ئەم تابانە
سەری لەمن شێواندووە
بەختی منی پەڕاندووە
دوازدە کەلوو
ئاواتی من ناخەنە ڕوو
ڕیسم بوەتە هیشکەگرێ
هەتا کۆلکی داری ژینم
لەم بەهارەدا دەبینم
کوارگ ناگرێ !

(١١)

بۆیێ گیانە ....

هەر ئاخەو دەڕژێتە پەرداخ
هەر هەنسکەو هەڵدێ لە ناخ
هەر گوڵەو ئەچنێ لە نێوباخ
هەر کەپکەو ئەروخێ لە شاخ
هەر چاوە فرمێسک دەڕژی
هەر ئاواتە : دەمری‌و دەژی
دەڵێی قەلبەزەی سەر چاوە
وێنەی گریەی چاوی منە !
دەڵێی ئەو کۆستەی بۆم ماوە
تراجیدیای ڕاوی منە !
لەسەر ئەوەش من کۆڵ نادەم
جۆلانەی سستی هەڵناخەم
لە چاوە نواریم هەتا دێی
هەستی شەشەم دەڵێ : لە ڕێی !

(12)

شیرینەکەم ....
گۆرانی حەزەکەی گەورەم
دەهۆڵ‌و زوڕنای ئەم دەورەم
مێژووی هەبوون و نەبوونم
لە نەوارەکەی دەروونم ،
تۆمارکراوە
لە جێی تەقەت هەڵواسراوە
کەی دێتە دەر ؟
کەی دێتە بەر ؟
کەی لێدەدرێ ، کەی دەکوترێ ؟
کەی هەڵپەرکێی لەبەر دەکرێ ؟ !
ئای کە شایی ئەم دەورانە
ساردو سڕە !
ڕەشبەڵەکی ئەم سەیرانە
جەرگ بڕە !
چونکە بانگی هەی دۆ هەی دۆی
بە تاو نی‌یە !
چونکە خرمەی گۆبەرەی تۆی
لەناو نی‌یە !

(13)

شیرینەکەم ....
چاوم شل‌بوو .. داخی گران
دەبێ وەکو پەری دەریا
ڕۆژێك لەم خاکە سەر هەڵدەی
دڵەم لە تۆزو خۆڵ وەردەی !
خۆزگەم ، بریا
دەبێ وەکو بۆمە لەرزە
جارێك دڵەم بخەیتە لەرزە !
نابێ جارێك وەك سەرچاوە
بێیتە دڵەی ئەم خۆشناوە
چەشنی گڕکان
بتەقیەوە لە کوردستان !
چاوم شل‌بوو .. ئای دەزگیران
کەی دێیتە ژووان ؟ !!!

* *

بەربلا : شر
برین : زام
هانا : پەنا : دمخالەت
خەون : خەو : حلم
چاندن : ڕواندن
ئەژنۆ : چۆك
کۆست : مصیبە
سلویلکە : نەفلم : عفوی
زیز : زوێر
کەلو : برج
کۆلك : پاشملوەی داری‌براو ، کۆتەرە
کوارك : قالچك : فطر
کەپك : پارچە شاخێك لووتکە پێك بێنێ
تراجیدیا : ماسلوی
جۆلانە : حێلانە : ارجوحە
هەستی شەشەم : الحاسە السادسە
نەوار : شریط کاسیت
تەقەت : شاردراوەو عاصێ
دۆ : مەبەست کچی ناو شایی رەشبەڵەکە
پەری دەریا : حوریە البحر
دەوار : ڕەشماڵ : کوین

## تۆ لووتکەی هەڵگوردی

چاوەکانت ڕووبارێکی
بێ سەرووشوێنی ئەم خاکەن
سەرچاوەیان لەدڵمایە ..
دووچۆلەکەی پاسارین‌و
لەسەرلقی درەختی گیانم وەستاون
هێلانەیان لەگیانمایە .. لەخوێنمایە
تۆ لووتکەکانی هەڵگوردی‌و
منیش ئاسمانی سەربەتەم ..
ئاگات لێبێ
لەشەوانی ، کرێوەدا
نەتسوتێنێ ئاهو نزولەو هەناسەم

محمد کەساس

کارێزە / 1983/11/7

# پێنجوێنی جوان..!

● حەمەئەمین پێنجوێنی ●

**مێروله**
کە شارەکەی ئەشێوێنی
کفر ئەکاو ئەویزێنێ ...
**چۆلەکە**
کە هێلانەی لێ تێك ئەدەی
بەگژ داروبەرددا ئەچێو
گەر بوی بکرێ ...
بە دەنووك چاوت کوێر ئەکاو
بە ترپەی باڵ ئەت ترسێنێ ..

**ئاسك**
کە «کەورگی» ئەروخێنی ...
وەختە بە شاخی نوك تیژی
ورگت بدرێو بت تۆقێنێ ...
**هەنگیش**
کە هەنگوینەکەی «ئەبرێ»
پێتەوە ئەداو ؛
کسپەو چزەت لێوە دێنێ ...
کە ئەزانێ ئیتر ئەمرێ !
**ساوا**
گەر بێشکەی لار بکەی ...
گفەو بفە وەدەم دێنێ ... !
**ئێمەی مرۆڤ**
دەسە پاچە هەناسە سەرد
پێچانەوەی ڤینی پیرۆز
بۆ تویشوی هەرد !
بۆ ڕێگای تۆف ... !
**ئێمەی مرۆڤ**
شارەکەیان کاول کردین ..
تەختو تاراجیان تێك ڕمان ؛
بۆ «ساجی عەلیان» بردین .. !
بوینە «پەندی» ئاخر زەمان ... !
دەسە پاچە ..
**بە تاوسان**
سەرچاوەی کانیەکان کوێربوون .
پێنجوێنەکەش سەرەو ژێربوون .
**بەزستان**
چاڵە بەفرەکان
نارنجۆکو پۆستاڵیان شاردوتەوە ؛
لەجێی بەفر ... !
جۆگەلەی ئاگر دەبەستن ؛
لەجێی باران لەجێی هەور ... !
**گرەویان**
لە «هۆلاکۆ» بردوتەوە ...
نارنجۆکیان شاردوتەوە .
**درەختەکان**
لارەملن وەکو هەتیو ..
سەوزەگیاو گوڵیان گشت سووتان ،
گاردی ئەودیو ؛ گاردی ئەودیو ... !
**لوتکەی**
«شەوەقەت» و «کەژان» ؛
دۆش داماون ..
دڵیان پڕە لە ڕقو ژان ،
هەتا ماون ... !
شاری پێنجوێنی «شوێنەوار» ... !
خەڵکی ئاوارەو هەژار .
**ئەڕوێنەوە**
بۆ «سەرکۆشکو» بۆ «بلکیان»
با سەردەمێ تاڵبێت ژیان
با زەمانێ تاڵبێت ژیان

# ب کەنە یار

غازی ئاکرەیی

ب گرنژە
تو ب کەنە
دلو هناف
هەر بو تەنە
وەرگرە ب تلێن خەنە
با دیاری بن
ئەو بو تەنە

کو گاڤەکێ ، تە نەبینم
ئەوی ڕوژێ
بەرگ شینم
زەڤیو شوڤا د هەلقینم
توڤێ ڤینێ
دێ لێ چینم
دویژیرم ، خاکا دلی
ژین سها
دارێن چلی
بو پەرییا
بسک گولی
دا هەرگاڤ ، ئەو ب خەملی

* ● *

**هیڤی و داخاز**

جان کولیکا مێرگو گرا
من خاست ئەو ژی باب و برا
چاڤ من لێبوو ڕوناهی ێ
وان ئەز سوتم ب ئاگرا
*
ئەو بەرزە کر تاریستانا
دور لێگرتن ب پەرجانا
کانێ ڕوژێن زاڤاهی ێ
برەڤینم کولو ژانا
*
تو هیڤی یا ناڤ کوڤانێ
ڕوناهی بوی ژبو مانێ
بومە هەرواکەن شاهی ێ
ئەو ڕێبەرە بو ڤیانێ
*
چاڤەرێ بووم ئەز چەند سالا
بو نارینا دولو پالا
هەر ئەو تیشکا ئاساهی ێ
جانتر ژ نێرگزا چالا

# لاوچاك

حەسەن جاف

کەرکوك

1980/7/27

که له جاده قیرەکه لا دەدەیت ، بە لای چەپدا تووله ڕێگایێکی پێچاو پێچ هەنگاوەکانت هەڵدەگرێ تا دەتگەیێنێتە سەر یاڵەکه ، ئەو ڕێیە بە هاوینان خۆڵو ووردە بەردی هەمە ڕەنگ سەرسنگی نەخشاندوەو دەنگی خرمەو جیرەییکی سەیر بۆ پێشوازیی ڕێبوارەکان ساز دەدەن ، شەوانیش لەگەڵ حەپەی سەگو قیرەی بۆقی ناو چەمەکە تێکەڵ یەکدی دەبنو سیمفۆنیای دونیای ڕێبوارانی گوندەکەمان پێك دەهێنین . بەلام بە زستان دەبنە کانگەی شەکەتیو ئازارو بەتەواوی لە شارمان دادەبڕنو قوڕو لیتەکەیان وەك بنێشت تایەی ترومبێلەکان بەزەویەوە دەنووسێنین .

که دەگەیتە سەر یاڵەکە گوندەکەمان وەك پەرییەك تازە لە حەمام هاتبێتە دەر هەموو جوانیەکەیت بۆ دەردەخا . بە لاپاڵ شاخەکەدا ماڵەکان بەرووی ئاسماندا قوت بوونەتەوە و لەبەردەمیشیانا دەشتاییەکی خنجیلانە سەوز دەنوێنێو بەهاران لە هەر لاییکەوە تێی بڕوانی سوور دەکاتەوەو گوڵاڵە سوورە بەجارێ دایدەپۆشێ .

بەو بەرمانەوە گردێك ملی قوت کردوەتەوەو لە ژێر سێبەری دار توویێکدا ڕاکشاوە . جاران کە منداڵ بووین دەچووینە سەر گردەکە بۆ توو کۆ کردنەوەو پیاوانی گوندیش دوای ماندووبونێکی زۆری ڕۆژ ، عەسران ڕوویان تێدەکردو هەواری دەمەتەقێو کات بردنە سەریان بوو . ئیستاش ئەو ڕۆژەم لە بیر ماوە کە تۆ هاتیتو بە چاوی ئەوسا دەتبینم ، نەماندەزانی کێیتو لەکوێوە هاتوویت ! هەموو یەکێك لە ئێمە بەچاوی گومانەوە تەماشای دەکردیت ، ناهەقیشمان نەبوو ، لاوێکی نەدیوو نەناسیوی وەك تۆ چیی لەم گوندەی ئێمە دەوێ .. ؟

گوندی چی ! مەگەر تەنها لە ڕووی ئەمەگەوە وامان گوتبا ، دەنا کۆمەڵێك دارو پەردووی بەسەر یەکدا تەپیوی بێ دەغڵو سەوزایی چۆن بە گوند دادەنرێ ، ڕەهێڵەو ڕەشەبای ڕكو کینەو زەبری ڕۆژگار وای بەسەر هێنابو نە باعەی مەڕ ، نە قووقەی مریشکت گوێ لێ نەدەبوو ، مارو دوپشك لە جێی ئەوان بە خوێنی ئێمە دەلەوەڕان ، وەشتە سەوزو سوورەکەمان بۆرێکی ناشیرینی دەنواند ، هەر بەجێشمان نە دەهێشت ، دەمانویست بە موعجیزەیەك ببێتەوە بە بووکە ڕازاوەکەی جاران . هەموو بەیانیەك خۆر لەو دیو چیاکانەوە سەری دەردەهێناو تیشکە زێڕینەکەی هێدی هێدی بەناو کووچەو کۆڵانەکانی گوندەکەماندا بڵاو دەکردەوەو کەسیش بەدەم بانگەوازەکەیەوە نەدەچوو تا تیشکەکەی تەواو نەیانیبرژاندبا هەڵنەدەستان . لەگەڵ تەمەڵیدا ببوونە هاودەمو هاوڕاز ، شەوان دوای نوێژی خەوتنان لە مزگەوتدا کۆ دەبوونەوەو بەدەم مژ لێدانی جگەرەوە دەکەوتنە دەریای ئەندیشەی ڕابووردویەکی دوورەوە ، یادی ئەو ڕۆژانەیان دەکردەوە کە گوندەکەمان کانگەی پیتو بەرەکەت بوو ، مەڕو ماڵاتو ڕەشە وولاخێکی زۆر ، دەشتە زێڕینەکەی لە ژێر دەغڵدا نقەی دەهات ، ئەوەندەی لەوەڕ زۆر بوو بەهاران لە ناوچەکانی دیکەوە ڕانە مەڕیان وەپێش خۆیان دەداو بۆ لامان دەهاتن .

کە تۆ هاتیت لە ڕابووردویەکی دوور زیاتر هیچمان بەدەستەوە نەمابوو ، کوللە ڕەشە لاسکی گەنمی بە پێوە نەهێشتبوو ، بێ بارانیو ڕەشەبای ڕۆژگار ئەوەندەی دیکە

کوێستەکەیان گران کرد ، کەس نەیدەزانی چۆن پەیدا بوویت ، دەڵێن چەن کەسانێکی کەم دەیانزانی‌و ئەوانیش ڕازەکەیـان لای کەس نەدەدرکاند .

ئیستاش لەبەر چـاومن ، رانك‌و چـۆغەیێکی سـوپاتت لەبەردابوو ، بالآ بەرز دەتگوت سووره چنارەکانی گوێ چەمی گوندەکەمانی ، رەنگت لە گوڵە گەنمەکانی بەر گەرمـەسێری گەرمیانی دەکرد ، چاوەکانت بە قەدەر ئاسمانی گوندەکەمان شین‌و درەوشەداربوو ، لە ژێر جەمەدانیە گوڵنگەدارەکەتەوە تاڵە قژی زەرد سەری دەرهێنابوو وەك پەلکە زێڕینـەی دوای باران .

ئەو ڕۆژەم لە بیر ناچێ کە ئێمـەت کۆکـردەوە ، هانت دەداین دەست لە تـەمەڵی‌و خـۆخۆیی هـەڵبگـرین ، فێـری هاوکاری‌و کۆمەکت دەکردین .

- دەتانەوێ گوندەکەتان وەکو گوندەکانی دیکەی ئەم سەر زەمینە بێت ، دەبێ یەك دەست‌و یەك دڵ بن ، دەبێ دەس لە تەمەڵی‌و خۆپەرستی هەڵبگرن .

چەن کەسانێکی کەم بـڕوایان پێت هـەبوو ، زۆربـەی زۆریان پێیان دەگوتیت :

- ئـەمە هـاندراوە ژیـانمان لێ تێـك بـدات‌و داب‌و نـەریتی دێرینمان بشێـوێنێ ، ئەمـە فێڵبازە بـۆ گیرفـان پڕ کـردن وا دەکات . کە ئەو قسانەت پێ دەگەیشتەوە ، زەردەخەنـەیەك تابلۆیێکی غەمگینی لە سەر لێوەکانت دەنەخشاند

- لێیان گەڕێن دوا ڕۆژ هەڵەی خۆیانیان بۆ دەردەکەوێ . بە تەنها خۆت‌و ئەو چەن کەسە کەمەی لەگەڵتدا بوون دەستتان پێکرد ، چاوەڕێی کـەستان نـەکرد ، دەروونت ئـەوەندەی بەفری سەر دوندی شاخەکان سپی‌و بێگەرد بوو ، هەمـووت خۆش دەویستن‌و هەر بەتەمایان بوویت . بێ باری‌و کۆسپ‌و تەگەرەکانیان لە ڕێیان لا نەدەدایت . جارێکیان رك‌و کینەیان لە دوو فیشەکی گەمژەدا خۆی نواندو خوێنە گەشەکـەت کە تێکەڵ خاکە زێڕینەکەی گوندەکەمان بوو تابلۆیێکی هەمیشەیی رەشکـوژ کردنی ئـاواتەکـانی گونـدەکەمـانی لە دەروونمـدا نەخشاند .. هەستایتەوە خەونە سەوزەکانت لە گوڵەی گەمژە سەوزترو رەنگ داکوتاوتر بوو ، دەتزانی کێ بووو لە رووشت نەدەدا .

- ڕۆژگار ترسناکیی ئەو هەڵدێرەیان بۆ دەسەلمێنێ کەپەیدا دەڕۆن ، هاکا گلان ، ئەوسا دەبێ ئامادە بین دەست بـدەینە باڵیان .

ئێی .. لاوە گیان ، ئەم گوندەی ئێمە بۆ ئـەوەندە بێ ئەمەگە . چەندم پێ گوتی دەبێ لە ناوەوەی ماڵی خـۆمانـەوە دەست پێ بکـەین ، گونـدەکـەمـان لە سـەگی نهێنکـر پـاك بکەینەوە . دەستت دەخستە سەرشانم‌و دەتگوت .

- لە هەمووکات‌و شوێنێکدا هەر سەگ بە مانگەشەو وەڕیوەو ئەویش لە بەخشینی تیشکە زیوینەکەی نەکەوتوە .

ئەوان لە ژێر سێبەری دار تووەکەدا دادەنیشتن‌و چاوی رك‌و کینەیان تێدەبڕیت ، گاڵتەیان بە ئارەقەی ناوچەوانت دەهات ، بێزیان لە دەست‌و قاچە قلیشاوەکانت دەهاتەوە ، لە ڕو لاواز بیوویت ، کە تەماشام دەکردی دەروونم پشکۆی پێدا دەچزا ، کە هاتیت کەی وابویت ، وەك تابلۆیێکی بێ هاوتای ئەم ژینـە بوویت .

تۆ خەریك بوویت‌و ئەوانیش ژەهریـان هەڵدەمـژی‌و ئاگـریان دەدایەوە

- لەناوی نەبەین جێمان پێ لەق دەکات‌و ڕەنجمان بە با دا دەدات .

ئیستا کە تەماشات دەکەم ، زەردەخەنەکەی سەر لێوت وشك هەڵاتوەو سنگە پان‌و پڕ ئەڤینەکەت کون کون بووەو خوێن بە هەردوو لایدا ڕێچکەی بەستوە تا سەر زەویە سەوزەکە ، کە تەماشای گوندەکەمان دەکەم ، بووتەوە بەو بووکـە ڕازاوەی خەونت پێوە دەبینی‌و تۆش لە میهرەجانی ئەو ڕەنگ‌و جوانیەدا ڕاکشاویت‌و چاوە شینەکانت لێك ناوە ئاگر بـە دەماروەکانمدا گوزەر دەکات .

کاکە لاوە .. بۆ دەبێ هەموو جارێ ئەم چیرۆکە دووبارە ببێتەوەو بەدەستی خۆمان خەونە سەوزەکانمان بنێژین‌و بنەو بارگەمان کۆبکەینەوەو ڕووەو ئاسۆی نائومێدی مل بنێین .

- کۆڵ نەدەن ، منیش نەمێنم ئێوە هەر بەردەوام بن .

کە لە سەر باڵەکەوە دەڕوانیتە گوندەکەمان ، ماڵەکان بە لاپاڵ شاخەکەدا بەڕووی ئاسمانا قوت بوونـەتەوەو دەشتـە زێڕینەکەش سەوز دەنوێنێ ، کە ئاوڕ لە گردەکەی بەرانبـەر بدەیتەوە دار تووەکە دەبینی چڵەکانی شۆڕ کردوەتەوەو لەگەڵ گوڵاڵە سوورەو نێرگزەکاندا گۆڕێکیان لە ئامێز گرتوەو سێبەری بۆدەکەن .




ئودا سوبە تێدا بڕ زەلام بو ... هیرو رابو سەرچکێ خوو گۆت :ـ

ـ كەلی برادەرا ، ئەڤ شەڤە ژی دا دەست پێبكەن ، بێ ژمن بلا بهێتە ڤێ قامێ .. هەڤالێت خدروی ژی ، بلا بهنە قاما دی یا سوبێ .

لگەل دویماهیا ڤان ئاخفتنا ، هندەك زەلام بلندبوون و هندەك روینشتن خار .. خدروی دەستێ خو ل ملێ هیروی داو گۆت :ـ

ـ مام هیرو .. بلا ئەڤ شەڤە نزار بهێتە ژ مە .

ـ خالێ خدر ، هەڤالێت تە بلا ژ تە بن و هەڤالێت مە ژی ، بلا هەر لگەل مە بن .. بلا وەك هەرشەڤ بیت .. هەر ئێك و هەڤالێت خو .. ما نە وەسانە نزار ؟ !

ـ تە ئاخفتنەكا د جهێ خو دا گۆت .. ڤێجا ما ئەز دێ چ بێژم .

هیروی ئاخفتنا وی ڤەبڕی و گۆت :ـ

ـ بەرێ خوبدێ ، یا ب دلێ وی ژی نینە بهێت گەل وە ، ڤێجا بلا هەر لگەل مە بیت ... هەكە بێ دلی خو هاتە ژ وە ، ما دێ بو وە چ كەت ؟

ـ دێ بلا هەر لگەل وە بیت ... بەلێ پشتی ئەم دەست ب گوستیرانێ د كەن ، بێت تێن .. بنێڤی ، ئێك لگەل مە ، ئێك لگەل وە .

ـ نە .. نە .. پشتی ئەم دەست پێ د كەن .. چ پێ بهێت بلا لگەل وە بیت .

ـ مامێ هیرو وە نە بێژەو خو بێ منەت نە كە .. مە گۆت دێ بنێڤی بن .

ـ قەیدی نا كەت .. بەس هەكە كوڕێ پوشی رەشێ هات ، مە بخو نەڤێت ، بلا ئێكسەر بهێت ژ وە .

ـ مامێ هیرو وەك وە ، مە ژی كوڕێ پوشی رەشێ نەڤێت .. بەلێ چ بكەن ، نا بیت پشتا خو بدەنێ .. نەكە ...

ـ ئەرێ .. نەكە ئەم ژبەر دەڤی دەیكا وی قورتال نابین . هنكی زەلامێت د ئودێ ڤە بونە دو جووین .. هەر جوینەكێ لقامەكا سوبێ جهێت خو خوش كرن .

نزاری گازی كابانیا خو كر ، دا مێزەركەكێ بینت .. دا بكرن هەكو گوستیركێ دگێڕن .. هەكو مێزەرك ئینای .. هیروی گازی جەمبەلی كر ، دا خەلەكا زێڕی ژ تلا دەستێ راستێ بكەت .

جەمبەلی بدەستێ چەپێ خەلكا زێڕی ژ تلا دەستێ راستێ كرو گۆت :ـ

ـ هەرشەڤ هنكێ ، لسەر خەلەكا دەستێ من ، گوستیرانێ دكەن .. بلا شەڤەكێ بگوستیركا ئێكێ دی بیت . هیروی بەرسڤا وی دا ...

ـ تو بخو دزانی ، كەس ژ مە وەك وی گوستیركا د دەستێ تە دا نینە .. تا چو فندو فێل نەبن .. ئەم خەلەكا د دەستێ تە دا هەل دبژێرن .. ما وە نە دیت .. زستانا پار .. هەكو مە گوستیرانێ دكر چ ب سەرێ مە هات .. خەلەكا مە گوستیرانێ

پێ دکر .. خەلەکا کوڕێ پوشی دەشێ ژی وەك وێ بو ... هەردو خەلەك د دەستێت خو دا د گێراندن و هەر شەڤ ژ مە د بر .

نزاری مێزەرك دانا سەر چوکێت خوو بەرسڤا مامێ پیرو دا ...

- بخودێ مامێ پیرو .. تە ئەو تشت ئەشکەرا کر .. هەکە تو نە نەبایە .. د بو هەر وان ژ مە بربا . جەمبەلی ما د نزاری فوکری و خەلەك هاڤێتە بەر مامێ پیرو ... پیروی خەلەك کرە د دەستێ خودا ، پاشی هەر دو دەستێت خو دانانە سەر ئێك و شلقاندن و برنە پشت خو .. پشتی هەر دو دەستێت خو مچاندین ، ئینان درێژ کرنە بەر خو .. گوتە خدروی :-

- بخو ئێکی بخازە .

خدرو ما بەرێ خو دا هەر دو چاڤێت پیروی .. پیروی ستێرا چاڤێت خو ژ دەستێت خو بادا .. ئێکسەر خدروی پەحنکا دەستێ خو دانا سەر دەستێ پیروی یێ راستێ و گوتێ ..

- بینە .. ژ خالا تە وەرە ، دێ شیێ گوستیرکێ هەلگری ..

- ئەرێ دێ گوستیرکێ هەلگرم .. پا خو نە دێ هێلمە ب هێڤیا تە ڤە .. ئەزبەنی نە د دەستێ دایە .. ڤێ جارێ من کرە د دەستێ چەپێ دا .

پیروی گوستیرك د ناڤ تلا بەرانی و شەهدێ دا گرت و بەرامبەری چاڤێت خدروی بلند کرو گوتە هەڤالێت خو :-

- وەرن دا بچنێ .. هاتە د دەستێ مە دا ... مانێ لسەری گوستیرك هاتە نك مە .. ئەڤە نیشانا وێرێیە .. هەر دێ ئەم بن .

خدروی بەرسڤا وی دا ...

- ل وێ هێڤێ بن ... تا هنگ ببن .. راوەستن ، یا تیریا دبنی دا .

نزار رك و رك د خدروی فوکری و گوتێ :-

- خالێ خدر ، بلا یا تیرلبنی بیت .. ئەز گەلەك حەژ تشتێ تیر دکەم .. بەلێ لگەل تشتێ تیر ، خورمە ژی گەلەکا خوشە .. ئەهـ ، خورمە دێ چەندا خوش بیت هەکە مە ژ وە بر .

- راستە خورمە یا خوشە .. هنگ ببن ، ئەم ببن ، ئەم هەمی پێکڤە دێ خورمێ خون .. بەلێ پاشی دێ بیرا وە ئینم .. کا دێ کی حەقێ خورمێ دەت .. دێ نوکە هەڕنێ .. پاشی ...

هەکو هەڤالێت پیروی خو نێزیك کرین .. دو بچویکا هەر ئێکی لفکەکا مێزەرکێ دگرت و د هژاند .. دا پیرو لبنڤە گوستیرکێ بگێڕت .. هەکو پیروی خەلەکا زێڕی کریە مێهڤان د دەستەکی دا .. دەستێ خو دا مێزەرکێ و دا قامەکێ .

- وەرنێ .. وەرنێ ..

خدرو رابو سەر چکێ خوو گوتە هەڤالێت پیروی :-

- هنگ هەمی دەستێت خو بیننە پێش .

لگەل پیروی هەمی هەڤالێت وی پێکڤە دەستێت خو ئینان پێش .

- هنگ هەمی دەستێت خو درێژکەن .

هەڤالێت پیروی لگەل ئێك دەستێت خو درێژکرن ... خدرو ما د چاڤێت وان فوکری ، چاڤێت وی ب پیروی ڤە مان ، دا بێژتێ :-

- سەرێ خو بلندکە ... شەرمە هندە تو خو مەلیل کەی ، دیارە تو یێ خەلەت بوی و تە گوستیرك یا کریە د دەستێ خودا .

- خالێ خدر ، تو بخو د زانی ، یێ گوستیرکێ هەل دگرت خو مەلیل نا کەت

- دێ مامێ پیرو دەستێت خو درێژ نەکە د کوشا خودا .

- ئەڤە من درێژکرن .

- وەرگێڕە .

- ئەڤە من وەرگێڕان .

- جارەکا دی .

- ئەڤە جارەکا دی .

- ئەز د بێژم پاتکا تە یا د خوریێت .. هەما بدلێ خو پاتکا خو بخورینە .

- گوستیرانا زەلاما بکە ..

- دێ مامێ پیرو .. گوستیرانا زەلاما یا چەوایە ، دەولەت سەرێ خو گوستیرانا زەلاما نیشا مە بدە .

- تو باش گوستیرانا زەلاما د زانی یا چەوایە ، بەلێ تو خو ب سەرڤە های نا دەی .. گوستیرانا زەلاما .. ئەڤە هەمی دەستێت مە لبەر تە ڤە .. وەرە دەست گول ، دەستەکی بخازە ، ب سەرێ تە هەر یا د دەستەکی دا ئەڤە نە گوستیرانێیە . بێژیە من سەرێ خو بلندکە .. بێژیە ئەڤی دەستێت خو درێژکە .. بێژیە یێ هە ، پاتکا خو بخورینە .. گوستیرانا درست بکە .

- مامێ پیرو بڤان ئاخڤتنا ، تو مە سەردا نابی .. هەکو گوستیرك هاتە د دەستێ مە دا .. پاشی خو بکە زەلامەك زیخ و دەستە گول بخازە .

- باشه خو تو سل نابی .
- نه ، ما دێ بو سل بم .
- پا دێ دەستێت .. هەردوکا پویچکه .
- هەر لسەرێ هەردو دەستێت د ڤالابوون .
- بەلێ ئەزبەنی .. ئەز دزانم تو نه ئەو زەلامی یێ گوستیرکێ بکەت د دەستێ خو دا ... زەلامێت گوستیرکێ هەل د گرن ، گەلەك د کێمن .
- راسته بلا ئەز نه هەلگرم .. بەلێ باش بزانه گوستیرك هەر من یا کریه د دەستەکی دا .. هەکە ئەز نەبم .. کەس هندە بسانەهی وێ گوستیرکێ ناکەت د دەستێ خودا .
- بلا کەیفا تە نە هێت ، نوکە وی زەلامی .. یێ تو پێ دخوری ، دێ بینن ... ئەرێ هەرێ مامو نزار نوکە گەرا تەیە .. ب من وەرە چاڤێت تە تشتەکی بێت دبێژن .
- خالێ خدر .. راسته .. تو چەوا دزانی .. چاڤێت من بێت دبێژن وەرە گوستیرکێ بخازە .
- ئەرێ تە دڤێت تولا مام پیروی ژ من ڤەکەی .. تو ژی دەستێت خو بەردە .
هەکو خدروی گوتیە نزاری (بەردە) ... پیروی کرە حەوار :-
- نه .. نه خالێ خدر ڤێ جارێ تە خو خەلەت کر .. ئەڤە ئەم (ئێك) .. نزار خوش تەلهەبو ، من بو تە ڤەدای ، دا زوی ، پێ دا بکەڤی .. وەرن گەلی برادەرا .. وەرن دا گوستیرکێ بکەمە د دەستێ زەلاما دا .. وەرن لەزێ بکەن .. دا زوی خورمێ بخون .
پشتی نوزده جارا مێزەرك بلندو رابی .. پیرو ئەو بونە یازدەو خدرو ئەو بونە هەشت .. گوستیرك د دەستێ خدروی وان دا بو .. هەکو میزەرك بلندبی ، هەمی برادەرێت خدروی دەست مچاندی دیاربوون ، پیرو ئێکسەر رابوڤەو داخاز ژ هەڤالێت خو کر :-
- ڤێ گەرێ کەس ژ وە نە چنێ و کەس د بەر من را نەئاخڤت ... کەس چو دەستا نە خازت ..
ئێك ژ هەڤالێت وی گوتێ ..
- دێ .. چەوا تو د بێژی کەس چو دەستا نە خازت .. مانێ هەر دێ دەستەکی خازن .
- ئەز ب سەرێ تەو ب سەرێ عەمێ گوزێ .. ئەم چو دەستا نا خازن .. ڤێ جارێ دێ تشتەکی کەم .. کو چو جارا کەسێ د ناڤ گوستیرانێ ئەو تشت نە کربیت .
- دێ چ کەی ؟
- دێ هەمی دەستا پویچ کەم .
بەرێ ئەو ئاخفتنێت پیروی بگەهنە گوهێت خدروی ، رەنگێ وی زەرو پویت بو .. بدەستێ خو یێ راستێ و مچاندی پاتکا خو خوراند .. نێ لبەر بەرزەبو ، دەستێ خویێ چەپێ ڤەکر .. چاڤێ پیروی ڤێ کەت ، ئێکسەر گوتێ :-
- ها خالێ خدر .. تە بخو دەستێ خو ڤەکر ، بەرێ ئەز بێژمە تە .. ئەرێ چەوا تو د زانی کو گوستیرك د دەستێ تە دا نینە ؟ خەبەرێ تەیە ، تو لگەل هەڤالێت .. دەستێت وە هەمیا پویچ .
- چەوا ئەم هەمی دەستێت خو پویچ کەن ؟
- ما نە ئەز هاتیمە گوستیرکێ .
- بەلێ ..
- ڤێجا ئەزێ د بێژمە وە ، دەستێت خو پویچ کەن ، یێ د دەستی دا بلا بێژت ئەڤە د دەستێ من دا . هنگی کەسێ ژ هەڤالێت خدروی نە داو نە ستاند ، پیرو پێڤە چوو گوت :-
- ها .. گەلی زەلاما ئەڤەیە گوستیرانێ ، ژنوی دیاربو کو کەس ژ وە نە شیایە گوستیرکێ هەلگرت .. زەلامێت گوستیرکێ هەل د گرن ، د ناڤ وە دا نینن ... دێ کا دەولەت سەرێ خولێ بکەرێن .. کا وە دانایە د کیش ڤولاچێدا .
خدرو ب هەردو چاڤا ، زلو زل د هەڤالەکێ خو فوکری و لێ خوری ..
- ما من گوستیرك نە کربو د دەستێ تە دا .. تە چ لێ کر ؟ !
- راسته تە کربو د دەستێ من دا .. بەلێ ژ دەستێ من کەتە عەردی .
ئینا پیروی گوتە خدروی :-
- خالێ خدر گوستیرکێ بدەف وان کەسا بێت د شێن هەلگرن .. ئەوێت گوستیرك خو د دەستێت وان دا نە گرت ، بلا دەستێت وان هەر ڤالا بمینن .

- دێ وەرن — چو نینە ، جارەکا دی دا بچنێ ، بلا ئەڤ جارە تێنە بێت .
- خالێ خدر .. ڤەیدی ناکەت ، ڤێ جارێ ژی هەرنێ .. یا درست ئەوە مە بەس کربا ، بەلێ پاشی هنگ دێ تشتەکێ دی بێژن .

جارا دی ژی گوستیرك لدەستێت هەڤالێت خدروی دا هات
گێران ، بەلێ پشتی مێزەرك رابی‌و دەست دیاربین ، پیرو شیا
گوستیرکێ ژ دەستێت وان دا بینتە دەرێ .. دا هەر بمینتە د
دەستێ پیروی وان دا ، دا لدویماهیی پیروو هەڤالێت خو ڤێ
گازییێ راهێلن :ـ

- هێ .. هێ ، ئەڤە ئەم بونە سی .. نوکە دێ چنە رەقینیا .. مانێ مە بێ گۆتی .. رەقینی پێنچن .

خدروی ب بوسیدەی ڤە گۆتێ :ـ

- بێهنا خو فرەکە .. هێش یا مای .
- راستە .. بەس خارنا خورمێ یا مای .

پیروی خەلەك کرە د دەستێ راستێ دا .. د کەربێت خدروی‌و هەڤالێت وی دا .. د دەستێ راستێ ، گوستیرك هەلاڤێت ، دا بدەستێ چەپێ ڤەگرت .. هەردو دەستێت خو برنە پشت خو .. زوی ئینانە پێش‌و دانانە بەر خدروی .. دا بەر ئێك راوەستن :ـ

- بینە دەستێ راستێ ؟
- ئەڤە ئەم رەقینیەك .

جارەکا دی ، پیروی دەستێت خو برنە پشت خو و ئینانە پێش :ـ

- مامێ پیرو بینە دەستێ راستێ !
- ئەڤە ئەم دو ..

جارەکا دی ... پیروی دەستێت خو دانانە بەر خدروی ...

- بینە دەستێ چەپێ !
- نەخێر ، تێدا نینە .. ئەڤە ئەم سێ .. چو نەما .

جارەکا دی‌و بلەز پیروی دەستێت خو برنە پشت خوو ئینانە پێش .

- ڤێ هەلێ دەستێ راستێ بینە !
- دەستێ راستێ بەس بخازە نەکە دێ تە لیەلایەکێ دەت .. ئەڤە ئەم بونە چار رەقینی .. یا مای ئێك ، د بێژن رەقینی د ئاڤێدا د چن .. بەلێ دیارە چو رەقینێت مە د ئاڤێ دا ناچن .

بەری پیرو بچتە رەقینیا پێنجێ .. دەنگە .. دەنگەك ، لبەر دەرێ مەزەلا سوبە تێدا هات .. دەمێ خودانێ دەنگی ب ژور کەتی .. هەمیا دیت کو کورێ بوشی رەشێ‌یە .. هێش سلاڤ نە کری .. بدەنگەکی زڕ گۆتە مروڤێت روینشتی .

- چەوا بێ من .. ئەڤ شەڤە وە دەست ب گوستیرانێ کریە ؟ پیروی ب نەخوشی بەرسڤا وی دا :ـ
- بو ؟ ما تو خو چ د بینی ؟ .. هەر ئەم مان ، توو دوسێ کەسێت هەر شەڤ گوستیرانی د کرن نە هاتن ، مە ژی دەست پێ کر .. چو ژێ نە چویە .. هندە ئەم دێ بن .. تو ژی لگەل مە هەمیا خورمێ بخو .
- ئەز چو خورما نا خوم .. دڤێت سەرو ژنوی دەست پێ بکەنەڤە .
- کورێ بوشی رەشێ ، گوهێ خو بدە من ! بەس ئەم ئەڤ رەقینیە بێت ماین‌و دێ یاری بدویماهی هێت .. چەوا سەرو ژنوی بکەنەڤە ؟ یا باش ئەوە تو ژی لگەل مە هندەك خورمێ بخوی .
- ئەز چو خورمێ نا خوم .. خورما ئەز گوستیرانێ لسەر نەکەم چەوا دێ خوم .

پیرو گەلەك ب ئاخفتنێت کورێ بوشی رەشێ بێهن تەنگبو .. ئێکسەر رابو سەر دارێ پێیا .. هەردو دەست مچاندی .. درێژ کرنە بەر خدروی‌و گۆتێ :ـ

- تە کیش دەست ؟ بخازە .. پاشی کورێ بوشی دەشێ چ دڤێت ئەم دێ رازی کەن .
- نە .. من‌و هەڤالێت خو دڤێن گوستیرانێ بخوشی بدویماهی بهێت .. هەکو هولێ هاتە هە .. مە ژی نە ڤێت .
- خالێ خدر وە چو ژ کورێ بوشی رەشێ نینە .. ما ژ نوی هنگ دێ وی نیاسن .. وەرە بخازە ئەڤە رەقینیا دویماهێ‌یە .
- هەکو هولێ هاتە هە .. بلا بەس بیت .

پیروی پاتکا خو دا خدروی‌و کورێ بوشی رەشێ ، خەلەکا زێری ماڤێتە بەر چەمبەلی و گۆتێ :ـ

- چەمبەلی‌یو .. ئەڤە گوستیرکا تەیە هەلگرە .. ئەم چو گوستیرانێ سەر ژنوی‌و سەر خاترا کورێ بوشی رەشێ ناکەن .. حەق ئەو بو هەکو ئەم بینە یازدەو وان گوستیرك بەرزەکری .. مە بەس لگەل کربا .

چەمبەلی دەست دا خەلەکێ ، کرە د تبلا دەستێ راستێ داو لگەل خو ب ئاخفتن هات (هێ .. هێ خدرو ، وە بڤێرە خوشە .. هنگ باش باش دزانن هەر ئەم دا بن .. ژبەر هندێ وە گوهێ خو دا کورێ بوشی رەشێ .. وە هەڤالینیا وی پیروزیت .. ڤێجا هەکە وە بڤێت سەر ژنوی لگەل وی ژی گوستیرانێ بکەن ، ئەو تشتەکێ دی‌یە .. بەلێ لسەر (حێسیلا)خورمێ نا بیت .. مە حەقێ وێ پێ دای‌و هەر دێ بو مە بیت .

# سێ کورتەچیرۆک

تەها ئەحمەد ڕەسول جاف
«سلەیمانی»

1 - دڵ :

کرببوو پێستێکی قلیشاوی دادڕاوی بەخوێدادابوو .. دەمێ بوو نەچووبوو ئەوبالورەوە ، هۆشی لە خۆی دابڕیبوو و ئەندامەکانی تری هێنابووە لەرانەوە ، چاوەکانی داپۆشیبوو و لەو ڕووەوە خۆی حەشاردابوو ، زۆری بەسەرهاتبوو .. هەمیشە کەوتبوە بارێکی زۆر لێدان و زرینگەی بێزارییەوە ، لە دوی لێفەیەکی ئەستوورو گەرم دەگەڕا تا بەخۆیدا دات و لێی بنوێ ، وەختی خۆی چەند لاشەیەکی سپلەو تاریکی گرتبووە ئامێز ، لەوەوە نەی دەوێرا ڕێگا بە هیچ تیرێک نەدەدا بەریکەوێ ، تا نەکەوێتە بارێکی نارەحەتی و ناخۆشییەکی هەمیشەیییەوە ، ساتێ لەگەڵ خۆیدا .. تەنها بۆ خۆی کەوتە دووان :

«هەموو لەبارێکی خۆشدان ، بە بۆنەی منەوە حەوانەوەیان لێبڕاوەو لێ بچڕاوە ، هەر منم خەمی کۆن و کەلێنی جیهانم هەڵگرتووە ، بۆنەحەوێمەوە ؟ بۆ ماوەیەکی کەم ڕوخسەتیان لێنەخوازم ؟ چی ڕوودەدا .... ؟ بڵێی دوای نووستنم ئەوانیش ماندووبوونی لەسەرشانیان بداتە شەقەی باڵ ؟ سەیرە .. بۆ هەر من بەتەنها ماومەتەوە ؟» .

دەستی کردەوە بە پیاسەکردن ، چاوی بە دەوربەری خۆیدا دەگێڕاو سەرپەشتی ئەوانی تری ئەکرد ، هەر بەردەوامبوو ، بە لەش قوورسییەکەوە دەڕۆیی و چرکە چرکی دەکرد ، ئارەزووی لێبوو لە گەرمیانێکی تر بگەڕێ و ماوەیەک تیایدا بلەوەڕێت .

گەیشتە مێرگێکی تەرو خۆی لێوەردا ، کەوتەوە مەلەکردن .. ئەمجارەیان دڵێکی تر هات بە میوانی ، بەرگێکی نوێی پۆشی و نەختێ خۆی پۆشتەکردەوە ، خۆشی نەیدەزانی ئەو ڕێبوارە لە کوێوە کێش بووەو لە کوێوە تیری هاوێژ تۆتە ماڵەکەی .. خۆی بە کەم تەمەن و نەزۆک دەزانی ، چەند پەندێکی بۆ چریکاندو کلپەکەی لەشی بۆ کردەوە بەفر ، کلپەکردنی بە دەرمانێ دادەنا کە لەبن کۆمەوە بڵند دەبێ .

زۆری نەبرد .. گرێکی بۆکرایەوەو هاتەوە قوڵپە ، چەشنی شخارتەیەکی بەتین پەنجەکانی دەتلۆقاند ، دەی وویست خۆی ڕزگارکاو دەربازبێ ، بەلام نەبوو .. مۆتەکە سەرلەنوێ دەستی خستۆتە قورقوراگەی و دەیەوێ زەفەری پێ بەرێت و بیکاتە چنگێ هەڵم ، لەم گێژاوەدابوو .. لەپڕ وەخەبەرهات و ڕاپەڕی ، دەستێکی ئاسک و لەسەرخۆی هێنایەوە بەملیداو لە پاشاندا ووتی :

«سەیرە خەونووستبووم ! ئای !! بەس نەبوو ڕاست نەبوو ، خوا بەخێری بگێڕێ ...» .

2 - وەڕزبوون :

نا ... نایخۆم ، تا هەست بە خۆی بکات ئەمن کێم ، خۆ دەشزانم پێشی خۆشەو دڵی دەکرێتەوە ، بەلام ئەو خورمایەی ئەو دەیخوات ئاوکەکەی والەژێرپێمدا .. وەڕزی دەکەم ، هاوڕێیەتی من و ئەویان نەوتووە ، وەکو بڵێی ئاگرو ئاو چۆن پێکەوە دەژین و چۆن دەست دەخەنە مل یەکتر ؟ ، دەزانم نیازی چیە .. دەیەوێ بمکاتە هاوسەری خۆی ، بڵێی تەمای وابێ ؟ بڵێی بە گلۆپێکی سەدی دڵی خۆیم پێ بزانێ ؟ .. بەلام نا .. ئەوانە بۆ تاریکی باشن و دڵیان تەسکەوەهەست بە بێزاربوون ناکەن .

خۆی ڕاتەکاندو پەڕێکی ئاسک و سپی خۆی ڕاتەکاندە دەرەوە ، دەستی خستە نێوان دارەکان و لە دوی هەلێ دەگەڕا ، وەکو بڵێی دەیەوێ خۆی لەو خەمە ڕزگارکا ، بە گوڕ خۆی پیا دەمالاو پیایدا هەڵدەسوو ، پاڵە پەستۆی دەخستە سەری .. «ڕزگاربوون دڵێکی نوێ دروست دەکات ، هەردەبێ ئەو ڕاستییە تێبگەم و ، لە بنچ و بناوانیانەوە بکوڵەوە ، زۆر باشە ، واکردییەوە ، ئاو دادەنێ ، پەرداخێکی ڕەنگاو ڕەنگی پسپۆر ، دان و گەنم ، ووردەنان .. بەلام هیچیان کلیلێ نین بۆ دەروونم تابیکەنەوە ، تۆ بڵێی کاتێ وەڕزبوو کە نایخۆم وازم لێبێنێ ؟ ، نانا .. ئەو هەڵەیە ناکەم ، دوایی ملم هەڵدەکێشێ و پەڕەکانم دەگرێ ، لە بیری چوو ، بەڕاست .. وانەڵێی !» .

لە قسەکەی تەواونەبوو گورێکی توونـد تری نایە پێشێ ، هەروەکو لە ژێریەوە سپرینێکی جیڕ پالی پێوەبنێ ، تـاهێزی تیابوو دایە شەقەی بالو ڕووی لە بلندی ئاسمان‌کرد .

3 ـ تابلۆیەك :

هەر کە خۆت دەکرد بە ژووردا یەکسەر ئەوت دەبینی ، بە تەنها لە دیوارێکی کۆندا هەلواسرابوو ، پەتـەکەی ژوور سەری زۆری نەمابوو بقرتێ ، هێندە مابۆوە تەپو تۆزی ئەو نـاوەی هەل مـژی‌بوو ، بـزمـارەکـەی ژوور سـەری ژەنگی هەلهێنابووو کەوتبوە لەقەلەق ، دلی بـەخۆیـدا دەهاتـەوە ، هەموو شەوێ تادرەنـگ هەر بـەڕۆشنی دەمایـەوە ، بواری نووستنی نەبوو ، قاچەکانی سڕ بووبوون‌و بە هیوابوو تەنهـا جارێك دەستی بەسەریاندا بهێنێ‌و وەك موگناتیسێکی دەست کرد ئێش‌و ئازارەکانیان لێ بێنێتە دەرێ ..

لە ژێریەوە کابرایەکی سمێل ئەستوورو گرژو مۆن خۆی خەریك‌کردبوو ، هـەموو شـەوێ فتیلەکەی دادەگـیرساندو دووکەلە ڕەشەکەی دەکرد بـەگژ لووتیـدا ، هێندەی تـر ئەو دووکەلە بێ پێزی کردبوو و ناڕەحەتی دەکـرد ، کابـرای ژێر قاچەکانیشی هەر دەی‌نووسی‌و دەی‌نووسی‌یەوە ، دەت ووت لە دووی شتێ دەگەڕاو دەسووڕا ، جـارجارە وازت لێ بهێنـایە بێ‌لەقەیەکی دەمالی بەسەریداو مـاتی‌نەکـرد ، بەلام قـاچی نەدەگەیشتێ‌و هەر بەو شێوەیە ئازاری دەچێژت .

دوای ماوەیەك لە دووکەلی فتیلەکە دابڕاو زوو شەوی لێ دەنیشت ، «لە دووکـەل ڕزگـارم بـوو ، مـاوەتـەوە سـەر نوێ‌کردنەوەم ، بەلام کێ نوێم‌کاتەوە ؟ ئەو .. ! خۆی ناتوانێ پۆشتەبکات ، دێت بەلای منەوە ؟» .

بـەدەم قسەکـردنەوە سـەرێکی شـۆڕکـردەوە کـەسی نەبینی ، هەمووبە بەتالی مابوونەوە ، زیالەجاران تەنهاتربوو ، ئەو پرشنگەی لە خواریەوە سێبەرێکی بۆ دروست‌دەکرد ئەویش نەما ، تەنهاتربوو ، لەوەتەی کابرای خوارووی کـۆچێکی بێ ناونیشانی کردووە ، ئەویش ئارامی لێبڕاوە ، ئەو گیانـەی لە بەریشیدا بوو ، ئەویش ڕۆیشت ، تـاوەکو دوور سـەفەرێکی بێ‌گەڕانەوەی کرد ، تەنهاتربوو ! ..

بـابەرو پێشتـر هەنگاوبنێ کاروانی ڕێی ئـەدەبی کـوردی ڕەسەنمان ... بۆ پێشەوە ....

نووسینی : ئارۆن تاماسی

وەرگێڕانی    احمد محمد اسماعیل

چوار سال ، ڕێك چوار سالی پڕ ئەشکەنجە ، بێ جیاوازی خوێنی ئەم جیهانە ڕژا .. لە بـەهاری چـوارەمین سـالدا بوو شـەوێکیان «آننـا دۆمـۆکـۆسی» جـوانکیلە ، وەکـو شـەوانی ڕابوردوی لە خوا پارایەوەو لەسەر نوێنەکەی ڕاکشا .

کە خەو بردی‌یەوە ، خەونێکی بینی .. لەخەونـەکەیـدا مەلێکی ڕەشی قەترانی گەورە هات‌و لەلای ڕاستی مالەکەیاندا نشتەوە .

«ـ ئەی مەلە ڕەشە جوانەکە لە کوێوە دێی ؟»

«ـ لە دوورەوە هاتووم ئەی آننا دۆمۆکۆسی نازدار .»

«ـ چی هەوالێکت پێیە مەلە ڕەشە گەورەکە ؟»

«ـ هەوالی وێرانی شارو دێی نیشتمان‌و مژدەی گەڕانـەوەی سەربازە لاوەکانم پێیە ..»

«ـ لە خۆم وای ، دەباسی خۆشەویستەکەم بۆبکە ... بینیت .. مەلە ڕەشە گەورەکە بینیت ؟»

مەلەکە داچەلەکاو ئەمەی بە آننا جوانکیلەکە گوت :

ـ تۆ تەماشای ڕەنگم بکە «آننا»ی نازدار .

ـ وا لەبـەرچاومی‌و دەتبینم ئـەی مەلە ڕەشـە جـوانـەکـە دەتبینم .

مەلەکە بالەکانی دابەیەکاو لە کاتی فڕینی‌دا ئاوای گوت :

ـ هەوالی مردنی لاوەکان ڕەش دایگیرسـاندوم جـاران وەك چوری شیر وابـووم .. مەینـەتی ئەم دونیـایە ڕەش هـەلیگرساندووم .

ئەمە بەسەرهاتی خەونـەکەی آننـا دۆمۆکـۆسی نازدار بوو ...

بۆ بەیانی‌یەکەی بەرلەوەی شەبەق بدا ، چووە سـەر بیـری ئاوەکـە ، بە چـاو تروکـاندنێـك حەوت دۆلەکـە ئاوی هەلکێشا . ئینجا بەدەم گۆرانییەوە ڕوومەتی پەمەیی شۆری ، دوو ، بەی سەر سنگی بەفرینی شـوشت ، دواجارلە تـەوقی سەریەوە تا پەنجەی پێی ئاوی پێدا کرد .

ـ نیـازی کام لات هـەیە ، وا خـۆت ئامـادە دەکەی کچـە شیرینەکەم ؟ .

# آنــا دۆمـۆكـۆس

- بەرەوپیری خۆشەویستەکەم دەچم ، دایکە گیان .
- خۆشەویستی چی .. کام خۆشەویستت ؟
- لاوەکانمان وا لەم شەڕەگەورەیە دەگەڕێنەوە دڵنیام خۆشەویستەکەی منیشیان لەگەڵدایە .

کراسێکی سپی لەبەرکرد ، خۆی نایەناو ئەتەکێکی گوڵ رەنگەوە ، پێ بچکۆلەو نەرمۆلەکانی لەپۆتینێکی تازە هەڵکێشا ، روومەتی ، خۆر ئاسا تیشکی دەبەخشاند ، دڵی پڕ بوو بوو لە خۆشەویستی ، دوو قەردێلەشی لەقژە زەردو خاوەکەیداو پوزی سپی پەنیرینی لێ بەرەڵلاکرد ..

- بۆکوێ دەڕۆی تەنیا کچەکەم ؟
- تا پاین دێکە دەڕۆم ، لەوێ چاوەڕێی خۆشەویستەکەم دەکەم .
- مەڕۆ کچم مەڕۆ ... لەماڵەوە چاوەڕێی بکە چاکترە .
- نەخێر .. دەبێ هەر بڕۆم .

بەوجۆرە بووك ئاسا خۆی رازاندەوەو بەرەو پاین دێ ڕۆیشت . «آننا دومۆکۆس» تا دوای نیوەڕۆیەکی درەنگ چاوەڕێی کرد .. گەڕایەوە ماڵەوە . چووە ناو باخچەکەوە ، سێ خونچە گوڵی بڕی ، هەرسێکیانی لە قژداو دووبارە ملی ڕێگای گرتەوەبەر بەرەو پاین دێکە ڕۆیشت ، تازەردەی خۆرئاوا ، چاوەڕێی کوڕە لاوەکەی دڵداری کرد . تاریك داهات گەڕایەوە ..

- کوانێ بۆدڵدارەکەت نەهاتەوە کچە جوانەکەم ؟
- لەوانەیە ئەمڕۆ بۆی نەکرابێ بێتەوە دایکەگیان .

آننا دۆمۆکۆس ، لەسەر نوێنەکەی راکشا ، بەڵام بێهودە ، چونکی گڕو هەڵاوی خۆشەویستی نەیان دەهێشت چاو لەیەك بنێت ، خەوی زڕا ، تا نیوە شەو لە سەر لای راست هەڵاژا ، ئینجا ئەودیوی کرد هەرچۆنێ بوو خەو بردی‌یەوە ..

- چیت لێهات مەلە رەشە گەورەکە ؟

شەبەقی داو راپەڕی .

- ئاە خۆزگە ئەم شەوە قەت بەرپا نەدەبوو .. ئاخ .. کراسەکەی دوێنێی گۆڕی بەکراسێکی جوانتر ، قردێلەی جوانتری لە قژدا ، روومەتی ورشەی دەهات ، بەڵام دڵی پڕ لە پشکۆ بوو ..
- بۆکوێ دەڕۆی کچە تەنیاکەم ؟
- لە دەرەوەی دێکە چاوەڕێی دەکەم .
- مەڕۆ کچم مەڕۆ لە ماڵەوە چاوەڕێی بکە .
- نەخێر دەبێ هەر بڕۆم .

ئەمجارەش ڕۆیشت . بۆدووەم ڕۆژیش تا نیوەڕۆ چاوی لە ڕێگا نەتروکاندا .. دوای نیوەڕۆ گەڕایەوە .

چووە باخچەکەوە ، ئەو گوڵانەی دوێنێ لەقژی دابوون فڕێی دان و سێ خونچەی پاراوی‌کەی لەقژدا ، دووبارە دەشتی داڵەبەر بۆپاین دێکە ، ئەمڕۆش تاکو زەردەی خۆرئاوا چاوەڕێ بوو .. تاریك داهات گەڕایەوە .

- بۆدڵدارەکەت نەگەڕایەوە کچە جوانەکەم ؟ .
- ئەمڕۆش نەهاتەوە دایکە گیان .

آننا ، چووە سەر نوێنەکەی بەڵام ئەمجارەیان لە دوێنێ خراپتر کڵپەی ئاگری دەروونی هەڵایسابوو ، خەوی لەبیرچووەوە . بەدرێژایی شەو تەنیا سەعاتێك وەنەوز بردی‌یەوە . تا نیوەشەویش بەپێوە بوو . آننا هەستا چراکەی دانەگیرسان ، تا دایکی پێی نەزانێ ، لەژێر لێفەکەوە ئەتەکێکی رەشی لەبەر کرد ، قەردێلەیە رەشی لەپرچی‌دا ، بە ئاستەم بەرەو دەرگاکە چوو ، جیرەی دەرگاکە دایکی لەخەو هەستان .

- بەم نیوە شەوە بۆکوێ دەڕۆی کچە جوانەکەم ؟
- ئەم ئاوە دەرژێنم و هەندێ سوتەمەنی دێنمە ژوورەوە .
- مەڕۆ کچم مەڕۆ ..
- دڵم ئۆقرە ناگرێ دەبێ بڕۆم .

«آننا» کەوتەڕێ ، بە ڕەش پۆشی لەماڵ دەرکەوت ، تەماشایەکی لای‌راستی ماڵەکەیانی کرد ..

- چیت لێهات و بۆ کوێ ڕۆیشتی مەلە رەشە گەورەکە ؟

گەڕایەوە بۆ ناو باخچەکە . هەرچەنێ گوڵی جوان هەبوو ، هەمووی بڕی ، پڕ باوەشی بوو ، کە لەژێر تیشکی مانگدا ڕێگای پاین دێی گرتبووەبەر ، تارمایەك ڕێگای لێگرت :

- ئەوە بۆکوێ دەڕۆی هەی جوانی نێو جوانان ؟
- تا سەرەوەی دێکە دەڕۆم لەوێدا چاوەڕێی دەزگیرانەم دەکەم ...
- مەڕۆ مەڕۆ بێ‌بەختەکە .. وەرە با پێکەوە بنوین .
- ڕێگاکەم بەردە ئەی تارمایی . من چاوەڕێی دڵدارەکەم دەکەم .

«آننا» رووومەتی خستە سەر گوڵەکانی باوەشی و کەوتەوە

ڕێ .

یەك دوو هەنگاوی نا ، هەمدیس تارمایی‌یەکە بەرامبەری گرتەوە .

- بەقسەم بکەو مەڕۆ جوانی ناو جوانان .
- لاچۆ تارمایی لاچۆ ئەگینا بە خۆشەویستەکەم دەتدەم بە کوشت .
- ئەو ناتوانێ من بکوژێ .. چونکی ئەو جێگای خۆی بینیوەتەوە .

چاوەکانی «آننا» بریسکەیاندا ...

- تۆکێی تارمایی .. کێی ؟
- من قارەمانی قارەمانانم .. چونکی من خوای شەڕم .
- یەزدانی بەتواناو گەورە بەجەزای خۆتت بگەیەنێ ..

آننا دۆمۆکۆس ، بێ ترس ئاوا ڕوو بە ڕووی بوەوە . دووبارە عەشق هەنگاوی پێ هەڵهێنا .. بە دەنگێکی بەرزیش ئەو ناوەی پڕ کرد :

- وەرە .. دەوەرە ئەی تاقە خۆشەویستەکەم تۆ کە دوژمنی نیشتمانەکەت کوشت دەنێستاش وەرە ئەوانە بکوژە کە دەیانەوێ ژیانمان لێ تاڵ بکەن ئەمانەش لەناو بدە ، ئەوانەی دەیانەوێ دڵم لەکەدار بکەن . وەرە تاریکی دڵم بڕەوێنەوە .. وەرە ئەی خۆری لاوێتیم .. دەبا بێ ئەوەی خەڵکی دیکە ئاگادار بکەینەوە لەپڕ خۆمان بەناویانا بکەین .

لەمبەر ڕێگاکەوە دەچووە ئەوبەر . پێی بەیەکا دەهات دەستە گوڵەکانی باوەشی یەکە یەکە دەکەوتن . ختوورەی دڵی پەشۆکانبووی :

- خوایە .. خوایە لەگەڵ شەبەقدا بە خۆشەویستەکەم شادم بکەی خوایە ...

شەبەقی‌دا ، ئاسۆ سوور هەڵگەڕا . آننا دۆمۆکۆس ڕوی لە خۆرئاوا کرد .

- خوایە .. خوایە لەگەڵ یەکەم تیشکی ڕۆژدا دڵدارەکەم پەیدا بێ خوایە ....

خۆر بەرز بوەوە ، بەڵام دڵدارەکەی نەگەیشت . دڵدارەکەی نەهات .

بەڵام دایکی پەیدا بوو . شیری بۆ هێنابوو بە میهرێکەوە پێی گوت :

- بگەڕێرەوە کچە خۆشەویستەکەم . خەڵکی تەماشات دەکات .
- پێکەوە دێینەوە دایکە گیان .
- دەباشە .. مادام وایە ئەم شیرە بخۆرەوە .
- دڵی عاشقم پێویستی بە شیر نییە .

ئێوارە درەنگ ، دایکی هات بە زۆر لەگەڵ خۆیدا بیهێنێتەوە :-

- با بچینە ماڵەوە . کچە بێ شەرمەکەم . خەڵکی هەمووی باست دەکەن .
- من لەگەڵ خۆشەویستەکەمدا دەگەڕێمەوە . دایکە پێکەوە لەگەڵ ئەودا دێمەوە .
- هیچ نەبێ شتێ بخۆ تا خوات لێ نەڕەنجێ :
- لەشی بە عیشق داگیرساوم پێویستی بە هیچ خواردنێك نییە .

خۆر ماڵ ئاوایی لە دونیای پڕکارەسات کرد ، دایکیشی بەم جۆرە بەجێی هێڵا :-

- ئیتر جارێکی کە من بێ‌و لەباوەشی خۆمت ناگرم ، میهری دایکێتی بەتۆ نادەم . حەزیش ناکەم جارێکی کە بتبینمەوە . خۆزی جارێکی‌کە ناوتم نەدەبیستەوە .

سەرەڕای دڵ ئەنجن ئەنجن کراوی ، نەفرەتی دایکیشی هاتەسەر . سەری شۆڕبوەوە سەر گوڵەکانی باوەشی‌و بەکوڵ گریا ، گریا :-

- وە خۆمڕۆ ، لە خۆشەویستی دایکیش بێ‌بەری بووم .

ئەوەندە فرمێسکی ڕشت ، تا لێڵایی داهات . لەقەراغ ڕێگاکە دانشت‌و گریا :

- ئای دڵە پڕ کەسەرەکەم .. ئای ڕۆژانی داهاتووم ، ئای بۆ تەمەنم .. ئای بۆ ئاواتەکانم ..

لەوێ مایەوە تا مانگ تاریکایی‌یەکەی دەورووبەری ڕەواندوە .

مانگی ڕوو زەرد گەیشتە سەر شاخەکان .. ئەو کاتە هاتە تەنیشت «آننا دۆمۆکۆس»ەوە ویستی تەسەللای بداتەوە .

- مەگری آننا دۆمۆکۆس مەگری . تەنها ئەم کارەساتە بەسەر تۆدا نەهاتووە . گەلێ دڵداری کەی وەکو تۆ هەن ، بۆ یەکجاری خۆشەویستەکانیان لێوون بووە ،
- بەڵام من تەنها خۆشەویستێکم هەبوو .

مانگ خۆی لێ نزیك کردەوەو بە گوێیا چرپاندی .

- بخەوە بخەوە آننا دۆمۆكۆس بخەوە .

بەم جۆرە تا نیوەشەو بەو دەردەوە مایەوە . لەپڕ خۆیشی نەیزانی لەكوێوە . گولێكی ڕەش پۆش لەولایەوە كەوتە خوارەوە . مەلە ڕەشە گەورەكەش نشتەوە

- تۆ وەرە وەرە مەلە ڕەشەكە بۆ درۆت لەگەڵ كردم ؟ .

- من درۆم لەگەڵتا نەكردووە . نەمویست ئەوكاتە دڵە بچووكەكەت غەرقی غەم بكەم .

- هەموو شتێكم لەدەست دەرچوو .. نەكەی لەدوام بگری ...

- یەكجاری وا لەخۆت مەكە .

- لەمەو دوا نەفرەت لەم ژیانە دەكەم . با لەمەودوا دۆزەخ جێگەم بێ هیچ باكم نییە .. بەلام تۆ پێم بلێ .. تكات لێ دەكەم : دلدارەكەم لەكوێیە ؟ .

مەلە ڕەشەكە ناچار ئەم دان پیانانەی لەبەردەم آننادا گوت :

- دلدارەكەت وا لەوولاتێكی دوورا سەری ناوەتەوە ..

آننا دۆمۆكۆس بە ڕووی ئاسماندا قیژاندی :-

- بروخێ ئەم گەردوونە ..

لەسەر گولە ڕەشە كەوە هەلاوێك شەپۆلی داوو چووە ئاسمانا . ئاسمانی بە ئەستێرە سیخناخ بۆڵەیەكی بۆ كرد . گولەكانی باوەشی ڕەش هەڵگەڕان . نەفرەتێك بووو چووە ئاسمانا .

- گوێ بگرە یەزدانی گەورە . گوێ لەدوا ووتەم بگرە تا بە گوێی خۆت گلەو سووتانی دڵم بژنەوی . نەفرەت و سزای خۆت بەسەر ئەوانەدا ببارێنە كە شەڕ هەڵدەگیرسێنن .. ئەوانەی شەڕیان بۆ ئەم وولاتە دەوێ فڕێیاندە دۆزەخەوە ئەوانەی دلدارەكان لەیەك دەكەن تەفرو توونایان كە . مەلەڕەشەكە باڵەكانی بە یەكداداو ووتی :-

- آننا دۆمۆكۆس لەسەرخۆبە ..

آننا یەكە یەكە گوڵەكانی باوەشی لەگوڵە ڕەشەكە گرت

- ئەستێرە گەورەكانی ئاسمان ئێوە ببنە دلۆپە بارانی لەژمارە نەهاتوو برژێنە لوولەی تۆپەكانەوە .. ئێوەش ئەی ئەستێرە بچووكەكانی ئاسمان ببنە دلۆپە باران و دادەن بەسەر لوولەی تفەنگەكاندا ...

آننا دۆمۆكۆس لەقەراغ ڕێگاكەدا لەبەر خۆیەوە ئاوا وڕێنەی دەكرد ..

مەلە ڕەشە گەورەكە چووە تەك «آنناوە» . آننای خستە سەرپشتی و بەرەو ئاسمان بردی .. تا گەیشتە بەردەم یەزدان .

- تۆ شەڕت دروست كردووە . تۆ جەنگ بەرپا دەكەیت . تۆی یەزدان ...

- من جەنگم بەرپا نەكردووە .. پاسەوانانی دۆزەخ هەڵیان گیرساندووە .

آننا دومۆكۆس . چووە بەر دەرگای دۆزەخ :

- پاسەوانانی دۆزەخ بۆ ئەم جەنگەتان هەڵگیرساند ؟

- ئێمە نین .. نەفرەت لێ كراوەكانی سەر زەوی ئەو شەڕەیان هەڵگیرساند ..

ئیتر لەو ڕۆژەوە كاتێ مانگ دێتە ناوەڕاست ئاسمان ، لەو بانەوە بەڕووی خەڵكی سەرزەویدا هەڵدەشاخێ و دەڵێ :-

- یەزدان بە جەزای خۆتانتان بگەیەنێ و نەفرەتتان لێبێ ئەی شەڕ هەڵگیرسێنەران .

هەموو ڕۆژێكیش كە خۆر بەرز دەبێتەوە لەناو جەرگەی ڕۆژەوە دەست رادەوەشێنی و دەڵێ :-

- یەزدان بە جەزای خۆتانتان بگەیەنێ و نەفرەتتان لێ بێ ئەی شەڕ خوازان ...

ئارۆن تاماسی لە ساڵی 1901 لە دایك بووە ، لەناو خێزانێكی هەژارو كەم دەرامەتدا پەروەردە بووە . لە تەمەنی 18 ساڵیدا بەشداری شەڕی دووەمی جیهانی كردووە و لە چیرۆكەكانیدا ڕەنگی داوەتەوە . دوای كۆتایی شەڕ خوێندنی یاسای تەواو كردوە ، ئینجا بڕوانامەی خوێندنی بازرگانیشی وەرگرتووە . بە ڕێكەوت لەپێشبڕكەیەكی ئەدەبیدا بەشدار دەبێ و خەلاتی یەكەم وەردەگرێ . ئەمە وای لێكردووە روو لە ئەدەب بكات .. بۆ ماوەیەك لە ئەمەریكا ژیاوەو دواجا گەڕاوەتەوە نیشتمانەكەی . گەلێ ڕۆمانی بەچاپ گەیاندووە لەمانە : لانكو پەپوو ، ئاوێنە ، .. هتد

لەگەڵ ئەم كۆمەڵە چیرۆكانە : تیشكی مانگ ، جەننەتێكی كێوی .. چیرۆكەكەو ژیان نامەی نووسەرەكە لە كتێبی :-

MAGAR HIKAYELERI ANTOLOJISI یەوە كراوە بە كوردی

# میوان

سڵاح محەمەد ئەمین

سلێمانی

ئازاری 1994

دیسـان ڕیشکەو پێشکـە بەدرەزاکـە بەری چـاوتیـان گرتەوە .. ساتێکی نەبرد هەموو تێك ئالان ؛ بەرز بـوونەوە ، بەلای ڕاستا لاقرتێیان بەست ، ڕەنگەکان گردبوونەوە ، وەك بەسترێنە تۆپێکەوەو بواری جوولەیان کەم بێتەوە ، لەهەڵبەزو دابەزکەوتن .. ئەو کشتەکە نادیارەی لەبیلبیلەی چاوتا جێگیر بـوو ، لەگەڵ پـەیدا بـوونیانـا سەرێکیـان گرتو بـردیـان ، سەرەکەی تریشی لەگلێنەی چاوی ڕاستتا چەسپی ، کرژبوو ، سووکە بۆنەکەش وەك دوا وریاکردنەوە هاتە بەر لووتت ..

«لەماڵەوە بوایە بەو چەند ساتە خۆم دەگەیانە شوێنێکی کەلا ، هەر چونێك بوایە ئەو چەند دەقیقە پڕ لەئازارەم لەگەڵ ڕاتەکاندنی کشتەکەکەدا بەسەر دەبرد ، مەگەر پرخەو لرخە لرخم یەکێکیانی بەئاگابهێنایە ، ئەویش لە (دە) جارا کەرەتێك یان هەر پێشیان نەدەزانی .. ئەی ئێستا لەم ئـوتومـۆبیلەدا چیبکەم ؟ خۆ هەرچەندە کەسیان نییە لە دەردم بێئاگا بێت ، سەرنجی بەزەیی لەچـاوی یەك بـەیەکیـانا بـەدی دەکەم ، تەنانەت هەندێکیان بەشێتم دەزانن‌و سڵیشم لێدەکەنـەوە ، بەلام هەر چۆنێك بێت بەو حاڵەوە نەمبینن .. ئەوەی باشە پاسە بیستو یەك نەفـەرییەکـەی کاك عـەلی چۆڵە ، بـەخۆیـەوە دوانزەکەسی تیایە ، منیش وەك پیشەمە بەهەر بیانوویەك بێت خۆم دوور دەگرم ، ئەویش لەترسی میوانە نالەبارەکەم ، ئەوەی کاتی دیاری کراوی بۆنی‌یـە ، لەشوێنی وادا پـەیدا دەبێت‌و جەمسەری کشتـەکەکـە لەچاوی ڕاستم دەردێنێ‌و بـەگاڵتـە پێکـردنەوە بـەرەو لای ڕاستم بەکێشی دەکـات ، تەنـانـەت لەخەویشدا بەئاگام دێنێ‌و بەرەو ئەوێ ڕایدەکێشێ ، ئـەمجا هەر یەك لەو ڕەنگانە چەند جارێك ڕای دەتەکێنێ ، ئیتر کەللەم دەبێتـە کۆلارەی دەستی منـداڵێکی چوختی کـەخێرا خێـرا داوەکەی ڕادەپسکێنێ ، سەرم دەکەوێتە ڕەت‌دان ، چاویشم دەبێتـە کونی داوی کـۆلارەکە .. خـۆزگە هـەر بـەوەشـەوە بوەستایە ، دەمیشم بەلای ڕاستاگیر دەبێت‌و دەکەوێتە کەف چەراندن ، لای ڕاستم سەرانسەر تووشی ئیفلیجی دێت !»

هەر چوار کوڕ سییەکەی ڕیزی دواوەت بۆ خۆت گرت‌و لەڕێـوە تیـایـدا پـاڵ کـەوتیت ، ئـەوانیش تێت کـەیشتن ، لێتگەڕان .. ئەوەتا بەدەما ڕاکشاویت ، ڕووت بـۆلای چەپ وەرگێڕاوەو ڕوومەتی ڕاستت لەکـورسی‌یەکـە تونـد کردووە ، بەدەستی چەپیشت توند چاوت گرتوە ، لەوەش بەئاگایت گەر بەردەوام بن دەستت شل دەبێت‌و چـاویشت وەك دوو قولاپ لەهەردوو پێلوەکانی گیر بکرێن تا دایبپچڕێنن ، بەلام بەدەست خۆت نی‌یە وەك پەلەپرووزەی مەرگ بێت ، چۆن یەکێك خەریك بێ لە دەریایەکدا بخنکێ پەنا دەبا بۆ پوشێك بەفریای کەوێ ، تۆش وات لێ بەسەر دێ .

«خـوایەگیـان هەر ئـەمجارە ڕسـوام مەکـە ، چونکـە هەندێکیان لەو بارەدا نەیاندیوم . بـریا گلێنـەی چاویـان ئەو دیمەنە ناپەسەندەی منیان نەشتایەتـەوە .. وا ملم سووڕا ، چارەکە دەورەیەکی کرد ، ئەمجا نۆرەی ڕەت بردنێتی ، ڕەتی یەکەم خاوە ، لەخوا بەزیاد بێ واپێ دەچێ هەربەوەندە دەست بەردارم بن ! .. وایە ، ئەوەتا وا ڕەنگێکیان لەشێوەی تۆپێکدا ڕووەو ناو چاوم خل‌بۆوە ، نەما .. ئـۆخەی .. خـۆزگە چـاوم ئـەوەندە بـەهێز بـوایە هـەموو جـارێك بـەداوەکـەوە هـەڵی لووشینایە .»

هەناسەیەکی قـووڵت هەڵکێشـا ، کەوتیـە سەر گـازی پشت ، خـوشکە بچـووکەکـەت‌و کچە پـوورێکت کە لەسـەر کورسی‌یەکانی پێش تۆوە دانیشتبون سەریان بەدیوی تۆدا شۆڕ

کردبۆوەو سەرنجیان دەدایت ، چاوت هەڵبڕیو بەتەوسەوە بزەیەکت هاتیو پێت وتن :
- چی یە .. بۆوا سەیرم دەکەن ؟ !
لەوە دەترسای هەستیان کرد بێ .
- وامانزانی خەوت لێکەوتووە ، چونکە یەك دوو پرخەتمان گوێ لێبوو ...
- ڕەنگە خەوم لێکەوتبێ !!
نەختێکی تری پێوە بوایە لێیان ئاشکرا دەکردی ، باش بو ئەمجارەیان چاوت لەڕەنگەکان بەهێزتربوو ، بۆیە ئەوانیشی بەکشتەکەکەوە ڕاپێچکرد .
کەسەرنجت دان هەستت کرد بەوردی لەچاوت دەڕوانن ، دیارە هێشتا شلەقاوییەکەی جێی خۆی نەگرتۆتەوە .. تا چەواشەیان کەیت وتت :
- ئەوەندەم خەو دێ گێژبووم کەچی هەرچەند دەکەم لەم ئۆتۆمۆبیلەدا خەوم لێ ناکەوێ .
خۆت بەلای چەپدا خستو ڕووت لەوان وەرگێڕا ، لەناخیشەوە گەمەت بەقسەکانی خۆت دەهات .. هەرچەندە دەتزانی کەئەوان بڕوات پێدەکەن ، چونکە زۆرخەویت دەنگی دابۆوە .. هەستانو نووستنت بەدەست خۆتە ، کەس بۆی نی یە لەخەو بەئاگات بێنێ ، شەو هەیە لە هەشتەوە دەچیتە ناو جێو بەیانیش سەعات (دە) هەڵدەستیت ، کەسیش نی یە پێت بڵێ بۆ ؟
- چەند دەتوانن دڵنەوایی بکەن ، با زۆر بنوێت ، ناوە ناوە بێ ئەوەی خۆی هەست بکا سەری بەن ، بەلام کە لەخەوابوو بە ئاگای مەهێنن ..
- ئەی خوێندنەکەی ؟
- خۆی سەر پشك بێت ، زۆری لێ مەکەن .. هەر بۆخوێندن نا بەلکو لە هیچ شتێکا زۆری لێمەکەن .. چونکە جۆری پەرکەمەکەی زۆر سووك نی یە ، ڕەنگە خۆشی نەیەوێ ئەوەندە ئەمو ئەو بەو حاڵەوە بیبینن ..
- ئەی دەرمان ؟
- هەر ئەو حەبانەی پێشوی بەنێ .. با لەسەریان بەردەوام بێ .
- دوکتۆر ماوەیەکە بەلای کەمەوە هەفتەی یەك دوو جار لێی دێ !
چارێکی وانی یە کەمی کاتەوە ؟
- تائێستا هەر ئەو حەبانە چارەکەیەتی .. بەلام خۆتان دەتوانن کەمێك باری سووك بکەن ، ئەویش بەوەی کە تادەتوانن دڵی ڕابگرنو چاودێری بکەن ، بەجۆرێکیوا کە خۆی هەستی پێ نەکات ..
بەڕێکەوت ئەو وتوویژەی نێوان باوکتو دوکتۆرەکەت بیست .. ئەو بە پەرەستەکەی خۆی وت کە تۆ بەرێتە ژووری چاوەڕوانی ، بەلام تۆ بەهۆی جل لەبەرکردنەوەوە خۆت دواخست ، بەردەستەکەش لەبیری کردیو جێی هێشتی .
پێریش لەژوورەکەی خۆتەوە گوێت لێ بوو باوکتو کاك عەلی مێردی پوورت لەوە دەدوان کە گەشتێکت بۆ مەیسەر بکەن ، هەستت کرد بویتەتە تەکێوێك ئازارو ئەشکەنجە ، وەك جگە لە تۆ هیچ گرفتێکیان نەبێت ، تۆ دڵت بوتە بەردێکی ڕەقو تەق ، کەچی ئەوان دەیانەوێ بیکەنە زەوییەکی بژوێنو باخچەیەکی ڕازاوەی گوڵزاری لێ بێننە کایەوە .

* * *

ئەگەر ئەو لادانەی ڕێگا نەبوایە شەوتان بەسەر نەدەهات ، بەلام دەبوایە وابێت ، چونکە ئێوە بۆ سەیرانو گەڕانو ڕابواردن هاتوون ! ئەو شوێنەش گەلێك دڵگیر بوو . خواردنی خۆتان هێنابو ، بەدەم چێشت لێنانو وردەنیشەوە بەکاو خۆ گۆرانی دەوتراو جار جاریش دوو دوو سێ سێ دەستیان دەگرتو زەماوەندیان دەگێڕا ، ڕاستە بۆخۆشیو شادی هەموان بوو ، بەلام دڵی تۆ مەبەستی سەرەکی بوو ، کەچی تۆش بیرو هۆشت بەمیوانەکەتەوە خەریك بوو ، بەوەی کە ئەو چەتوونە هات چۆن چۆنیو لەکام شوێنی کەلاوە پێشوازی بکەیت ، بۆیە هەر کە باسی لادانو دانیشتن هاتە گۆڕێ ، بەپەلە چاوت گێڕا ، کەندەلانێکت بەدی کرد :
- ئێرە خۆشە با لێرە لابدەین !

شتێکت پێشنیار بکردایە دانە دواوەی نەبوو . سەنگەری خۆ حەشاردانی خۆتت هەڵبژارد ، دەهەنگاوێك دوور لێوەی دانیشتن ، جێگای خۆت لەپەڕەوە نزیك کەندەکە بوو ، ئەوان گۆرانی دەڵێنو زەماوەند دەکەن ، تۆش هەربەلەش لایانیت ، ئەگینا وەك تر :

«ئێرە چاکە ، پێوام هەر هەشت نۆ شەقاوێك دوورم ، بۆ ئەوەی هەستی پێ نەکەن نەگەر لەسەر خۆش بڕۆم هەر بەچەند ساتێکی کەم دەیگەمێ ، نامبینن ، مەگەر ... ئا ، مەگەر زۆر لێم بە ئاگابن ، بەڵام نەء ، چونکە شوێنەکەی وانی‌یە تا ئەوەند بە وردی چاو دێریم بکەن ، نەسەربانە نەبەر پەنجەرەی ژوورێکی بەرزە ، نەگوێ ئاوەو نە لەلای ئاگریشەوەیە ...»

تۆ لەم کەین و بەینەی خۆتا بوویت ئەوانیش لەبەزمی خۆیانا بوون .. بەڵام هەستت دەکرد جا جار دەیاندایتە بەر تیلەی چاو ، یان هانی بەشدار بوونیان دەدایت ، خۆکەسیان ڕاستەو خۆ داوای لێ نەدەکردی ، بەڵام خۆت زیرەکیت ، سەرنجەکانیان دەخوێنیتەوە .. بەگوێی خۆت ئەوەت بیست ، ئەویش کە دوکتۆرەکەی خزمتان بۆ هەواڵ پرسینت هاتبوو بەباوکتی ڕاگەیاند . کردبوت بەخوو هەرچەند یەکێکی لەو جۆرە بها تایەو ئەو باسەی لابکرایەتەوە ، لە هەر شوێنەکەوە بوایە خۆتت لێدەگرت :

- زیرەکەکان بەزۆری تووشی ئەم جۆرە نەخۆشی‌یە دێن ، چونکە مێشکیان هەمیشە وریایەو لەکاردایە .. گەلێك لەزاناو ناوداران و بلیمەتەکانی دونیا وابوون ..

- بەلێ دوکتۆر ئەمیش هەر لە منالیەوە زیت و وریا بوو ، زۆر لەوانی تریشم وردبین ترە .. لە قوتابخانەشدا زۆر ستایشیان دەکرد ، ئێستاش لەزۆر شتا بۆ چوونی ئەو لەهی هەموویان چاکترە .

- ئەو دەرمانەش زیاتر بۆ خاوکردنەوەی مێشکێتی ، بۆیە کە دەیخوات ئارەزووی نووستن دەکا .

کزەیەکی ساردی دەمەو ئێوارە بەئاگای هێنان و کاتی بەبیر هێنانەوە . بۆیە وا درەنگ کەوتن و بەتاریکی گەیشتن . تاریکە شەوە ، چرای شەقامەکان چاویان نووساوە ، بەغدا لەگۆمی تاریکیدا مەلەدەکات ، لایتی ئۆتومۆبیلەکان چاوی بزی ماسی‌یەکانی ناوین .. دووسەعات زیاترە لە ئوتێل دەگەڕێن ، لەبەر هەرکامێکیانا دەوەستن ، دوای نەختێك پیاوەکان سەر دەکەونەوەو :

- نیوەی سالان هەروایە ، جێگا زۆر زەحمەتە .

- ئێمەیش ڕەوەیەکین ، لەم شەوانەدا هیچ ئوتێلێك ئەوەندە جێگای نی‌یە .

- ئێ خۆمن پێشیان دەڵێم هەر دوو ژوورمان بەنێ جێی خۆمان دەکەینەوە ، هەمووی چوار پێنج سەعاتێکە !

- جا کەوایە با لەئوتومبیلەکەدا بنوین .

- کاکی خۆم من ماندوم ، لەئوتومبێلدا خەوم لێ ناکەوێ ، لەبەیانی‌یەوە لێ دەخورم ، ئێستاش نەخەوم ، ئەی سبەینێ چۆن دەست پێ بکەمەوە ؟

لەئوتێلە باشەکان بوونەوە .. ناچار سەرتان بەهی وادا دەکرد کە هەر بیریشتان لێنەکردبۆوە .. نزیك دوانزەیە ، خەریکە شەو گارەکە لێژ دەبێتەوە .. لە دەرگای یەکێك لەوانەی هەر بەناو ئوتێلن هاتنە دەرەوەو دەستیان واراوەشاند کە دابەزن .. چوونە ئەو دیو دەرگاکە ، کچان لچیان لێ هەلقورچاند ، تۆ ئەوەت نەکرد .. دوو ژوورەکەیان نیشان دان ، کاك عەلی و پورت و هەردوو خوشکەکانت و دووکچە پوورەکەت و تۆ چوونە یەکێکیان ، سێ کوڕەکەو دایکی یەکێکیان و پیرەژنەکە چوونە ئەوی تریانەوە ، هەرچەند بوڵەو خوتەو قێزو بێزتان کردەوە ، بەڵام بێ سوود بوو ، چونکە کاك عەلی کە سەر قافلەکەبوو دەبوایە بنوستایە ، بۆیە نەختێك بەسەرتانا هات و تۆزێکیش بەتەوسەوە گاڵتەی بەنازو نوزتانکرد وەك کۆمەڵێك کچی عازەب ، جا قایل کردن بەوەی خۆتان کرکەن تا ئەو چەند سەعاتە خەوتان لێ بکەوێت .

بەدەم خەیاڵەوە خەریك بوو خەوت لێ دەکەوت ، دەتزانی هەر خۆت بەئاگایت و هەموو نووستوون ، چونکە بەمەزەنەی خۆت سەعات زیادە چونەتە ئامێزی تاریکی ژوورەکەوە .. لەپڕا بۆنێکی زۆر ناخۆش هاتە بەرلووتت ، تا دەهات زیادی دەکرد ، وەك بۆ چرووك بێت ، زۆرت لەخۆت کردو هەستایت ، پێش گلۆپ کوژاندنەوە جێگاکانیانت دیاری کردبوو بەرەو لای جێگاکەی کاك عەلی بویتەوەو بەئاگات هێنا :

- کاك عەلی هەستە بزانە ئەو بۆ چرووکە چی‌یە ؟

- بۆ چرووکی چی ؟ کوا هیچ بۆن ناکەم !! بنوو زۆری نەماوە ڕۆژبێتەوە ، خۆتان هەر لەسەرەتاوە ئەوەندە قێزو بێزتان لە جێگاکە کردەوە بۆیەوا هەست دەکەیت ، ئەگینا هیچ لەئارادا نی‌یە .. ! بنو کچەکەم نە ختێك خۆت بخافڵێنە خەوت لێدەکەوێ .

کە قسەکانی دەکرد چاوی هەڵنەدەهێنا ، یەکەم جار نەبێ کردی‌یەوەو بینیتی ئیتر لێکی نانەوەو ئەوقسانەی کرد ،

هەستت کرد هەر کەزانی تۆیت شتەکەی بەبێ بایەخ زانی ، بۆیە تۆش وەك دڵ شکاوێك گەڕایتەوە سەر جێگاکەت و هەر دوو کونە لووتت بەپارچە کلینیکس ئاخنی و سەرت داپۆشی بەهیوای ئەوەی خەوت لێ بکەوێ ..

- بابە .. بابە .. هەستە بۆ کرووزو بۆ چرۆکێکی زۆر دێت !
- ها ئەوە تۆی ؟

گوێت لێبوو یەك دوو مشەی لێوە هات و کەوتە بۆن کردن .

- ئەوە چی یە ؟

هەرچەندە ماوەیەکی باش بەسەر هەستانەکەی تۆدا ڕابوردبوو ، وات دەزانی ئەومشت و مڕە لەخەوتایە ، کەچی خەو نەبوو ، تۆش هێشتا بەئاگا بویت ، چاوت کردەوە ، دوو تارمایت بەدی کرد ، یەکێکیان کاك عەلی و ئەوی تریان بە دەنگەکە یا هەلالەی کچی بوو . کاك عەلی ڕاست بۆوە بەرەو دەرگاکە ڕۆیشت ، دەستی بۆ سویچی کارەباکە گێڕا ، دی‌یەوە ، دایگیرسان کەچی هیچ .

- کارەباش نی‌یە ! ..

کاك عەلی بەهێواشی وای وت .. دەستی برد دەرگاکە بکاتەوە ، کلیل درابوو ، دەنگی بەربوونەوەی کلیلەکەت بەرگوێ کەوت .. ئەویش دانەوی‌یەوە .. چاوت بەتاریکای‌یەکە ڕاهاتبوو تارمایی هەموو شتەکانت دەدی ..

- ئای لەزەمینەی ژوورەکە چەند گەرمە !! تۆ وەرە دەستی لێدە .
- ئەوە چی‌یە بۆوا گەرمە ؟

کاك عەلی و کچەکەی ئەوقسانەیان لەگەڵ یەکترا دەکرد .

لەجێی خۆت ڕاست بویتەوە ، ئەویش کلیلەکەی دی‌یەوە ، خستی‌یە کونی کێلونەکەوە ، چرکەی کردنەوەی هات ، درزێکی خستە دەرگاکە ، دوای ساتێك تووند دایخستەوە ، چەرە دووکەڵ شالاوی بۆناو ژوورەکە هێنا .

- چ دووکەڵێکە ! ؟ هەستن ، خێرا ..

هەر کە کاك عەلی ئەو قسانەی لەدەم دەرپەڕی ئیتر هەموو ڕاست بوونەوە ، ژاوە ژاوتان تێ‌کەوت ، یەکێك ڕووەو پەنجەرەکان ڕایکرد ، بەهەر حاڵێك بوو تاکێکیانی کردەوە ، ئەوەش بووە هۆی دروست بوونی تەوژمی هەوا ، لەدرزوکون و کەلەبەری دەرگاکەوە دووکەڵ تەواو زیادی کرد ، ژوورەکە خەریك بوو وردە وردە قانگ دەبوو ، کۆکەتان تێ‌کەوت ، تۆش هەناسەت سواربوو ...

- با لەپەنجەرەکانەوە خۆمان دەرباز بکەین !

کاك عەلی وای وت و هەڵەتی بۆلای پەنجەرەکان برد ، ئێوەش وەك پێوەی بەسترابنەوە ، بەدوایدا چوون ، دوای نەختێك وتی :

- کە تیبەیان پێوەیە ، دەرچوونمان لەوێوە مەحاڵە .

گەڕایەوە لای دەرگاکەو ئێوەش بەدوایدا ، زانی ئەوە دوا ڕێگەیە ، دووکەڵ پەنگی خواردەوەو بەجارێك تەنگی پێ هەڵچنین ، لەولاتەوە زریکە هەستا ، دووان بوون

- مەیکەن بەهەرا دەستتانم بەنێ با لە قاپی‌یەکەوە دەرچین

هەر بەدەم ئەو قسانەشەوە کاك عەلی تۆشی گرت ، مەچەکی گرتین ، هەر سێ‌کتانی بەکێش کرد ، چوونە ئەودیو دەرگاکەو :

- دایخەنەوە

وای بەوانەی ژوورەوە وت ، گوێت لەزرمەی داخستنەوەکەی بوو .

- ئاخ قاچم شکا ..

دیار بوو یەکێك لەدوانەکەی ئەو دەستی بەربووکەوت ، جێتان هێشت ، ماوەیەك ڕۆیشتن ، هەستتان کرد دووکەڵەکە تەنك بۆوە ، هەر دووکتانی بەرداو بەکۆکەکۆك وتی :

- دەچم بەدوای ئەوانی تردا .. ئێوەش چەند دەتوانن ڕێك بڕۆن ..

ڕۆیشتن تا دەهات بەردەمتان ڕوون تر دەبۆوە ، بەرپێی خۆتان دەبینی ، بە دەنگی بەرز هاوارتان دەکرد ، بەڵکو ئەمە خوایە یەکێك بەدەنگتانەوەبێت . بێ پلیکانەتان هاتەرێ ، دەستتان لەدیوارو یەکتر بەرنەدەدا ، چەند پلەیەك چوونە خوارەوە ، ئەوەی لەگەڵتا بوو هەڵنوتاو خۆی بەتۆ گرتەوە ، تۆش خۆتدا بەسەر ئەو چەند پلەیەی کە لێی ڕەت‌بوون ، گیرسانەوە ، هەستانەوە ، کورتان دایەوە بەرخۆتان .. گەیشتنە خوارەوە ، بەردەمتان تەواو ڕووناك بۆوە ، چاوگی دووکەڵەکەتان لێوە بەدیار کەوت ، لەدەم دەرگای دەرەوە بوو ، کەنزیك بوونەوە ، سەیرتان کرد دووکەڵ و ئاگر لە شوێنی شاگردەکانەوە بڵند دەبێتەوە ، چیت‌دی ؟ خۆتت بۆ نەگیرا پڕ بەدەنگ قریشکانت ، ئەوەی لەگەڵیشتا بوو بۆی سەندیتەوە ، دوای ساتێك وەك یەکێك

دەمتان بگرێ یان دەست بنێتە بینتان ، هەر لەوکاتەشدا میوانەکانی تۆش پەیدا بوون وەك موویان بۆ هەڵکورووزابێ .. ئەمجارەیان وەك هیچ جارێکی تر نەبوون ، پەیدا بوونیان و مل سوڕاندنت پێکەوەبوو .

«ئەوە چی یە ئەمانیش پەلەیانە ؟ !» توند دەستت نایە سەرچاوت و هەوڵت داملت ڕاگری ، کەچی دەستت زۆر خۆی بۆنەگیرا ، توانای ئەما کۆچ بوو بەربووە ، سەرت سەمتی سوڕانی خۆی وەرگرت ، دوای ئەختێك کەوتە ڕەت بردن ، چاوت زەق‌بوون ، هەستت کرد ئەوەی لەگەڵتا بوو بەدەم قریشکەو هاوارەوە سەرتی‌گرت ، هەموو شتێکت دەبیست و لە هەمووشی بە ئاگابویت ، هەر ئەمجارە نا ، هەمووجار ، بەڵام چاوو سەرو دەستت بۆ دابین نەدەکرا .

نەك هەر بەخۆت بەڵکو بەوەی لەگەڵیشتایە و بەدەی وەك ئەویش ناتوانن دابینیان کەن و خۆیان لەئاستی ئەو ڕەت بردنەی سەرتا بگرن .. بەدەم گریان و قیژەوە باڵی چەپی گرتیت و بەکێشی دەکردیت ، لای ڕاستت لەجووڵەکەوت و بەربویتەوە ، کەچی ئەو دەست بەردارت نەدەبوو ، هەر ڕای دەکێشایت ، هەستت بە گەرمای‌یەکی زۆر دەکرد ، هەموو لەشت نیشتە سەر ئاو ، زەوی‌یەکە وەك زەمینەی گەرماوێك بێت کە بیست و چوار سەعات ئاگر لەبنیا ناڵە ناڵی بێ . ئەو بۆپێشەوە تەکانی پێ دەدایت ملیشت بەلای ڕاستا ، لات وابوو کە ملت سووڕێکی تەواو خولابێتەوە ، دەمووچاوی خۆتت پێش بین دەکرد کەبە چ جۆرێك گێرو گرژبوو .

«[illegible] واکردبوونەوە ، ڕەنگێکیان زاڵ بوو هەر ئەو مایەوەو ئەوابی تری سڕی‌یەوە ، وا ئەویش لەناوەڕاستی ئاگرو چەرە دووکەڵەکەوە بۆ ناو چاوم خلۆر بۆوە ، لەجووڵە کەوتم ، کەچی سەرم بۆ بەرز ناکرێتەوە ، دەڵێی ملم نەگرتووە ، وەك هەر جارێکی تر نەختێك خۆم گرت ، تاگوری تێ هاتەوە .»

کە تۆزێك بەسەر خۆ کەوتیتەوە ، کچە بوورەکەتت بەدی‌کرد ، لەلاتەوەکەوتبوو شەکەت ، بەئاستەم هەناسەی بۆ دەدرا ، لەناخی‌یەوە هەنسکی قووڵی دەدا .. کەوتیتە ڕاوەشاندنی .. زانیت بێ هۆشە ، تۆش دڵت تێکەڵ هات ، هێڵنجت دەدا ، یەك دوو قوڵپت هەڵهێنایەوە ، دەنگی ئاگر کوژێنەوەت بەئاستەم دەبیست .. «ئەی دوای ئەوە چی‌ڕوویدا ؟» هەر چەند مێشکی خۆت دەگوشی هیچی‌ترت بەبیر نایەتەوە .. کچە بوورەکەشت لەتۆ خراپتر ، ئەو ئەبڵەق بووە ، ئەو چاوەی لێتی بڕیوە نایتروکێنێ .. تۆش چاو بۆ خوشکەکانت بۆ بورت بۆکاك عەلی و کچەکانی تری دەگێڕی .. ئەوانە هیچیان ئەوان نین ، بە جلەکانیانا زانیت لەخەستەخانەن ، بەڵام چۆن گەپشتوون نازانی !! سەیرێکی کچە بوورەکەتت کردو دەمت هەڵهێنایەوە :

- ئەی ئەوانی تر کوان ؟

ئەویش هەمان پرسیاری بە چاو لێ دەکردی .

«بەڵام ئەو هەر ئەوە ناپرسێت ، من لەچاوی ئەوا دیمەنی شوێنی شاگردەکان بەدی‌دەکەم ، هەر دەڵێی دوای ئەو وێنەیە گلێنەکانی هیچی تریان نەشتۆتەوە ، ئەوە تا زەلامەکان بوونەتە زووخاڵ ، وەك خەڵوز ڕەش داگەڕاون و گۆشت بەسەر ئێسکیانەوە نەماوە هەمووی بۆتە قەرە برووت .» توند چاوی خۆت گرت ڕووت لەو وەرگێڕا .. هەر کەسێك بەلاتا بڕوێشتایا دامێنت دەگرت و پرسیاری خزمەکانتت لێ دەکرد ، ئەوانیش تێکرا لەسەرنجێك زیاتر هیچ وەڵامێکیان نەبوو .

تا دەمەو نیوەڕۆ وەختا بوو باڵ بگریتەوە ، هیچت لێ حاڵی نەبوو ، لەپڕێکا باوکت و دایکت بەپەشۆکاوی و ڕەنگ هەڵبزرکاوی بەژوور کەوتن .

- بابەگیان ، هاتی ؟ .. ئەی ئەواتی تر کوان ؟

باوکت خۆی بۆ نەگیرا ڕووی لێ وەرگێڕایت ، چاکەتەکەیت گرت و ڕات تەکاندو قیژانت :

- بابە .. لەگەڵ تۆم نی‌یە ؟ بۆڕووم لێ وەردەگێڕی ؟ بۆبۆ ؟

ئاوڕی لێدایتەوە .. وەڵامی پرسیارەکەتت لەفرمێسکەکانیا بەدی کرد .. بەری چاوت تاریك بوونەوە .. دیسان میوانەکانت گرد بوونەوە ، بەڵام ئەمجارە خۆیان هاویشتە ناو دڵۆپێك فرمێسکی گەورەی باوکتەوە .. لەناویا چەخما خەیەکیان داو ، لەگەڵ دەنگی گریەی دایکتا لەبەر گوێی تۆدا ئەوەیان دەگێڕایەوە کە چۆن کارەباکە لەپشت سەری شاگردەکانەوە شۆرتی کردووەو ئاگری لەوان‌بەرداوە .. فرمیسکە کە خزا ، ئەوان لەسەر ڕوومەتی باوکت لەجێی خۆیان مانەوەو ئەمجا لەسەر شێوەی (10) کەسەکەی لەمەڕ خۆتان خۆیان دەنواندو ئەو ساتەیان بۆ لێدەدایتەوە کە خەریکی تاسان و پیشان بوون لە دوو ژوورەکەدا ، تا هەناسەیان لەبەر برا .

# کۆمپیوتەر

ئەندازیاری کارەبایی :
برهان ئیبراهیم یەعقووب
هەولێر

**پێشەکی : ـ**

مرۆڤ لەکۆنەوە هەوڵیداوە بۆ ڕێکخستنی ژیانی خۆی کەوا باشترین داهێنان بهێنێتە کایەوەو دای بهێنێ ، کەبتوانێ تاڕادەیەك هەندێ ماندوو بوونو شەکەتی لەسەر خۆی کەم بکاتەوە ، چونکی لەژیانی ڕۆژانەیدا بەچەندەها کاری ژمێریاری هەڵدەستێو ئەمەش دووبارەو سێ بارەدەبێتەوە ... هتد .

جابۆ ڕێکخستنی پرۆسێسی ژمێریاری هەڵستایە بەداهێنانی خشتەی ئامادەکراوی « ماتماتیك » ی بۆ کۆکردنەوەو لێکدانو لێك دەرهێنان ، دابەش کردن ، وەبەمەش نەوەستا بەڵکو داهێنانەکی تری سازکرد ئەویش (ڕاستکی پێژمار) بوو « slide rule » کە توانی هەتا ڕادەیەك بەسەر هەندێ گیرو گرفتی ژمێریاریدا سەربکەوێ لەوانە دۆزینەوەی ڕەگ ـ توان ... هتد .

جۆن ناپیر John Napire توانی لەسالی 1617 ی زاینیدا ئامێرێك دروست بکات بۆ یارمەتیدانی کردارەکانی لێکدان .

زانای ماتماتیکی فەرەنسایی بلێز پاسکال Blaise Pascal ئامێری پرۆسێسی کۆکاری دروست کرد .

پاشان بەرە بەرە لەسەدەی حەڤدەهەم توانیان مەکینەی کۆکاری دابهێنن ، ئەو ئامێرە لە پەرە پێدان بوو توانیان چەند بەشێکی دیکەی بۆبکەنەوە ، تاوەکو بەهەندێ پرۆسێسی دیکە هەڵبستێ .

زانای ماتماتیکی ئینگلیزی چارلز بابیج Charles Babbage ئامێرێکی داهێنا بۆ شیتەل کردنەوەو بەکار هێنانی چوار کردارەکانی ژماردنو شێ کردنی هاوکێشەکانی جەبر .

لەوولاتە یەککرتووەکانی ئەمریکا ، لەسالی 1881 ی زاینی هەولیاندا لەلایەن زاناکانەوە بۆ پەرەپێدانو پێشخستنی مەکینەی کۆکاری کەبتوانێ هەندێ کێشەی شیتەل کردنەوەی هاوکێشەکانی ماتماتیك شێ بکاتەوە . هەتا سالی 1930 پیشەسازیی دروست کردنی ئامێرە پێژمارەکانو دەزگاکانی کۆمپیوتەر هەر لەسوڕی گەشەسەندنو پەرەسەندن دابووە.

تاوەکو جەنگی دووەمی جیهانی هەلگیرساو بارو دۆخێکی تازەی بۆ ڕەخسا ، زاناکان کەوتنە جموجوڵو خۆ تەیاردان لەچەند لایەنێك دەستی یارمەتیان بۆ درێژ کرا ، بۆ داهینانی ئامێرو دەزگای نوێ چونکە ئەوانەی کەهەبوون پێشتر لەگەل پێداویستو خواستی جەنگدا نەدەگونجان .

لەوکاتەدا یەکەم دەزگای نوێ بەدیارکەوتو ناوبانگی بە (ئاوەزی ئەلیکترۆنی) دەرکرد یانکۆمپیوتەر ، لەم دەزگایە نوێیەدا توانرا چەند ئامێرو جوغزی ئەلیکترۆنی تێبخرێت بۆ زیاد کردنی خێرایی یەکەی ، چونکە ئەو دەزگایانەی کەپێشتر بەکار دەهات بەهۆی ووزەی کەهرۆ ـ میکانیکی Electro — Mechanical ئیشی دەکرد ، بەلام دوای تێئاخنینی لوولەی ئەلیکترۆنی « Electronic — tube ترانیستۆر ، ووزەیەکیتر پەیدا بوو ، بەنێوی کەهرۆ موگناتیزی Electro — magnetic تا لەسالی 1948 دا یەکەم دەزگای کۆمپیوتەریان دابین کرد .

تاماوەیەك لەمەوپێش ئەو زانیارییانەو داتایانەی « Data » دەدران بەکۆمپیوتەر دەبا بەڕێگای (ئۆتۆمۆبیل ، فڕۆکە ، کەشتی) با چونکە هەتا ئەوکاتە ئەندازەی پێوەندی داری ئەوەندە پەرەسەندنی بەخۆیەوە نەدی بوو ، بەلام لەماوەیەکی کەمدا ، تەلەگراف ، تەلەفزیون ، ئامێرەکانی تەلیو بێتەلیو مانگی دەس کرد پەیدابووو پێویستی نەما بەئۆتومۆبیل یافڕۆکە پرۆگرامو زانیاریەکان بنێرن . بەڵکو بەشێوەی بروسکە ، تەلیکس ئامێری تەلیو بێ تەلی دەنێردرێن وەئەنجامەکانیش هەربەم شێوەیە وەردەگیرێن .

## مرۆڤو کۆمپیوتەر

مرۆڤو ژیاری کۆمەڵگای مرۆڤایەتی زۆر سوود لەکۆمپیوتەر وەردەگرێ ، چونکە بەهەندێ کاری گەورە هەڵدەستێ ، کەمرۆڤ لەتوانایدا نییە بەڕۆژێكو دوو ڕۆژ بەڵکو بەمانگێكو دوو مانگ بەئەنجامی بگەیەنێ .

بەکارهێنانی کۆمپیوتەر لەبوارەکانی ئەندازیاریو زانیاری سروشتو پێشکەوتنی تەکنولۆجی ، سەرکەوتنێکی گەورەیە بۆکۆمەڵگای مرۆڤایەتی ، کۆمپیوتەر لەتوانای دا هەیە کەکاری وا بەئەنجام بگەیەنێ وە بەخێراییەکی ئەو تۆکە بەبارتەقای ملیۆن جار خێرای مرۆڤە کەقاقەزو پێنووس بەکاردێنێ ، بەلام خێراییو وورد بوونەوە بەلگەنینو بەس ،

بەڵكو كۆمپیوتەر توانیویەتی هەندێ بكات كەلەتوانای مرۆڤ دانەبووە بەكردەوە ، توانی ڕۆكێت بنێرێ بۆ ناو مانگو بارام .

مرۆڤ ناتوانێ ئەم ئامێرە لەڕاژەی خۆی دابنێ بۆ شێتەڵ كردنەوەی گیروگرفتەكانی ئەگەر هاتو خۆی ئەو شتانەی دەوێ دیاری نەكاتن ، چونكە شۆڕشی تەكنولۆجی كەكۆمپیوتەر دیاردەیەكی سەرەكی ی بەرامبەر ئەمەش شان بەشانی شۆڕشی زانستی تە[illegible]ۆلۆجیو شۆڕشی فیكری پەرەی سەندووە .

مرۆڤ توانی هۆشو بیری زانستی خۆی زیاتر پەرەپێبدا چونكە سەرنجدانو خێرایی زۆر بووو هەرچەندە بەكاری گەورە هەڵستا بەلام ناتوانێ بەرامبەر بیری زانستی مرۆڤ بوەستێت وەلە هیچ كاتێكیشدا شوێنی مرۆڤ پڕناكاتەوە ، بەلام بەپێچەوانە هەردەم لەڕاژەی مرۆڤو كۆمەڵگای مرۆڤایەتی یە چونكە زیاتر هانی داوە بۆ زیاد كردنی بەرهەمو پاڵی پێوە ناوە بۆ دانانی پلانو نەخشەی وورد ووردو زیرەكانە .

بەرە بەرە كۆمپیوتەر خۆی گرتو وای لێهات بەكاربێت لەهەموو شوێنێكدا بەتایبەتی لە ئامادەكردنی داتاكانی ڕاپۆرتی ساڵانە وای لێهات كەزیاتر بەخێرایی بەئەنجام گەیاندنی ئیشو كاری كارگێڕی بدات بەتایبەتی لەكۆڕو دەزگا گەورەكاندا ، هەروەها بەكاردێت بۆ یاریدەدان لە هەڵسوڕاندنی كاروباری كارگەكانو بۆدۆزینەوەی خاڵە ناسازو ناهەموارەكانو بۆ چاوەدێری كردنی بەرهەمی باش ، وەلە پرۆگرامی فێركردنو مەشقدان لەئیشو كاری هات چۆو پرۆگرامەكانی ئیش كردنو شێتەڵ كردنو ڕێكخستنو تۆژینەوەی زانیاری .

**پێناسەی ئامێری ئاوەزی ئەلیكترۆنی**

لێرەدا ئێمە ناتوانین پێناسەیەكی تایبەتیو سەرتاپاگیر بكەین ، چونكە لەهەموو بارو دۆخێك بەكار دێت ، بەلای ئەندازیار بەشێوەیەكو بەلای ژمێریار بەشێوەیەكی تر ، لەلایەن گەورە پیاوانی زانیاری وەك ، فیزیك ؛ ماتماتیكو پسپۆرەكانی زانیاری سروشت ، بۆ سەر ژمێری ژمارەی دانیشتوانو داهاتی دەوڵەتو ئیتر هەریەكە پێناسەیەكی تایبەتی خۆی هەیە .

بەلام بەشێوەیەكی گشتی كۆمپیوتەر ئامێرەكی ئەلیكترۆنیە كەداتا « Data » وەردەگریو لەرێگای خواستنی پرۆگرامێكی دیاركراودا هەڵدەستێ بەپرۆسێسی چارەسەر كردنی داتاكان ، لەدوایی‌دا هەر بەشێوەی پرۆگرام ئەنجامی دەدا .

**دەزگای كۆمپیوتەر لەچی پێك دێ ... ؟**

دەزگای كۆمپیوتەر دابەشی پێنج یەكەی « unit » جیا جیا دەكرێ .

1 – یەكەی خستنە ژوور Input unit
2 – یەكەی عەمبار كردن storage unit
« وەبیر هاتنەوە » or remember unit
3 – یەكەی ماتماتیك Arithmatic unit
4 – یەكەی كۆنترۆڵ control unit
5 – یەكەی خستنە دەر output unit

« ئەنجام » كۆمپیوتەر داتاكان Data زانیاریە داواكراوەكان وەردەگرێ بەپێی پرۆگرامێكی ڕێكو پێك ، ڕاپەڕاندنی لەسەر بناغەی ئەو داتایانە . لەپاشان دەرچواندنی ئەنجامەكە كە ئەویش بەشێوەی بەرنامەیەكی ڕێكو پێكە كەواتە سوڕی بنەڕەتی كۆمپیوتەر بەم شێوەیە .

1 – خستنە ژووری داتاكان
2 – چارەسەر كردنی داتاكان
3 – دەرچواندنی داتای نوێ

ئەنجام دەرچواندن ← پرۆسێسەكانی ← خستنە ژوور
output ماتماتیكی Iuput

بەلام دەتوانین بەشێوەیەكی دیكە وێنەكێشی بكەین پرۆسێسەكان شیبكەینەوە




لێرەدا دەتوانین هۆشی مرۆڤ لەگەڵ هۆشی كۆمپیوتەر بەراورد بكەین .

ئەگەر یەكێك ویستی پرۆسێسێكی ژمێریاری بكات چەند زانیارییەك وەردەگرێ وەك : ژمارەكان ، پیشەكان ، جۆری

پرۆسێسەکان کە داواکراوە بیانکات ئەو زانیاری یەش بەشێوەی نووسین یان زارەکی وەردەگرێ جالێرەدا « چاوگوێ » دەچێتە یەکی « خستنە ژوور » دوایش چەمکەکە دەگوێزرێتەوە بۆ ناوەوەی مێشك کەبەرامبەر (یەکەی پرۆسێسەکان) ە دوا بەدوای مێشك ئەنجام دەردەچێ جا چ بەدەم یان بەدەست ، جالێرەدا دەستو دەم بەرامبەر یەکەی دەرچواندنی زانیاری یەکەن .

**ئامادە کردنو شێتەل کردنی گیرو گرفتێك**

لەکاتێکدا هەر کۆرو دەزگایەك یان تاکە کەسێك دەیەوێ گیرو گرفتێك شی بکات یان بەرنامەی کارێك ڕابهەڕێنی بەم پێنج هەنگاوانەی خوارەوەدا تێدەپەڕێ .

1—پێناسەی کێشەکە : واتە دیارکردنو وەسف کردنی بە زمانێکی پاراوو بەڕێگایەکی تەواو بەپێ ی توانا

2—شیٚ کردنەوەی کێشەکە : مەبەست لە دابەش کردنی گیرو گرفتەکە بۆ چەند پرۆسیسێکی دیارکراو پێویستە پێ ی هەلبستین ئامادەی بکەین بۆ هێنانە ئەنجام .

3—دانانی بەرنامە : مەبەست لەدانانی بەرنامە واتە بەرنامەی کار بە زنجیرەیەکی ڕێكو پێك لەپرۆسێسە دیارکراوەکان ، بەدرێژی تیاداچی داوا کراوە ڕێك دەخرێت .

4—ڕاپەڕاندنی شیٚ کردنەوەی کێشەکە : لەم هەنگاوەدا ڕاپەڕاندنی ئەو پرۆسێسە دیارکراوانە کە لەکاتی دانانی بەرنامە ڕێك خرا.

5—پاراستنی دیکۆمێنتی کێشەکە : کۆکردنەوەی ئەو زانیاری یانە کەتایبەتیان بەگیرو گرفتەکەی هەیەو کۆکردنەوەی تێبینیەکانو دانیان لەیەکە یەکەی تایبەتی ناو کۆمپیوتەر بۆ ئەوەی کەسەکەو کۆمپیوتەرەکە خۆی بۆ جارێکی دیکە بگەڕێتەوە سەریان ئەگەر پێویستی هەبوو .

**کۆمپیوتەر چۆن کار دەکات : ـ**

هەروەك لەوە پێش وتمان کۆمپیوتەر هەڵدەستێ بەوەرگرتنو ئیش پێ کردنی زانیاری یەکانو دەرکردنی ئەنجام ، چ بەشێوەی ژمارە یا بەشێوەی « تعلیمات » بن ، مامەلەیان لەگەل دەکرێ بەتەنی ئەلیکترۆنی وەك ترانسیستۆر زمانەی ئەلیکترۆنی ، خانەکانی موگناتیزیو تەل کەهەلدەستێ بەگەیاندنیان .

وەهەروەها ئەو تەنە ئەلیکترۆنیانەش هەلدەستن بەعەمبارکردنو کرداری جولاندنەوەی زانیاری یەکان بەهۆی نیشانەی ئەلیکترۆنی Electronic — signal . پاشان ئەم زانیاری یانە تۆمار دەکرێن پاش جیا کردنەوەیان بۆ یەکەی بچووك بچووك کەپێ ی دەوترێ (bits) ، بەڕێگای دەرخستنو وون بوونی نیشانەی ئەلیکترۆنی لەیەکێ لەو تەنانەی باسمان کردن .

ئیش کردنی ئەم شێوەیە پێ ی دەووترێ Binary made یانی شێوەی « جووت ڕەگەزی » چونکە ووشەی Binary بەمانای « لە دوو ڕەگە » پێك دێت ، وە ئەم شێوەش دەشێ کرداری داگیرساندنو کوژاندنەوەی چرایەکی کارەبایی بێت یان کردنەوەو داخستنی سویچێکی کارەبایی بێت کرداری ئیش پێکردنو راوەستاندنی تەزووی کارەبا بێت کەبەناو تەلدا دەڕوا یان جەمسەری پۆزێتیفو نێگەتیفی تەنێکی موگناتیزی بێت .

کەواتە سیستەمی جووت ڕەگەزی Binary system تەنیا دوونیشانە بەکاردێنێ نیشانەی « ٥ » کەبۆ گۆڕینو نواندنی وون بوونی بەهایەکی دیارکراودا دێت .

نیشانەی دووەم « 1 » کەبۆ دەرکەوتنو ئامادە بوونی بەهایەکی تر بەکاردێك بۆ نموونە .

| | نیشانەکەی |
|---|---|
| داگیرساوە | 1 |
| کوژاوەتەوە | ٥ |

**« کۆمپیوتەر چۆن مامەلە لەگەل ژمارەو پیت دەکا »**

لەیاساکانی ماتماتیك چەند سیستەمێك هەیە وەکو سیستەمی دێسمەل کەبناغەکەی دەکاتە (10) ، یان سیستەمی ئۆکتال هەیە کەبناغەکەی (8) ە .

وەهەروەها ئەمانی تریش . بۆنموونە ئەگەر ئەم ژمارەی خوارەوەش بکەیتەوە لەسەر بناغەی « دێسیمل » بەم جۆرەیە :

$$(148)_{10} = 1 \times 10^2 + 4 \times 10^1 + 8 \times 10^0$$

$$10 = 100 + 40 + 8$$

هەروەها سیستەمی ئۆکتالیش دەتوانین بەم جۆرەی خوارەوە شیٚ بکەینەوە .

$$(148)_8 = 2 \times 8^2 + 2 \times 8^1 + 0 \times 8^0$$

$$= 132 + 16 + 0$$

بەلام کۆمپیوتەر مامەڵە لەگەڵ دوو نیشانە دەکات جالێرەدا دەتوانین هەر ژمارەیەك بناغەکەی چ بێت دەتوانین بیگۆڕین بۆ سیستەمی جووت ڕەگەز .

بۆ نموونە ئەم ژمارەی خوارەوە دەگۆڕین لە سیستەمی دێسیمل بۆ جووت ڕەگەزی .

$(13)_{10}$

پایان

| | | |
|---|---|---|
| | 1 ← ماوە | 1 _ 13/2 = 6 |
| | = →0 | 2 _ 6/2 = 3 |
| ↑ | ماوە → 1 | 3 _ 3/2 = 1 |
| سەرەتا | 1 ← ماوە | 4 _ 1/2 = 0 |

کەواتە ژمارە تازەکە بەم شێوەی خوارەوە دەنووسرێت

$(1101)_2$

بەپێی ئەم گۆڕینە دەتوانین ژمارەکان بنووسین

| Binary (2) | Decimal (10) |
|---|---|
| 0 | 0 |
| 1 | 1 |
| 10 | 2 |
| 11 | 3 |
| 100 | 4 |
| 101 | 5 |
| 110 | 6 |
| 111 | 7 |
| 1000 | 8 |
| 1001 | 9 |

بلیتی کون کراو : Punching cards

ئەم بلیتە هۆیەکی سەرەکیە بۆ خستنە ژووری واتاکان و وەرگرتنی ئەنجام بلیتەکەش بەم شێوەی خوارەوەیە :

| | | |
|---|---|---|
| 12 | | |
| 11 | 08 | 1234 |
| 1 | 00 | 0000 |
| 2 | 11 | 1111 |
| 3 | 22 | 2222 |
| 4 | 33 | 3333 |
| 5 | 44 | 4444 |
| 6 | 55 | 5555 |
| 7 | 66 | 6666 |
| 8 | 77 | 7777 |
| 9 | 88 | 8888 |
| 10 | 99 | 9999 |

هەروەك ئاشکرایە کە ئەم بلیتە لە (12) ڕیزو (80) کۆڵەگە پێکهاتووە ، بۆ نووسین و تۆمار کردنی هەرژمارەیەك کۆمپیوتەر بەهۆی ئامێری ئەلیکترونی دەتوانێ کونیان بکات م کونی ژمارەکان Numeric Punch لە (0 — 9) بە ڕیینەکان Zone punch لە (0 ، 11 ، 12) ئەگەر هات و بو نیسی پیتێك لە (اەمەتایێ) یان لە B←A دوو کون بەکار دێن یان زیاتر ئەگەر هات و ریزی (12) بەکارهات و کونێکی دیکە کرا لەریزی (1) ، لێرەدا دەتوانین تیپێك لەتیپەکان دەربیبڕین ، ئیتر بەم هۆیە دەتوانین (27) تیپ بنووسین (3 × 9) ئەمەش بەسە بۆ نووسینی تیپەکانی لاتینی کە (26) تیپن .

فەرهەنگۆك

| | | |
|---|---|---|
| . ڕاستکی پێژمار | المسطرة الحاسبة | Slide rule |
| ئەندازەی پێوەندیدار | هندسة الاتصالات | Communication Eng. |
| زمانەی ئەلیکترۆنی | صمام الكتروني | Electronic tube |
| داتا | معطيات ـ بيانات | data |
| بارام | مريخ | |
| دیکومێنت | وثائق | |

سەرچاوەکان


1 — د . احمد حسين فرغلي . علم الحاسب الالكتروني ـ لغة الفورتران ج، . الهيئة المصرية العامة للكتاب ـ القاهرة ـ 1978 .

2 — د . مهندس عبدالرحيم بصلة . مقدمة الى علم الكومبيوتر مراجعة د . يحى الحكيم . الهيئة العامة للكتاب .

3 — چەند محازەرەیەکی بەشی ئەندازەی کارەبایی سەر بەزانکۆی تەکنۆلۆژی ـ بەغدا ـ کەبەڕۆنیۆ چاپ کراوە .

# هەناسە تەنگی منداڵان

# Asthma in Children

نووسینی : د. پیتەر دی فیلان MD,FRACP

وەرگێڕانی لە ئینگلیزی یە وە :

«ئاراس عەزیز عەبدوڵڵا»

هەناسەتەنگی (الربو ـ تەنگەنەفەسی ـ Asthma) باوترین نەخۆشی درێژ خایەنی (مزمن) کۆئەندامی هەناسەیە لەتاف منداڵێتی دا . هەناسە تەنگی دەتوانێ گیروگرفت و ناتەواوی گەورە درووست بکات ئەگەر بەرێك و پێکی چارەسەر نەکرێ .

بەلایەنی کەمەوە ، لەسەدا بیستی ٪20 منداڵان لە ئەنجامی هەناسە تەنگی یەوە ئەخیزێنن Wheezing لە چەند ماوەیەکی منداڵێتی دا . لەسەدا شەستی ٪60 ئەم منداڵانە زۆرترین گیروگرفت کە دەربکەوێ بریتی یە لە خیزە خیزی سنگ ، وە زۆربەی حاڵەتەکان پەنا نابەنە بەر چارە کردن و بەتەشخیس نەکراوی دەمێننەوە . زۆر منداڵ لەم حاڵەتە سووکەی هەناسە تەنگی دا بە (هەو کردنی بۆرێچکە هەوای خیزەیی) دەناسرێن . بۆ چەند ساڵێك لەمەوبەر ئەم حاڵەتە سووکە بەشێوەیەکی وا دەزانرا کە حاڵەتێکی جیاوازە لە هەناسە تەنگی ی . ئەو منداڵانەی کە تەمەنیان لەنێوان سێ هەتا حەوت ساڵی دایە زۆرتر نارەحەتن بە خیزە خیزی سنگ و زۆربەی دەرکەوتنی هەناسە تەنگ بوون نەخۆشی ڤایرۆسیانەی لەگەڵدایە ... ئەمە وای کرد کە بگەنە ئەو ئەنجامە هەڵەیەی کە

گوایە هەموو نیشانەو گیرو گرفتەکانی نەخۆشەکە لە ئەنجامی نەخۆش کەوتنی (تێپەڕگـە هەنـاسـەیی خـواروو) سەر هـەڵ دەدەن ، هـەر لەبەر ئـەمـەش بـەهـەڵە بـەکـارهێنـانی دژە زیندەییەکـان (Antibiotics) تەنهـا ڕێگەی چـارەکردن بـوو . لەڕاستیدا پێکهێنـەرەکانی بـەشی خوارەوەی کـۆئـەنـدامی هەناسە تووشی تەسك بوونەوەی بۆڕیچکە هەواییەکان دەبن کە ئەمەش لە ئەنجامی سێ هۆکارەوەیە کە لە هەموو نەخۆشە هەناسە تەنگەکاندا هەن :

یەکەم : تەشەننوجی ماسوولکەی بۆڕیچکە هەواییەکان .
دووەم : زۆر ڕژانی شلەی لینج (میوکەس Mucus)
سێ‌هەم : ئاوسانی ناو پۆشە پەردە Mucosal Swelling

پێنج لەسەدی ٪5 ئەم مندالانە لەبیست جار زیاتر تووشی ئەم خیزە خیزە دەبن لە ماوەی چەند ساڵێکدا . لە هەر دووسەد منداڵ یەکێك (کە دەکاتە یەك منداڵ لە چل منداڵی هـەناسـە تـەنگ) تـووشی گیرانێکی سـەختی تێپەڕگـەی هەوایی دەبن کەڕەنگە بۆ چەند مانگێك یان تەنانەت بۆ ساڵ بخایەنێت .

**سێکس (نێرو مێ)** :- تووش بوونی کورو کچ لەم نەخۆشی‌یەدا وەکو یەکە هەرچەندە نێر زیاتر تووشی هەناسەتەنگی‌ی درێـژ خایەن دەبێ . لە ماوەی هەرزەیی‌دا کچان کەمتر بەرەو چاك بوون دەڕۆن وەك لە کوڕان‌و ، لەسەرەتای کامڵ بـوونیشدا هیچ جیاوازی‌یەك لە نێوان نێرومێدا نامێنێت .

**ڕێـژەی مردن** :- زۆربـەی حـاڵەکـانی مـردن لە هـەنـاسـە تەنگی‌یدا لەو مندالانەدا ڕوو دەدات کەنەخۆشی‌یەکی درێژ خایەنی سەختیان هەیەو تووشی نارەحەتی‌یەکی خێراو کت‌و پڕ دەبن‌و دەست بەجێ پێش چارە کردن دەمرن . هەندێـك جار منـداڵەکـە پـاش حـاڵەتێکی تـونـدو خێـرا لە ئـەنجـامی - چارەکردنێکی ناتەواوە لە نەخۆش‌خانەدا دەمرێ .

**نیشانەو دۆزینەوەکان‌و تەشخیس کردن** :- جگە لە هەناسە تەنگی‌ی ، چەند حاڵەتێکی کەمی دیکە هـەن کە دەبنـە هۆی خیزە خیزێکی سەر هەڵدەرەوە Recurrent Wheezing لەمندالاندا . لەبەر ئەوە تەشخیسی نەخۆشی‌یەکە Diagnosis زۆر کەم گرانی‌ی تێدایە ئەگەر زانیاری‌یەکی باش لە نەخۆشەکە (یان کـەس‌و کاری) وەربگیرێ ، تەنانەت ئەگەر منداڵەکـەش لە حاڵەتێکی هەناسە تەنگ بووندا نەبینرێت . پێویستە شیانی (احتمالی) گیرخواردنی تەنێکی غەریب .F.B لەبیر نەکرێ لە بۆری هەوای مندالێکدا کە تازە بێ‌بگرێ‌و تووشی یـەکەم خیـزە خیز بێ . ئەگەر باسی قووت‌دان لە ئارادابێ ، یا نایەکسانێتی‌یان بوونی دەنگەکانی هەنـاسـە Breath Sounds لە هەر دوولای سنـگدا ، پێویست بەوە دەکات کە تیشکی ئێکسی (اشعة) سنگ بگیرێ لە هەردوو حاڵەتی هەناسە وەرگرتن‌و Inspiratory هەناسە دانەوەدا expiratory . هەندێك جار نەخۆشی فـایبرۆسسی کیسـەیی Cystic fibrosis لەمنـداڵدا نیشانـەکانی لەنـەخۆشی هـەنـاسـە تەنگی دەچێ . ئەم جۆرە مندالانە پێویستە ڕەوانەی نەخۆش خانەی مندالان بکرێن بۆ بەجێهێنانی (تاقی کردنەوەی ئـارەق کردن Sweat test بەشێوەیەکی ڕێك‌و تەواو .

**پشکنینەکان Investigations** :-

یەکەم : تیشکە ئێکس (اشعة) .

ئەو مندالانەی کە زیاد لەڕادەی ئاسایی خیزەی سنگیان هەیە پێویستە فلیمێکی پێشـەو پشت Anteroposteriorو تەنیشتی lateral بگیرێن بۆ دڵنیابوون لە نەگیرانی بـۆڕیچکەکـانی هەوا بەهۆی حاڵەتەکانی جگە لە حاڵەتی هەناسە تەنگی‌ی . لەکاتی هاتنی هەناسە تەنگ بووندا ، بەدەگمەن پێویست بەوە دەکات فلیمی‌تر بگیررێ ئەگەر شیانی (مضاعفات) لەئارادا نـەبێ . کـۆبوونـەوەی هەوا لەنێـوان سی‌و پەردەی دیـواری سی‌دا Pneumothorax هەوکردنی سی Pneumonio زۆر باو نین لە نەخۆشی هەناسە تەنگی‌یدا .

دووەم : خوێن پشکنین .

شی‌کردنەوەی سەر تاپای خوێن C.B.Analysis بـەدەگمەن پێویستە .

سێ‌هەم : تاقی‌کردنەوە پێستی‌یە حەساسێتی‌یەکان Skin allergy tests .

بەدەگمەن سوود بەخشن‌و پێویستە بە ڕۆتینی نەکرێن . وەرگرتنی مێژوویەکی باش دەربارەی نەخۆشی‌یەکە ئەو مادە

حەساسیەت درووست کەرانە دەردەخات کە بوونەتە هۆی نەخۆشی یەکە . هەروەها کۆمەڵێك لە تاقی کردنەوە پێستی یەکان زۆرجار ئەنجامێکی پۆزەتیف (موجب) دەدەن بە دەستەوە بۆ ئەو مادانەش کە نەبوونەتە هۆی نەخۆشی یەکە . گەر منداڵێك بناڵێنێ بەدەست گیرو گرفتی هەناسەیی یەوە ، هەندێك جار تاقی کردنەوە پێستی یەکان بەڵگەی ئەوە دەدەن بەدەستەوە کە حاڵەتێکە لە حەساسیەت هەبوون . تاقی کردنەوەی دژەتەنی ئی IgEو تاقی کردنەوەی «راست» (Radioallergosorbent test) RAST بێ سوودن لە چارەسەرکردنی هەناسە تەنگی ی منداڵاندا .

چوارەم : تاقی کردنەوەکانی فرمانی سی یەکان :

ئەو منداڵانەی کە تەمەنیان لەهەشت ساڵ زیاترە کردنی ئەم دوو تاقی کردنەوەیە بەسوودن :

- دەرهێنانی بەرزترین بڕی ئەو هەوایەی کە لە هەناسەدانەوەدا دێتە دەرەوە (Peak Expiratory Flow) PEF .
- دەرهێنانی بڕی ئەو هەوایەی کە لە یەکەم چرکەدا لەئەنجامی هەناسە دانەوەیەکی بە زۆردا دەکرێتە دەرەوە FEV 1

بۆ منداڵێك لە هەشت ساڵ کەمتر ئەمانە بێ کەڵکن .

دیاری کردنی ئەمانی تەسکی و گیران لەبۆریچکەکانی هەوادا پاش بەکار هێنانی دەرمانێکی لە سمپەساوی چوو (Sympathomimetic) بەڵگەیەکی بەسوودە لە تەشخیس کردنی هەناسە تەنگی ی منداڵاندا . هەندێك جار ، هەندێك منداڵ کە هەناسە تەنگی ی یەکی درێژ خایاندووی سەختیان هەبێ ئەم جۆرە دەرمانانە چاریان ناکات ئەگەر لەوەو پێش دەرمانی کۆرتیکۆستیرۆدەکان بۆ چەند رۆژێك بەکار نەهێنرابێ . هەروەها تاقی کردنەوەکانی فرمانی سی یەکان بەسوودن لە قەبلاندنی گیرانی تێپەڕگە هەوایی یەکان . بەجێهێنانی ئەم تاقی کردنەوانە تەنها یەك جار ، سوودێکی ئەوتۆیان نیە چونکە هەناسە تەنگی ی سرووشتی گۆڕاوی هەیە . وا باش ترە رۆژی دووجار تاقی کردنەوەی PEF بکرێ .

**چارە سەر کردنی نەخۆشی یەکە :-**

سەر هەڵدانی دەرمانە تایبەتی یەکان لەم پانزدە ساڵەی دوایی دا شۆڕشێکی گەورەی نایەوە لە چارە سەرکردنی هەناسە تەنگی ی منداڵاندا .

لەگەڵ ئەمەشدا ئەمانەی خوارەوە بەرامبەر سوودی ئەو دەرمانانە ـ دەوەستن :ـ

یەکەم : چەند شتێکی گشتی :ـ

بوڵابردنی دوو دڵی و نارەحەتی دەروونی ی ، زۆر پێویستە دایك و باوك و ئەو منداڵانەی کە گەورەن باسی سرووشتی نەخۆشی یەکەیان بۆ بکرێ ، چۆنێتی رۆیشتنی نەخۆشی یەکە ، هەروەها لە چ کاتێدا دەرمان بەکار بهێنرێ . زۆربەی گیروگرفتی هەڵچوون لە منداڵاندا کە هەناسەتەنگی یان هەبێ دەتوانرێ بە ئامۆژگاری کردن و رێ نیشاندانێکی باش نەهێڵرێ .

دووەم : خۆدوور خستنەوە لە ئەلێرجینەکان :ـ

ئەلێرجینەکان ئەو مادانەن کە بوونەتە هۆی حەساسیەت دروست بوونەکە وەك تەپ و تۆزو پەرو کەڕووەکان (Fungi) . ئەم هەنگاوە زۆر بە فراوانی پەیڕەو دەکرێ . هەرچەندە سوود نەبینراوە لە پەیڕەو کردنی زۆر خاوێن کردنەوەو بەکارهێنانی پشتی و پێخەفی دوور لە ئەلێرجین . زۆربەی باوان لەوە ئاگادارن ئەگەر دەوروبەرە ئەلێرجینەکان گرنگ بن وە ئەگەر ئەمە تاقی کرابێتەوە ئەوا هەنگاوێکی گەلێك بەکەڵکە لە نەهێشتنی تەنگ بوونی هەناسەدا .

سێهەم : کەم کردنەوەی حەساسیەت :ـ

ئەمە وادەرکەوتووە کە کاریگەری یەکی سوود بەخشی درێژخایەنی نەبێ لە رۆیشتنی هەناسە تەنگی ی منداڵێتی و ، ناتوانرێ بەکار بهێنرێ .

چوارەم : پرۆگرامی وەرزش کردن :ـ

وەرزش ، بەتایبەتی مەلەکردن ، زۆر بە فراوانی بەکار هێنراوە . بێگومان ئەمانە سوودێکی دەروونی یان هەیە نەك سوودێك لەڕەوکردنی نەخۆشی یەکەدا . مەلەکردن زۆر کەم بەرپرسیارە بۆ درووستکردنی تەشەنوجی بۆری یەکانی هەوا ، بەڵام چالاکی یاری کردن و ڕاکردن بۆ ماوەی کەم کەم دەتوانرێ نەخشە بکێشرێن بەبێ ئەوەی ببنە هۆی زیاتر کردنی تەشەنوجەکە Spasm . هەڵمژینی دەرمانێکی وەك لە رژێمی سمپەساوی چوو یان سۆدیۆم کرۆمۆگلایکەیت ، پێش وەرزش

کردن دەتوانێ نەهێڵێ بۆڕییەکانی هەوا تەسک ببنەوە .

پێنجەم : چارەکردن بە دەرمان :-

ئەو دەرمانانەی لە نەخۆشی هەناسە تەنگیی منداڵاندا بەکار دەهێنرێن لە خشتەکەدا تۆمار کراون . دەرمانی لەڕژێمی سمپەساوی چووی نوێ بەشێوەیەکی تەواو بێ زیانن و ، وا دەردەکەون وەکو یەك کاریان هەبێ . لەبەر ئەوە ئەگەر منداڵێك بە بەکارهێنانی بڕی تەواوی دەرمانێکیان وەڵامی نەبێ (لەڕێگەی دەمەوە بەکار بێ) ئەوا بەکار هێنانی دەرمانێکی تر سوودی نیە .

لەگەڵ ئەوەشدا لەرزین Tremor و زۆر چالاکیی لەتەنیشتەکارەکانی Side — effects باوی یەك دەرمانن نەك دەرمانێکی تر . لەم حاڵەدا واباشە دەرمانێکی دیکە بەکار بهێنرێ . بڕی ئەو دەرمانەی بەڕێگەی هەڵمژین بەکار دێ زۆر کەمترە وەك لەوەی بەخواردن بەکاردێ ، وە هەروەها کاریگەر تریشە . لەبەر ئەوە هەڵمژین Inhalation باشترین ڕێگەی ویستراوە لە چارەکردندا .

دەرمانەکانی تری وەك دژە هستامینەکان ، کۆکە سەرکوت کەرەکان Cough Depressants ، بەڵغەم دەرهاوێژەکان expectorants ، دژە زیندەگییەکان Antibiotics زۆر بەشێوەیەکی فراوان بەکار دەهێنرێن لە هەناسە تەنگیی منداڵاندا ، بەڵام کاریگەرییان نیە . دژە زیندەگییەکان لەهەموویان زیاتر بۆ نەخۆش دەنووسرێن بەتایبەتی ئەوانەی کە نیشانەی هەبوونی نەخۆشی سی یان هەیە لەگەڵ هەناسە تەنگییەکەدا .

ڤایرۆسە نەخۆشی هۆ کارێکی بلوە بۆ سەرهەڵدانی حاڵەتی هەناسە تەنگ بوون ، بەڵام بەڵگە نیە کە بەکتیریا هەمان هۆکاربێ . نەخۆش کەوتنی لاوەکییانەی بەکتیریایی Secondary bacterial infection زۆر باو نیە لە هەناسە تەنگیی داو هیچ بەڵگەیەك نیە کە ببێتە هۆی مانەوەی هەناسە تەنگیی وەك نەخۆشییەك . دژە زیندەگی یەکان کاتێك زۆر بەکار دەهێنرێن کە منداڵەکە بکۆکێ و خشە خش و خرەی ڕەق یان خیزە خیزێکی نزم لەسنگیدا بەسەماعە ببیسترێ پاش چەند ڕۆژێك لە حاڵەتەکە . ئەم نیشانەیە بەشێوەیەکی سادە ئەنجامی زۆر درووست کردنی شلەی لینجی میوکەسە Mucus کە خاڵێکی تایبەتە بە نەخۆشی هەناسە تەنگیی .

مەبەستمان لە تەندروستی شیر (Milk hygiene) ئەوەیە کە شیر بە ڕێگەیەکی تەندروستیانە لە ئاژەڵ وەربگرین و بیگەیەنینە ئادەمیزاد بە شێوەیەکی تەندروستی ئەگەر بێت و بە شێوەی سروشتی خۆی بێت یاخود گۆڕا بێت بۆ بەرهەمەکانی تری وەکو پەنیرو ماست و کەرەو شیری توز .... هتد .

## گرنگی شیر وەکو خۆراکێك :

شیر خوراکێکی گرنگ و تەواو وبێ هاوتایە چونکە پێکهاتووە لە چەند ماددەیەکی گرنگی وەکو برۆتین و ڕۆن و ئەنزیم (Enzyme) وڤیتامین و شەکری لاکتۆز خوێی کانزایی و ئاو کە بە ڕەگەزی یەکەمی ژیان دادەنرێت ، ئەم ماددانە هەموویان کاری خۆیان دەبینن لە بنیات نانی لەشی ئادەمیزادو یارمەتی زیندە چالاکیەکانی دەدەن و پێویستی کۆئەندامەکانی دابین دەکەن و دەیپارێزن لە جۆرەها نەخۆشی .

لەڕووی تەواوییەوە هیچ خوراکێك نیە بگات بە شیر نەك هەر لەبەرئەوەی ئەم ماددە گرنگانەی تیایە بەڵکو گرنگ تر لەوە ئەوەیە کە ئەم ماددانە بە شێوەیەکی هاوسەنگ لەناو شیر بڵاو بوونەتەوە ، وە پێکهاتووی هیچ خۆراکێکی تر ناگاتە ئەم هاوسەنگیە تەنها ئەگەر بێت و لەشی گیانەوەرێك بەهەموو بەشەکانی وەکو ئێسقان و جگەرو دڵو سی و سپڵ (Spleen) و هەموو بەشەکانی تر وەربگیرێت ئەو کاتە دەگات بە شیر ، لەم ڕووەوە زاناکان وا ڕادەگەیەنن کە ئەو منالانەی شیر بە ڕێژەیەکی باش ناخۆن زیاتر تووشی نەخۆشی دەبن بە پێچەوانەی ئەو منالانەی کە شیر بە ڕێژەیەکی سروشتی بەکاردێنن وە هەموو تاقیکردنەوە زانستیەکان سەلماندوویانە کە ئەو گەلانەی شیر بەزۆری بەکاردێنن لەشیان بەهێزەو بەرگریان بۆ نەخۆشی زۆرەو تەمەنیان درێژە ، لەبەر ئاسانی هەرسکردنی دەدرێت بە منالان و نەخۆشان و پیران و ئافرەتی سك پڕ (pregnants) وەهۆی هەرسکردنی شیر بەئاسانی دەگەڕێتەوە بۆ ووردی بەشەکانی برۆتین و ڕۆن لەناو شیر ئەم ووردیەش وا دەکات کە بەئاسانی هەوێنەکانی هەرس بگەنە ناو شیر لە کۆئەندامی هەرس (Digestive system) لەبەرئەوە یەکێك لە سیفەتە گرنگەکانی شیر ئەوەیە کە بە زوویی و بەئاسانی هەرسدەکرێت ، لەلایەکی تر شیر خوراکێکی ئابووریە (Ecomomic) چونکە یەك لیتر لەشیر لەڕووی قیمەتی خۆراکییەوە

# تەندروستی شیر

## پەیوەندی بە تەندروستی ئادەمیزادەوە

یەكسانە بە (400 گرام) لە گۆشت یان (800 گرام) پەتاتا یان (9) هێلكە كەواتە بۆمان روون بووە كە شیر خۆراكێكە هەرگیز ئادەمیزاد ناتوانێ فەرامۆشی بكات بەڵكو پێویستی پێی دەبێت لە سەرەتای تەمەنیەوە تاكو دوارۆژی ژیانی ، لەبەرئەوە وولاتانی جیهان هەوڵیان داوە بەرهەمی شیر پەرە پێبدەن وەلەم رووەوە پێش بكەون بەهۆی باشكردنی جۆری مانگاو مەڕو بزن بۆ نموونە لە هۆڵەندا بەرهەمی رۆژانەی مانگایەك لەجۆری فریزیان دەگاتە زیاتر لە (50) كیلوگرام شیر .

**پێك هاتووەكانی شیرو سوودەكانی :**

**1 — پرۆتین** (protein) :

ئادەمیزاد پێویستی بە پرۆتین هەیە بۆ دابینكردنی پێویستیەكانی لەشی چونكە كەمی پرۆتین لەناو خۆراكدا كار دەكاتە سەر ئادەمیزادو بەرگری بۆ نەخۆشی كەم دەكاتەوەو درەنگ چاك دەبێتەوە . گرنگترین جۆری پرۆتین كە كایزینە (Casein) هیچ سەرچاوەیەكی تری نیە تەنها گوانی ئاژەڵ (Animal Udder) نەبێت رێژەكەی لە شیری مانگا 2٫6 ← 3٫1٪ وە هەروەها كایزین لەبواری پیشەسازیش بەكاردێتو بەشدارە لە پێكهاتووی چەند ماددەیەك بۆ لەناوبردنی مێشو مەگەزو كەرووی نان وەهەروەها بەشدارە لە پێكهاتووی چەند جۆرە دەزوویەك كە زیندەوەری زیانبەخش كاری لێ ناكات .

**2 — رۆن** Fat :

رۆنی شیر بەشێكی زۆری لە رۆنە ترشەكانی (Fatty acids) تیایە كە ناسراون بەوەی زوو هەرس دەكرێتو هەروەها پارمەتی مژینی كالیسیۆم دەدات لە ریخۆلەكان ..

**3 — ئەنزیم** Enzyme :

گرنگی ئەنزیمەكان لەوەدایە كە دەتوانین بەهۆی ئەوانەوە بارو دۆخی شیر بزانین ئایا لەژێر بارێكی تەندروستی بەرهەم هێنراوە یان كولاوە وە هەروەها بۆ دەست نیشانكردنی هەندێك نەخۆشی كە تووشی ئاژەڵ دەبێت .

**4 — ڤیتامین** Vitamin :

شیر زۆر جۆر ڤیتامینی تیایە كە گرنگن بۆ زیندەچالاكیەكانی لەشو نەبوونیان لە لەش دەبێتە هۆی هەندێك نەخۆشی . بۆ نموونە نەبوونی ڤیتامین لەجۆری (A) دەبێتە هۆی نەخۆشی شەوكوێریو دواكەوتنی گەشەكردن (Delay growth) ، نەبوونی ڤیتامین لەجۆری [ (D) = دی ] دەبێتەهۆی ئێسكەنەرمە (Rickets) وتێك چوونی ددانەكان چونكە یارمەتی مژینی كالیسیوم وفۆسفور دەدات لە ریخۆڵە ، وە نەبوونی كۆمەڵەی ڤیتامین (بی) Vitamin B Complex دەبێتە هۆی روودانی هەوكردن (سووتانەوە) وپێك هێنانی توێكڵ لەسەر پێست (Skin) و دەورووپشتی دەم و ژێر گوێچكەو لووتو هەروەها دەبێتەهۆی تێكچوونی (Disturbance) توانایی بینین ، یارمەتی پاراستنی لینجە پەردە (Mucous Membrane) دەدات لەكۆئەندامی هەرس ، گرنگن بۆ پێكهێنانی خرۆكە سوورەكانی خوین (blood cells Red) وەگرنگن بۆ چارەسەركردنی كەم خوێنی پیس (كوژەر = مُهْلِك) (Perni-cious anaemia) وەهەروەها نەبوونی ئەم كۆمەڵەیە دەبێتە هۆی چەند نەخۆشیەكی تر ، ڤیتامین لەجۆری (سی = c) ئەگەر كەم بێ لە لەش دەبێتەهۆی نەخۆشی ئەسكەربووت

وە هەروەها یارمەتی زینـدە چالاکیـەکانی لەش دەداتو یارمەتی پێك هێنانی ددانو ئیسقانو چاكبوونەوەی برین دەداتو دەورێکی زۆر گرنگی هەیە لەبەرهەڵستی کردنی (Resistance) لەش دژی جۆرەها نەخۆشی .

**5 — شەکری لاکتۆز Lactose suger :**

لاکتۆز وەکو خوراکێکە بۆ مێشك (Brain) چونکە یەکسەر دەچێتە ناو خانە دەمارەکانو هەروەها لەریخۆڵەی گەورە (Large intestine) — یارمەتی چەند میکرۆبێك دەدات بۆ دروستکردنی چەند جۆرە ڤیتامینێك وەهەروەها یارمەتی مژینی کـالیسیۆمو فۆسفور دەدات ، خوراکێکی باشە بۆ ئەو کەسـانەی تـووشی قورحە (ulcer) بۆونە چونکە درەنـگ دەتوێتـەوەو کار لە لینجـە پەردەی گەدەو دوانزەگرێ ناکات .

**6 — خوێیە کانزاییەکان Mineral salts :**

گرنگن بۆ چەسپاندنی شێوەی سروشتی پرۆتین لە شیر .

**سەرچاوەکانی پیس‌بوونی شیر : Sources of milk contamination**

لە شیردا دوو جۆر میکرۆب هەیە جۆرێکیان هۆن بۆ نەخۆشی لە ئادەمیزاد بەلام جۆرەکەی تریان تەنهـا کار لە شـیر دەکەنو کەڵکی خواردنەوەی پێوەنـاهێڵن ، ئەم میکـرۆبانـەش یان لە هەمان ئاژەل کە شیرەکەی لێوەرگیراوە دەگەنـە شیر چـونکە تووشی ئەم جۆرە مێکرۆبە بووە یان لە دەرەوە دەگەنە ناو شیر بەهۆی چەند رێگایەك وە گرنگترین سەرچاوەکان ئەمانەن : ـ

**1 — پیس‌بوون لەکاتی بەرهەم‌هێنان :**

ئەمەش بەهۆی چوونە ژوورەوەی میکرۆب بۆ ناو گوان (udder) لە دەرەوە لەبەرئەوە پێویستە پێش دۆشینی (milking) ئاژەل هەموو لەشی خاوێن بکرێتەوە یان بەهۆێ ئامرازی دۆشینی دەستکرد ئەگەر پیس بێت یان بەهۆی ئەو کەسانەی کە مانگا دەدۆشن وە پێویستە کارتی تەندروستیان هـەبێت بیسەلمێنێت کـە تووشی نەخوشی درمی نەبووە یان بەهۆی ئاو چونکە پێویستە ئەم ئاوەی بەکاردێت بۆ پاككردنەوە خاوێن بێت تاکو نەخۆشی نەگوازێتەوە بۆ ئادەمیزاد ،مێش هۆیەکە بۆگواستنەوەی میکرۆب بۆ ناوشیر یان بەهۆی قاچەکانی (Mechanical) یان بەناو لەشیدا (Biological) وە پێویستە ماددەی تایبەتی بەکاربێت بۆ لەناوبردنی مێش یان بەهۆی ئەو مەنجەلانەی کە شیری تێدەخـرێت وە پێویستـە خاوێن بکرێنەوە بەباشی .

**2 — پیس بوون دوای بەرهەم هێنان :**

دوای ئەوەی کە شیر وەردەگیرێت پێویستە بە ژێر پـالاوتندا (Straining) بـروات چـونکـە $\frac{7}{8}$ ی پیسـایی ئـاژەل لە شیـردا دەتوێتەوە دوای ئەوە پێویستە سارد بکرێتەوە یەکسەر تـاکو میکرۆب لە ناویدا گەشە نەکات (باشترین پلە بۆ هەڵگرتنی شیر بریتی‌یە لە 4 ← 6 پلەی سەدی) وەهەروەها پێویستە شیر بە ئوتوموبێلی تایبەتی بگوێزرێتەوە دوور لە تیشکی رۆژ وەهەموو جارێك خاوێن بکرێتەوە وە یان شـیر لە کارگـەدا پیس دەبێت بەهۆی ئەو شووشەیەی کە شیری تێدەخرێت ئەگەر پیس بێت یان بەهۆی ئامێری پرکردن یان بەهۆی سەری شووشەکان یان کرێکارەکان ئەگەر خاوێن نەبن .

**3 — پیس‌بوون لە ماڵەوە :**

شـیر لە ماڵەوە پیس دەبێت ئـەگەر بێتو بکـرێتـەوەو لەنـاو بەفرخەرەوە دانەنرێت یان لەگەڵ شیری کۆن تێکەلاو بکرێت وەپێویستە بە خاوێنی مامەڵە لەگەڵ شیر بکرێت .

**(بلاوبوونەوەی نەخۆشی بەهۆی شیرو بەرهەمەکانی)**

**« Milk — Borne diseases »**

شیر باشترین ناوەندە (Media) بۆ گەشەکردنی میکرۆب لە ناویدا وەئەم میکرۆبانەش تووشی ئـادەمیزاد دەبن . وە بـۆ یەکەمجار گواستنەوەی میکرۆب لە رێگەی شیر بۆ ئادەمیزاد دۆزرایەوە لە سالی (1857 ز) بوو لە بەریتانیا کە نەخۆشی (تای تایفوید = Typhoid Fever) روویدا کـە نیشانـەکانی بـریتین لە سك‌چوونو رشانەوەو سك‌یەشەو بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی لەش وەهەروەها لە سـالی (1865 ز) سەلمێنـدرا کە ئـادەمیزاد تـووشی نەخـۆشی درمی دەبێت ئەگـەر بێتو شیری مـانگای نەخوشی بەکاربێنین وەئەو نەخۆشیـانەی کـە لە رێگەی شـیر دەگـوێزرێتـەوە تووشی یـەك کەس نـابن (Not sporadic) بەڵکـو نـاسراون بـەوەی کە کـۆمەڵێکی زۆر تـووش دەبن چـونکـە هۆیەکەی میکرۆبە ، وەئەم نەخوشیانە دوو جۆرن : ـ

**أ ـ نەخۆشی ئاژەلی کە بـۆ ئادەمیـزاد دەگوێـزرێتەوە لە رێگەی شیر :**

**Diseases of animal origins**

لەراستیدا نەخوشی هاوبەش لەنێوان ئاژەلو ئادەمیزاددا زۆرن

که لە ڕێگەی شیر دەگوێزرێنەوە بەلام باسی دوو نەخوشی گرنگ دەکەین یەکێکیان نەخوشی سیلی مانگایە (Bovine tuberculosis) کە تاکو چەند ساڵیك لەمەوبەر زۆر بلاوبوو لەنێوان مانگادا بەلام ئیستا کەم بووەتەوە بەهۆی خاوێنکردنەوەی مانگا لە میکرۆبی ئەم نەخوشیە بەهۆی بەکارهێنانی تاقیکردنەوەی تایبەتی وەهەروەها کولاندنی شیر بە ئامێری تایبەتی و بۆ پلەی بەرز کە میکرۆبی ئەم نەخۆشیە دەکوژێت . مانگا بە چوار شێوە تووشی دەبێت کە بریتین لە تووشبوونی کۆئەندامی کە هەموو بەشەکانی لەش تووشی دەبێت وەشێوەی دووەم ئەوەیە کە تەنها سیەکانی تووش دەبێت (Pulmonavy infection) وە بەشی زۆری مانگا تووشی ئەم شێوەی دووەم دەبێت وەشێوەی سێیەم ئەوەیە کە کۆئەندامی هەرس تووشی دەبێت وە شێوەی چوارەم ئەوەیە کە ئەم میکرۆبەی سیل دەبێتە هۆی هەوکردنی گوان (Mastitis) وە نیشانەکانی ئەم نەخۆشیە بەگشتی لە مانگا بریتی یە لە تەنگبوونی هەناسەدان (Dyspnoea) لەگەل لاوازبوون (Emaciation) و کۆکینی مانگا (coughing) .

بەزۆری ئەو منالانەی کە تەمەنیان پێنج ساڵەو بەرەو ژوور ئەگەر شیری مانگای سیلاویان خواردەوە وەباش نەکولابوو ئەوا تووشی ئەم نەخۆشیە دەبن بۆ نموونە لە سکۆتلەندا لە هەر (2769) کەس کە تووشی سیلی سیەکان دەبن (160) کەس لەمانە سەرچاوەکەی لە مانگاوە دێت . دووەم نەخۆشی لە مانگا پێی دەووترێت (لەبەرچوونی درمی) -conta) gious aborfion) وە هۆیەکەی میکرۆبیە کە پێی دەووترێت بروسیلا (Brucella) لەبەرئەوە نەخۆشیەکە پێشی دەووترێت (Brucellois) وە گرنگترین نیشانەکانی ئەوەیە کە ئەو بەچکەیەی (Fetus) لەناو منالدانی مانگایە پێش ئەوەی تەمەنی تەواو بێت فرێ دەدرێتە دەرەوە ، وەلەم کاتەی میکرۆبەکە دەگاتە ناو شیر وەئەگەر هاتوو ئادەمیزاد ئەم شیرەی بەکارهێنا وە باش نەکولابوو ئەوا تووشی نەخوشی (تای شەپۆلدار Fever undulant) دەبێت بۆیە وای پێ دەووترێت چونکە پلەی گەرمی لەشی بەرزو نزم دەبێتەوە وە نیشانەکانی تری لە ئادەمیزاد بریتی یە لە ژانە سەریکی توندو پەشانی ماسولکەکانی لەش و پشتی مل وە لەگەل سکچوون ئەمانە لە سەرەتای نەخوشیەکە لەدوایی دا نەخۆشەکە هەست بە پەشانی سك و سەرو جومگەکانی دەکات و لاواز دەبێت وهیچی بۆ ناخورێت بەلام نایکوژێت .

## ب) نەخوشی ئادەمیزاد کە بۆ ئادەمیزاد دەگوزرێتەوە لە ڕێگەی شیر :

**Diseases of human origins**

زۆر نەخۆشی هەن کە هۆیەکانیان دەگەنە ناو شیر (بریتین لە چەند جۆرە میکرۆبێك) لە ئادەمیزادەوە ، لە دوایی دا ئەگەر هاتوو ئادەمیزادی تری لەش ساغ ئەم شیرەی خواردەوە تووشی ئەم نەخۆشیانە دەبێت لەوانە پەبمرێت ئەگەر هاتوو بەرهەلستی لاوازبوو یان ڕێژەی میکرۆبەکە زۆر بوو وە لەشی نەیتوانی بەرگری لەخۆی بکات وە گرنگترین نەخۆشی بریتی یە لە (گرانەتا یان تایتایفوید) کە هۆیەکەی میکرۆبی (سالمونیلا) یە پێی دەووترێت (Salmonella typhi) وە تووشی کۆئەندامی هەرسی ئادەمیزاد دەبێت بەتایبەتی بەشی ڕیخولە وە لەکاتی چوونە دەرەوەی ئەم میکرۆبە لەگەل پاشەڕۆی نەخوش دەگاتە ناو شیر (یان) بەهۆی مێش یان لە ڕێگەی ئاو یان بە دەستی پیسی نەخوش یان جلو بەرگی پیس وە لەو کاتەی کە یەکێکی لەش ساغ ئەو شیرەی خواردەوە ئەوا تووشی نەخوش گرانەتا (Typhoid fever) دەبێت .

دووەم نەخۆشی بلاو بریتی لە (کۆلیرا) = cholera = دەگاتە ناو شیر میکرۆبی ئەم نەخوشیە لەچەند کەسانێکی تووشیبوو ئەگەر بێت و ئەم کەسە کریکاری کێڵگە (Farm) بێت یاخود لە کارگەی شیر ئیش بکات وەئەو کەسەی ئەم شیرە بەکاردێنێت تووشی نەخۆشی کۆلیرا دەبێت وە نەخوشیەکی ترسناکە ئەگەر زوو چارەسەر نەکرێت وە بلاوە لە هەموو جیهان وەگرنگترین نیشانەکانی بریتین لە سکچوونی ئاوی (Watery diarrhea) و ڕشانەوەو وشكبوونی لەش (Dehydration) .

نەخوشیەکی تر پێیدەووترێت (سکچوونی هاوینە -Sum mer diarrheal) ئەوەش هۆیەکەی جۆرە میکرۆبێکە تووشی ئادەمیزاد دەبێت ئەگەر هاتوو شیری پیسبووی بەکارهێنا کە باش هەلنەگیرا بوو یان لە کێلگە باش مامەلەی لەگەل نەکرابوو یان لە کارگە یان لە مال پیس بوو بوو ، وە میکرۆبەکە (یان) بەهۆی مێش یان بەهۆی تۆز دەگاتە ناو شیر وە ئەم نەخۆشیە بەتایبەتی لەو منالانە ڕوودەدات کە تەمەنیان لە ساڵێك کەمترە .

## ژەهراوی بوونی خۆراك Food poisoning

هۆیەكانی ژەهراویبوونی خۆراك دەگەنە ناو شیر (یان) لە ڕێگەی ئاژەڵ خۆی (یان) پاشەڕۆی ئاژەڵ یان بەهۆی مشك یان مێش یان لەڕێگەی ئەو مەنجەڵانەی كە شیری تێدەخرێت یان لە ڕێگەی ئەو كەسانەی كە مامەڵە لەگەڵ شیر دەكەن ، میكرۆبەكان دوو جۆرن جۆرێكیان ژەهر فرێدەدەن لەناو كۆئەندامی هەرس وەكو میكرۆبی (سالمونیلا) لەبەرئەوە ماوەیەكی پێویستە تاكو نیشانەكانی لەسەر مرۆڤ دەردەكەوێت وەئەم ماوەیە لە (14) كاتژمێر كەمتر نیە بەلام جۆری دووەم ژەهرەكەی فرێدەداتە ناو شیر لەبەرئەوە كە ئادەمیزاد شیرەكە بەكاردێنێت ژەهرەكەی تیایەو یەكسەر تووشی ژەهراویبوون دەبێت .

لەساڵی (1949 ز) ژەهراوی بوونی خۆراك ڕوویدا لە (ئایرلەندا) لە ئەنجامدا (50) كەس تووشی بوون وە هەوكردنی گەدەو ریخۆڵە تووشیان بوو بەهۆی میكرۆبی (سالمونیلا) وە دوای پشكنینەوە بینرا كە مەرجەكانی بەرهەمهێنان زۆر باش نەبووە وە میكرۆبەكە دابڕكرا (Isolated) لەشیر وناو . وە چەند جارێكیتر ژەهراویبوون ڕوویدا بەهۆی بەكارهێنانی شیری خاو وە هۆیەكەی ئەوەبوو كە كرێكارەكان تووشی سكچوون ورشانەوە بوو بوون بەهۆی ئەم میكرۆبە وە لەمانەوە میكرۆبەكە گەیشتەبووە شیر .

## ڕێگەكانی نەهێشتنی گواستنەوەی نەخۆشی لە ڕێگەی شیرو بەرهەمەكانی بۆ ئادەمیزاد گرنگترینیان ئەمانەن : -

1 — سەرپەرشتیكردنی تەندروستی لەسەر ئاژەڵە بەرهەمهێنەرەكانو ئەو كرێكارانەی لەوێ ئیشدەكەن ئەمەش بە تاقی كردنەوەی دەوری ئاژەڵەكانو دڵنیابوون لەوەی كە نەخۆش نینو وە دابڕكردنی ئەوانەی نەخۆشنو وەنەدۆشینیان لەهەمان مەنجەڵ یان بەكارنەهێنانی ئامێری دۆشین بۆ یان و هەروەها دڵنیابوون لە كرێكارانی كێڵگە كەوا نەخۆش نین ئەمەش ئەبێ كارتی تایبەتییان بۆ بكرێت .

2 — ساردكردنەوەی شیر بۆ پلە نزمەكان وە پێویستە كەمتر لە (10) پلەی سەدی بێت بۆ نەهێشتنی زۆر بوونی میكرۆب وفرێدانی ژەهر بۆناو شیر چونكە ڕادەی ژەهر فرێدان بەندە بە توندی گەشەكردنی (Prolefiration) میكرۆب وە هەروەها ساردكردنەوە تەمەنی شیر درێژدەكات .

3 — مامەڵەكردنی شیر بە كوڵاندن بۆ پلە بەرزەكان تاكو چەند میكرۆبێك هەیە لەناو بچێت و ئەبێتە هۆی نەخۆشی وە زۆری ئەم نەخۆشیانەی ڕوویانداوە بەهۆی باش نەكوڵانی شیر بووە لەكارگەكان .

## كاری نەتەوە یەكگرتووەكان بۆ زۆربوونی بەرهەمی خۆراك :

لەبەر گرنگی خۆراك بەگشتی بۆ گەلانی سەر گۆی زەوی و گرنگیپێدان بۆ زۆركردنی وولاتانی جیهان لە 16 تەشرینی یەكەمی ساڵی 1945 گەیشتنە ڕێككەوتن نامەیەك بۆ دامەزراندنی ڕێكخراوی خۆراكو كشتوكاڵ سەر بە نەتەوە یەكگرتووەكان Food and Agriculture Organization of the United Nations كە بەكورتی ناسراوە بە (فاو) = FAO بۆنەوەی كاربكات لە بنەڕەتدا بۆ زۆربوونی ئاستی خۆراكو ڕزگاركردنی مرۆڤایەتی لە برسێتی ، وە وولاتانی جیهان لە 16 تشرینی یەكەمی ساڵی 1979 بڕیاریاندا كە هەموو ساڵێك ئاهەنگ بگێڕن بە بۆنەی ڕۆژی خۆراكی جیهان (World FoodDay) بۆ هوشیار كردنەوەی خەڵكو پێراگەیاندنیان كەوا گەلانی سەرزەوی گیروگرفتی خۆراكیان هەیەو وەبۆ هەستكردن بە هاوكاری مرۆڤ بۆ ڕووبەڕووبوونی برسێتیو هەژاری لە جیهان وەئەم ئاهەنگە ببێتە پاڵپشتێك بۆ مافێكی بنەڕەتی مرۆڤ كە ئەویش مافیەتی خۆراكی دەستكەوێت ، دوا ڕاپۆرتی نەتەوە یەكگرتووەكان وا ڕادەگەیەنێ كە ئێستا (800) ملیون برسی هەیە لە جیهان وە (100) ملیۆن منال تووشی كەمخۆراكی بووە وەبەشی زۆریان لە كیشوەری ئەفریكان وە بەشێكیشیان لە ئەمەریكای خواروونو هەندی شوێنی تر لە جیهان وە یەكێك لە هۆیەكانی برسێتی لە ئەفریكا بریتییە لە تووشبوونی بەشی زۆری مانگا بە نەخۆشی درمی ئەمەش بەرهەمی شیرو گۆشتی كەمكردەوە .

دوای ئەم باسە بۆمان ڕوونبووەوە كە شیر خۆراكێكی تەندروستییە بۆ ئادەمیزادو لەهەمان كاتدا نەخۆشیش بۆ دەگوازێتەوە ئەگەر بەباشی مامەڵەی لەگەڵ نەكرێت بەلام بەهەر حاڵێ شیر خوراكێكی هەمیشەییە بۆ هەموو گیانلەبەرێك بۆی بلوێت بەكاری بێنێتو سروشت ڕێی پێ دابێت .

# ئافرەت

## د ناڤبەرا سەربەستییێ وبن دەستییێ دا

**سرفراز علی نقشبندی**

● ئەز دبێژم هوین دگەل منن هەکە ئەز بێژم مافێ ژنکێ گەلەك یێ لسەر هاتیە نڤیسینو یێ بویە ئاخڤتنا روژێ ، هەر مروڤەکێ دڤێت خو بینتە دەر کو ناڤێ وی بهێتە ناڤ ناڤا دێ بەحسی مافێ ژنا کەتو پەیڤێن قەلەو ژێ گریتو بکار ئینیتو دەستێ خو دەتە پستوییێ خوو راستکەت لێ چەند ژڤان مروڤا بچاکیو دروستی دڤی مافی دگەهن .. ؟ چەند ژوان ل مالا خو لسەر ژنا خو ئان خویشکا خو وان هزرو بیرا بکار دئینیت ، چەند ژنك ژوان دزانن ماف چییەو دڤێ چەوا بزاڤێ بو بکەن ، کیشکا ژوان لڤێری من نەڤێت ئەز بهێم ڤێ چەندێ شروڤەکەمو بێژم کو ژنکێ هەتا نهو مافێ خو وەرنەگرتیە ئان د مافێن خو نەگەهشتیە لێ گەلەك ژ وان مافا لبن سیبەرا هندە رەوشتێن چڤاکی یێن بەرزەکرین .

هوین لمن نەگرن لێ گەلەك ژکچو ژنێن مە بخو نزانن چەوا مافێ خو بکار بینن ، گەلەك زەلامێن مە ژی وەسا تێدگەهن کو مافێ ژنێ (سەربەردانە) ، لەوا ژی گەلە ئالوزیو گرفتاری د رێکا ماف وەرگرتنێدا پەیدا دبن .

لێ تشتێ مروڤ پێ دهەرشیت ئەوە کو هندە کچێن مە کو چاڤێ مللەتی هەمی یێ لێ ببنە خەتیرا سوبەهی ، چاڤێ هەمی ژنەکێ یێ لێ کو ببنە سویچو ئەگەر بو روژەکا روهنتر ، لێ مخابن ئەوان بناغێ راستو دورست یێ ڤەدایو ژبیرکریو یێن مانیە بدەهماناو تیڤەرێزاڤە . نزانن هندی ماف پتر لێدهێت بارێ سەرپشتا مروڤی ژی مەزن تر لێ دهێت .

هەر وەسا چ جارا نەبویە خودانێ مافی دەستا بدەتە کێلەکا لهیڤیا هندێ کو مافێ وی بو بکەتە دیاری ژبەرکو ماف ناهێتە دان لێ دهێتە ستاندن .

ئەڤ ستاندنە ژی نە بسەر رەقییێیەو بهندی یە کو خو بکەتە هەڤرك بو مێری ، و پێ لرەوشتێن مللەتێ خو بنیت ، لێ ئەڤ چەندە ب هزر و بیرێن بەرفرهەو روهنو رەوشەنبیریەکا

مـەزن و هەڤپشکییـەکا راست و رەوان دگـەل مێرکی دبیت ، ژبەرکو هەچکو ئەم دبێژین دەستەکێ بتنێ دەنگ ژێ ناهێت ، دڤێت ژن و مێر تەڤرا دەستێن خو تێکبگرن بو ئاڤاکرنا ژیانەکا نوی‌ترو سەرفەرازتر .

گەلەك ژ روژهەلات‌ناسا لسەر ژنا کورد یانڤیسی و یا دیار کری کو چەوا یاسەرفەرازەو خو ژ زەلامی نافەشێریت چـەوا مافێ وێ یێ شوی کرنێ یێ بەلییەو گەلەکا داوەتا کـوردی یا تێکەلی یا کرییە نمونە ، هەروەسا گەلەکا یا لسەر ژنا نڤیسەرو تـورڤان یـا ئاخڤتی وەکی (میهـرەبان خـاتوینێ) و (زێـرینـا ئامێدی) .

یا پێدڤی گوتن ئەوە کو سەرفەرازیا ژنا کورد یا گریدایە بیزاڤا وێ بو خاندنێ ، یانی خاندن پەیسکا گەهشتنا هیڤیانە .

بو نمونە ئەڤێ هژمارتنا خارێ دێ ئێخینە بەرچاڤ ، کو وەزارەتا (تخطيط)ێ لسالا 1976 لسەر ژنا خاندەڤان کری‌یە .

(1)

| پاریزگەهـ | سالفیی | سەرەتایی | ئامادەیی | خاندن‌گەهێن سەیدا | هیبونا کاری | دەستەکا هوی‌کەرا |
|---|---|---|---|---|---|---|
| سلێمانیێ | 522 | 31685 | 4444 | 630 | 216 | 1321 |
| هەولێرێ | 657 | 25677 | 3486 | 1014 | 123 | 1466 |
| دهوکێ | 447 | 11978 | 781 | 789 | 009 | 481 |
| کوم | 1626 | 69340 | 8711 | 2433 | 348 | 4268 |

لدویڤ ڤێ هژمارتنێ کو هەرچەندە هژمارا ژنێن خویندڤان ژ سالێن بوری یا بلندتر لێ‌هاتی لێ دسەر هندێ‌را هێشتا تایێ ترازویا ژنێ دگەل یامێری ناهێت ، ئەڤە ئێـك ژ وان بناســین پاشڤە مانا وێ نە .

لڤێرێ پسیارەکا دی بو مە دهێت ، گەلو لناڤ چڤاکێ مە چەند کچ هەنە ئەم دبینین و مە گولێ دبیت کو بدلێ خو ناچنە وێ خاندنێ ئەوا وان دڤێت و گەلەك ژ وان ناگەهنە زانکویێ ژبەرکو مروڤێن وان ناهێلن . بونمونە ئـەز بخو مـالەکێ دنیاسم کـو ســەمیانێ وان مـروڤەکێ رەوشـەنبیرە دەمێ نـاڤێ کچا وێ لکولیجا ئەندازیاریێ دەرکەڤتی نەهێلا بچیت هەتا بو گوهری

چنکو ئەندازیاری بکێر ژنێ ناهێت . ئەڤەو هزار تشتێن هوسا و خراب‌تر هەرو لبەرچاڤێن مە روی ددەن .

ژلایێ چڤاتێ‌ڤە وەچکو ئەم هەمی دزانین کو ژیانا خێزانێ لەناڤ هەمی چڤاکەکی رامانەو هەمی بزاڤێ دکەن بو هندێ کو خێزان یاپێکڤە نوسیای بیت ، بشێت زاروکێن خو بو سوبەهی بەرهەڤ‌کەن ، هەمی دژی تەرا بەرا کرنا زاروکانن بونمـونە ئـەمێ هێڤ‌کەینـە ڤێ هژمـارا خارێ کـو مەژ (دادگـەهێت) شـەرعی لسلێمانیێ /هـەبلێرێ/ دهـوکێ ورگرتینـە بدویڤ هژمارتنا سالا 1976ێ .

(2)

| سال | سلێمانیێ شوی‌کرن | سلێمانیێ بەردان | هەبلێرێ شوی‌کرن | هەبلێرێ بەردان | دهوکێ شوی‌کرن | دهوکێ بەردان |
|---|---|---|---|---|---|---|
| 1971 | 1788 | 125 | 313 | 16 | 658 | 10 |
| 1972 | 1757 | 98 | 962 | 235 | 722 | 8 |
| 1973 | 2143 | 156 | 1624 | 62 | 985 | 14 |
| 1974 | 1871 | 87 | 2566 | 52 | 1008 | 8 |
| 1975 | 2706 | 67 | 4466 | 89 | 1756 | 24 |
| 1976 | 8171 | 260 | 5458 | 110 | 3368 | 17 |
| کوم | 18436 | 793 | 15389 | 564 | 8597 | 81 |

ئەم دبینین کو هژمارا بەردانێ لپارێزگەها سلێمانیێ لناڤ بەرا سالا 1971 — 1976 ژهەمی پارێزگەهێن دی پترەو پارێزگەها دهوکێ ژهەمیا کێم‌ترەو دچاڤ پێکفتنەکێ دا دگەل (قازی)ێ دهوکێ روژا 1978/3/5 دیارکـر کو : لنـاڤ بەرا 1977 — 1978 چ رویدانێن بەردانێ نەهاتینە نك مە ، ئەڤە ژبلی دەڤەرێن دویرو گوندا ژبەرکو دبیت هندەکا لوێرێ روی دابیت هەروەسا گوت : کو ئالوزیێن لناڤ‌بەرا ژن و مێرا لڤێ دەڤەری تێنە چارەکرن بێی بەردان چنکو بەردان لدەڤەرا مە تشتەکێ گەلە شەرمەو ژلایێ ئایینی ژێ ڤە یاباش نینە .

لڤێرێ ئەم نەشێین بێژین کو ئەڤ چەندە پاش‌کەفتنە ئان پێش‌کەفتنە لێ یا ئەم دشێین بێژین کو بەردان لڤێ دەڤـەرێ خوش‌خوش بکار ناهێت و گەلە مەتەل لسەر ڤێ چـەندێ یـێن هاتینە گوتن بونمونە (شەش جار خو بدە رەڤان و جارەکێ خو

نەدە بەردان) دیسا لدویف ڤێ هژمارتنا خوارێ ئەوا مە کری خو یا دبیت کوم (حوکم) دانا ژنێ و کێشانا وێ بو دادگەها لپارێزگەها هەبلێرێ ژهەردوو پارێزگەهێن دی پترە ژبەرکو ئەز دبێژم گرفتارییێن چڤاکی لوێ پارێزگەهێ پترن ژ دەڤەرێن دی .
ئەڤ هژمارتنا سالا 1976 یاهاتیەکرن

(3)

| پارێزگەهـ | هژمارا ژنێن (حوکم) دای لسالا 1976 ێ |
|---|---|
| سلیمانیێ | 102 |
| هەبلێرێ | 420 |
| دهوکێ | 12 |

چنکو ژیانا خێزانێ و هەڤپشکیا وێ دگەل مێرێ ژهەمی تشتا پتر کاری لێ دکەت کو کریارێن نەباش و لەوتن بکەت دبیت ژنەك کوشتنێ بکەت هەکە مێرێ وێ ژیانا وێ شێلوی ئان هەویا وێ کەربێن وێ ڤەکرن ، ئان تشتەك بو ئەگەرکو زاروکێ وێ ژێ بهێتە ستاندن هەروەجکو مە گوتی ئەز دبێژم ئەڤ گرفتاریەو گەلەکێن دیو دبنە سوریچ بو گەلە کریارێن نەباش .

ژلایێ ئابوریڤە لدویف بوچونا مە دیار بـو پشتی سالا 1970 روژ بو روژێ هژمارا ژنێن کرێکار پترلێدهێتن لسالا 1973 نێزیکی (1321) ژن بونە پالە لکارگەهێن جگاراو پاقژکرنا توتینێ و هژمارا وان لپارێزگەها هەبلێرێ گەهشتە نێزیکی (2000) ژناو نێزیکی (40) ژنا لکارگەها چنینا مـەحفوێـرا لدوهوکێ و ئـەڤ هژمارە روژ بو روژێ بلنددبیت ژبەرکو گەلەك خێزانـا هاتنـە باژێراو لسەر گوندێن خو نەمان ژبەر گەلەك ئەگەرا .

ڤێجا هەکە ئەم بهێن بەرێ خو بدەینە بارێ ژینا ژن تێدا دژین دێ بینین کو مێر وەسا بەرێ خو ددەتە ژنێ کو بەلایە کە یاکەتیە سەر ملا ، گەلەك ژزاناو بسبورا وەسا ڤێ چەندێ راڤە دکەن کو ژنێ دەستێ ڤەرێژێ نینە لێ ئەڤ شروڤەکرنە بو ژنا کورد یادورست نینە . ژبەرکو ژنا کورد هەکە ژنا بەرمالا بیت یانەخویندەڤان ژی بیت دگەل مێرێ خو لچـاندنێ و دوروینێ کاردکەت . پشتی هەردو دزڤرنەڤە مێر پالدەت و ژن کارێ مالێ دکەت و هەکە ژن یاخویندەڤان ژی بیت و خودان کار بیت وەکی

مێری دەمێ تێنە ڤە مێر دێ پالدەت ژن دێ بیتە ڤرڤروك خارنێ بەرهەڤ کەت و مالێ بسەروبەرکەت . دسەرڤێ هەمیێ را مێرك بچاڤەکێ نزم هێڤ دکەتێ .

خویندەڤانێن هێژا دا گەریانەکێ دگەل هزرو بیرێن ژن و مێرادا بکەین کانێ هەر ئێك ژوان چەوا هزرا خو دکەت .

ئەڤ توێـژادنە مـە لدەڤەرا دهـوکێ سالا 1978 دگـەل هژمارەکا ژنێن خویندەڤان و یێن نەخویندەڤان یاکری هەروەسا دو هژمار منی وەرگرتین هندەك یێن خویندەڤـان و هندەك یـێن نەخویندەڤان .

(1) هژمارەك ژ ژنێن خویندەڤان کو زانکو خاندیو پێدا : ـ

پ 1 : تو چەوا دبینی هەکە مێرکەك ژژنەکێ پتر بینیت .. ؟

28٪ گونەهباریەکا مەزنە .

42٪ نابیت بینیت هەکە بدلێ ژنێ نەبیت .

15٪ یاباشـە بو گـوندا چنکـو خودان کـارن و رەزو پەزن .

15٪ دەنگ نە دایە .

پ 2 : سەربەستیا ژنێ لسەر چ دراوستیت ، لسـەر رابون و رونشتنا وێ ئان رەوشتێن چڤاکی ؟

42٪ چڤاك کاری لسەر بەستیا ژنێ دکەت .

28٪ ژن بارێ کریارێن خو هەلدگریت .

15٪ من چ سەربەستی نەڤێت .

15٪ دەنگ نەدایە .

پ 3 : چەوا دێ ژن مافێ خو وەرگریت .. ؟ ب رەوشەن بیریا خو .. ئان بتنێ گەهشتنا چڤاکی بو وان مافا .. ؟

58٪ لسەر رەوشەنبیریا وێ راوستیایە .

27٪ لسەر تەمەنێ وێ راوستیایە .

15٪ لسەر چڤاکی راوستیایە .

* * *

پ 4 : تو چەوا راستکرنا یاسا (احـوال شخصیة) یـا دویماهیێ دبینی .. ؟

42٪ یاباشەو بکێر چڤاکی دهێت .

28٪ دژی وێ راستکرنێ نەینە .

30٪ ئەم دوێ راستکرنێ نەگەهشتینە .

* * *

پ 5 : تە دڤێت تەزاڕوك هەبن ؟ كچ ئان كوڕ ؟

**70٪ مە دڤێت لێ بهژمارەكا كێم بێ جوداهی لناڤ بەرا كوڕو كچا .**

**30٪ مە دڤێن و هندی پتربن و چێترە .**

* * *

پ 6 : تو چ دبێی بو ڤەشارتنا ژنێ دبن (بەرچافك و عەباڤە) .. ؟

**28٪ مە نەڤێت و مە بزوری یێ هاڤێژتی .**

**42٪ مە نەڤێت لێ ژبەر چڤاكی ئەم دكەینە بەرخو .**

**30٪ مە دڤێت ژبەر ئەگەرا ئایینی .**

* * *

پ 7 : مێرێ تە روژەكا تایبەتی بو تە دادنیت كو بمینتە دگەل تە .. ؟

**28٪ بەلێ بو من ددانیت .**

**42٪ لدویف هەلكەفتنێ یە .**

**30٪ چ روژا بو من نادانیت .**

* * *

پ 8 : مێرێ تە دهێلیت تو بتنێ دەركەڤی .. ؟

**15٪ ناهێلیت .**

**42٪ دهێلیت .**

**28٪ هندە جارا .**

**15٪ نزا چنكو ئەم چ جارا بتنێ نادەركەڤین .**

* * *

پ 9 : تە چەوا شوی كرییە ، بڤیان ئان دریكا مالرا .. ؟

**42٪ بەلێ من یاحەژێ كری پاشی شوی كری .**

**42٪ نەخێر مال یێ بو منێ هەلبژارتی .**

**16٪ بەرسڤ نەدا .**

* * *

پ 10 : تو یارازی بحالێ خوو بشولێ خو .. ؟

**15٪ نەخێر من پتر هیڤێن هەین .**

**70٪ هندە بەسە .**

**15٪ هەكە ژبەر دەست كورتیێ نەبا دا لمالا خو رونم .**

* * *

پ 11 : تو گوڤارو روژناما دخوینی .. ؟

**28٪ بەردەوام .**

**42٪ هندە جارا .**

**30٪ قەت ناخوینم ..**

* * *

پ 12 : تو چەوا خو دبینی یاسەربەستی ئان بن دەستی ؟

**15٪ ئەزا بحالێ خو رازیمە .**

**58٪ نەخێر ئەز گەلەكا بن دەستم .**

**27٪ (چ بەرسڤ نەدان) .**

* * *

ژڤان بەرسڤێن چوین ئەم تێ گەهشتین كو سەربەستیا ژنا خوێندەڤان ژی نە لوێ پەیسكا پێدڤییەو مێركی چ بو هندێ نەدانایە كا ژنا وی یاخوێندەڤانەو خودان كارەو وەكی وییەو هندی وی دوەستێت ئەڤە ژلایەكی‌ڤە ژلایەكێ دیڤە كو ژن بخو گونەهبارە دڤێ چەندێدا لناڤ وان بخو هەبون كو حەژ گوهرینێ ناكەن و بەرسڤا پسیارا (4) كو 30٪ چ ژ راستكرنا یاسا (احوالی شخصیة) نزانن و 28٪ دژی ڤێ راستكرنێ نە . هوین بخودێ ئەڤە سەیر نینە ژنەكا خوێندەڤان و زانكو بدویماهی ئینای یاسایەكێ تێنەگەهیت كو ئەو یاسا بخو پالپشتە بو مافێ وی و نەزانیت چیەو چەوایە ، نەهەر هند لێ دژی وێ راستكرنێ ژی دراوستیت .

هەروەسا بەرسڤا وان لسەر پسیارا (11) كو 30٪ قەت روژناماو گوڤارا ناخوینن و 42٪ هندەجار دخوینن ئەڤێ هەمیێ هەلسەنگینن دگەل بەرسڤا وان لسەر پسیارا (12) كو 58٪ دبێژن ئەم گەلە دبن‌دەستین و مە چ سەربەستی نینە دیسا جارەكا وی هەر ڤێ بەرسڤا دویماهیێ بێخنەر بەر بەرسڤا پسیارا (3) كو 58٪ بەرسڤدا كو مافێ ژنێ لسەر رەوشەنبیریا .

وێ راوستیایە دێ بینن کو ئەڤ چەندە هەمی چەند دژی ئێکن چنکو ئەوێ بزانیت یێ بن‌دەستە دێ دەستێ خو دانتە سەر وان ئەگەرا ئەوێن دبنە سویج بو وێ گرفتاریێ پاشی وێ چارەکەت نە بنەزمانیو پەحنکا دەڤییە (ئەم دبن‌دەستین) لێ ئەم چ ناخوینین و ئەم چ بزاڤا بو پێش‌کەفتنا خو ناکەین دیسا بو مە خویا بو کو چڤاتین ژنا لدەڤەرا دهوکێ هندە جوداهی یێ هەی دگەل دەڤەرێن دی یێن کوردستانێ چمکو ژنا وێ دەڤەرێ پتر یا برەوشتاڤە نویسیایەو هەروەسا ئەڤ دەڤەرە یا بەر پەنی بویەو دویر بوویەو ژ رەوشەن‌بیریێ ژبەر گەلە ئەگەرا ڤێجا ژنا وێ دەڤەرێ لباژێرا هەر لبن بەرچاڤك و عەباڤە یافەشارتی‌بو . هەرچەندە ل گوندا یا سەربەستەو خو ناڤەشێریت و رەوشتا خو ڤەشارتنێ ژ ملێتین بێگانە یاگرتی .

(2)

نوکە دێ هێڤ‌کەینە هژمارەکا دی یا ژنێن نەخویندەڤان کانێ چ دبێژن

**42٪ ژ ڤانا دشوی‌کرینە**

**58٪ کچن مە ئەڤ پسیارێن خارێ ژێ‌کرن**

س 1 تە دڤێت بخوینی .. ؟

100٪ من دڤێت .

* * *

س 2 بوچی دڤێت بخوینی

28٪ مافێ مەیە

28٪ ژبەر پارەی

15٪ دا بخو دجیهانێ بگەهم .

15٪ دا ئەژی وەکی هەڤالێن خو بم (چاف‌لێ‌کرن)

14٪ نزا ..

* * *

س 3 تە پێ خوشە خو ڤەشێری دبن بەرچاڤك و عاباڤە . ؟

15٪ ژبەر ئایینی من پێ‌خوشە

15٪ ژبەر چڤاکی .

70٪ ژ ترسێت کەس و کارێن خودا

* * *

س 4 أ ـ بو شوی کریا

تە چەوا شوی‌کرییە ، بڤیان ئان مال بو تە هەلبژارتیە ؟

70٪ من یا حەژێ‌کری پاشی یاشوی پێ کری

30٪ مال ئەزا دایمە شوی .

* * *

ب ـ بو کچا :

تو چەوا بەرێ خو ددەیە ڤیانێ ، تو دبێی ڤیان مهانەیە بو شوی کرنێ .. ؟

50٪ گەلەك مهانەیە تە بڤێت پاشی شوی‌پێ‌بیکەی .

25٪ لدویف بارێ روژێ‌یە .

25٪ ڤیان پشتی شوی‌کرنێ دهێت .

* * *

س 5 تو چەوا دبینی هەکە مێرك ژ ژنەکێ پێتر بینیت .. ؟

15٪ هندە جارا لگوندا یاپێدڤییە ژبەر شولێ وان

85٪ کارەکێ خرابە .

* * *

س 6 تو چەوا خو دبینی یا سەربەستی ئان بن دەستی ، ئان تو بحالێ خو رازی ؟

100٪ ئەم دبێ باهرین ژ خاندنێ .

هەروەسا :

42٪ بژیانا خو درازینە .

58٪ ئەم دگرێدایـنە ژبەر چڤاکی ..

* * *

س 7 تە دڤێت تە تێکەلی دگەل جڤاتێن مێرادا هەبیت . ؟

28٪ ئەم حەز دکەین د سنورەکێ تەنگدا بیت .

42٪ ئەم نەشێین ژبەر کەسوکارێن خو .

15٪ مە نەڤێت چنکو ئالوزی ژێ چێ‌دبیت .

15٪ ئەم تێکەلیا وان دکەین وەکی برا .

* * *

س 8 تو حەز دكەی تە زارو هەبن ، كیش پتر كچ ئان كوڕ .. ؟
67٪ ژوان ئەوێن شوی كری گوت . مە كوڕ دڤێن چنكو كوڕ شوینوارە
33٪ مە هەردو دڤێن وەكی ئێك .
لێ كچا 100٪ بەرسڤدا مە دڤێن و چ جوداهی نینە لناڤبەرا كچ و كوڕا .

* * *

س 9 تە دڤێت وەكی مێركیبی د هەمی مافادا ئان د هەمی كارادا د تو دشیێ .. ؟
42٪ نەخێر هەمی تشتا نە .
58٪ ئەم دشیێن وەكی وی بین هەكە جڤاك رێ بدەتە مە .

* * *

س 10 دێ هێلی كچا تە دلدارییێ بكەت
42٪ دێ هێلم .
28٪ نەخێر ئەز ناهێلم چنكو جڤاك ناهێلیت .
30٪ دێ هێلم د سنورەكێ تەنگدا .

* * *

س 11 بو ژنكا
مێرێ تە روژەكی بو تە ددانیت دگەل تە بیت ؟
100٪ نەخێر ، بێ لدویف كەیفا خویە .
بو ژنكا :
س 12 مێرێ تە تەدبەتە گەریانێ
76٪ ئەز بتنێ دچمە مالێن مروڤێن خو
33٪ دگەل من دهێت چی جهێ ئەز بچم ..

* * *

هێڤكەن بەرسڤا پسیارا (4) أكو 70٪ گوت مە یا حەژێ كری پاشی یا شوی پێكری ئەڤێ بێخنە بەر بەرسڤا پسیارا (10) كو 42٪ دێهێلن كچا وان دلدارییێ بكەت 30٪ دێ هێلن د سنورەكێ تەنگدا . پاشە لناڤبارا 70٪ و 42٪ چەندە ، ئەوێن بڤیان شویكری بوچی ناهێلن كچا وان بڤیان شویكەت خو ئەڤە ژی گونەها مێركی نینە ... ؟-

هەروەسا هەكە ئەم بهێن بەرسڤێن هەردو هژمارێن ژنكا شرڤەكەین دێ بینین كو راستە ژنا نەخویندەڤان پتر یا بندەستە لێ ئەڤ جوداهییە گەلەكا كێمەو هەكە ئەم بەرسڤا پسیارا (4) ژنێن نەخویندەڤان دگەل بەرسڤا پسیارا (9) ژنێن خویندەڤان بەرانبەركەین دێ بینین كو ژنێن خویندەڤان 42٪ بڤیان یاشوی كری 42٪ مال مێرێ بو هەلبژارتی و 16٪ چ نەگرت لێ ژنكێن نەخویندەڤان 70٪ بڤیان یاشویكری و 30٪ مال مێری بو هەلبژارتی .

لڤێری چ بو مە بەلی دبیت ..؟
كو مافێ هەلبژارتنا هەڤالێ ژیانا ژنێ گەلە جارا یێ هەی . هەروەسا ژنا نەخویندەڤان پتر یاڤیای ژیانەكا بنەڤین هەلبژێریت ئەڤەژی مافكە . لێ ئەڤ مافە ژنا خویندەڤان یێ لبەر خو بەرزەكری و یا مایایە بتیڤەرێزاڤە . ژنا كورد یا نەخویندەڤان گەل مەزن بەرێ خو ددەتە ڤیانێ وەكی مریدەكی یا پێڤە شەیدایە ، دلێ وێ یێ پاڤژە وەكی پەرێ نێرگزێیە هایژ پارەی و زێرو مالا نینە ، هزار نمونە مە یێن هەین كو ڤێ كچێ هەمی تشتەك یێ گوری ڤیاتێ كری و هزار هزار (حەیرانوك) مە یێن هەین كو دیاردكەن كچا كورد چەندا شەیدابویە بدلدارییا خوڤە .

لێ مخابن كچا ئەڤرو یا مایە بهندێڤە كی دشێت زەندیێن وێ تژی بازنیێن زێری بكەت ، ئەڤە ژیلناڤ جڤاتێن لاوا گەلەكا مشەبوی . هەما هەرێن هێڤكەن خویندكارێن زانكویاو گەلە خاندنگەهێن دێ ، دێ سەرێ هەوە جریست گریت هەر ژ جلو كارێن وان هەتا هزرو بیرێن وان .

هەرچەندە ئەڤە هەمیا ناڤەگریت لێ كتەكا كێم یا دناڤ دا كو جوانتر هزرا خو دكەن هەكە گولێ بو هەڤالەكا وان حەژێكی كر ئان شوی یێ كر ئێكسەرو بێ شەرم دێ پرسن یێ هەییە ، تورمبێل هەیە ، چ زێر بو چێكرینەو كراسێ بویكینێ ژ كیش وەلاتێ دەرڤە بو ئینایە .

دەكی دیژی دروینن لجڤاتا بەحسی ماڤ دكەن .. ! كچا ئەڤرو هێشتا یا بهندێڤە نوسیایە كو وەكی بویكەكا شویشەی بیت كارێ وی و زێرێن وێ پێڤەبن و بلا بهێتە فروتن بهارە .. !!
خویندەڤانێن هێژا : كچا گوندا گەلە جارا بزورداری یا

دایە پیرەمێرەکێ هەیی‌و خودان مال‌و تەرش و گەلە جارا کچا رەڤی‌و ئەڤ شوییە نەکرییە ، لێ کچا ئەڤرو یاخوێندەڤان ئەو بخو دێ ئێکی هەلبژێرت ، تەمەنێ وی چەندە ، هزرو بیرێن وی چنە مهانە نینە یا پیدڤی ئەوە کو دێ زێراو جلکێن ببها بو کریت‌و کەتە د سینگێ تورمبیلەکا دەلال دا .. !!

ئەز دزانم گەلە گەنجێن خوێندەڤان دێ وەزانن کو ئەڤە زوردارییە ئەز دکەم لسەر هزرو بیرێن وان لێ بلا لدور خو بزڤرن دێ چەند ژ ڤان لنوناو خراب‌تر بینن‌و ئەوێن بباشی هزرا خـو دکەن هژمارا وان ناگەهتە تبلێن دەستا .

هەتا نهو مە بارێ ژینا ژنێ زانی‌و ئەو پیفکێ تێدا دژیت‌و بو هندێ دا رامانا خو بگەهینین لڤێ نڤیسینێ مە هژمارەکا مێرکا وەرگرت کو هندەك خویندڤان‌و هندەك نەخویندەڤانن مە چەند پسیارەك ژێکرن

(3)

ئەڤە هژمارەکا مێرکا یێن خوێندەڤان کو زانکو خاندی‌و پێدا :

س 1 تو چ دبێی بو وان ئەوێن ژ ژنەکێ پێتر دئینن

28٪ شولەکا باشە

58٪ باش نینەو سەرگێژییە

14٪ لدویڤ بارێ مروڤی‌یە .

* * *

س 2 تو چەوا خاندنا ژنێ دبینی .. ؟

42٪ باشە بو پارەی

28٪ مافێ وێ‌یە

30٪ پێـدڤی نینە سـوبەهی دێ شـوی‌کەت‌و مـێر دێ بخودان‌کەت .

* * *

س 3 سەربەستیا ژنێ لسەر رابون‌و روینشتنا وێ‌یە ئان لسەر رەوشتێن جڤاکی یە .. ؟

58٪ لسەر جڤاکییە

28٪ لسەر ژنێ بخو راوستیایە .

14٪ لسەر هەردوکایە .

* * *

س 4 تو دبینی تێکەلیا ژن‌و زەلاما یاپێدڤییە .. ؟

58٪ بەلێ .

28٪ نەخێر ئالوزی ژێ چێ‌دبن .

14٪ لسەر جڤاکی راوستیایە .

* * *

س 5 تو چ دبێی بو مافێن ژنێ .. ؟

42٪ مافێ وێ‌یە و بلا وەرگریت

42٪ چ ماف بێ نەڤێن .

16٪ ژن یا بن‌دەستە وپێدڤی هاری‌کارییە .

* * *

س 6 باشە دانا مافا لسەر چ دراوستیت ، رەوشەنبیریا ژنی ئان یاجڤاکی . ؟

58٪ لســەر ژنێ راوستیا یــە چــەنـد دشێت خــەلەتیێ نەکەت .

42٪ دڤێت جڤاك د ڤان مافا بگەهیت هوکە یا ژخویە ژن خو پەلاڤێژیت .

* * *

س 7 تو چەوا هێڤ‌دکەیە راست‌کرنا یاسا (احوال شخصية) یا دویما هیێ .. ؟

28٪ ئەم دژی وێ راست‌کرنی‌ینە

42٪ یاباشە

30٪ ئەڤە گونەهــو زوردارییە بمێرکی دکەڤیت .

* * *

س 8 تو چەوا بەرێ خو ددەیە شوی‌کرنا کچێ بێی رازی‌بونا دەیك‌و بابا .. ؟

42٪ هەکە ئێکو دو بڤێن‌و تێك‌بگەهن بلا .

28٪ ئەم دژی ڤێ شوی کرنێ‌ینە چنکو دێ جڤاك ژێـك ڤەبیت .

30٪ شوی‌کرنا هوسا نابیت ببیت . دڤێت کەس و کارێن کچێ د رازی‌بن .

* * *

س [illegible] ته [illegible]فیت ته [illegible] روّ هه‌بن . کچ ئان کور .. ؟
[illegible] مه [illegible]فیت . بیّ جوداهی لناڤبه‌را کچ‌و کورا .
[illegible] [illegible] رو گرفتاری‌نه‌و مروڤی ئالوزدکه‌ن ، چ کور بین چ کچ

* * *

س [illegible] تو چ دبێی لو فه‌شارتنا ژنیّ د بن عه‌بای‌ڤه .. ؟
[illegible]5 ژ لایێ ئایینی ڤه باشه .
42 بو جڤاکیّ مه پێبدڤییه .
43 پێدڤی‌نینه

* * *

س [illegible] تو روژه‌کیّ ددانی بمینیه لمال لناڤ زاروێن خو ؟
15٪ هنده جارا
58٪ نه‌خێر
27٪ هنده روژا هه‌کو شول نه‌بیت ئه‌ز دمینمه لمال

* * *

ژ به‌رسڤا ڤان چه‌ند پسیارا دیاردبیت کو گه‌له‌ك ژ زه‌لامێن مه یێن خوینده‌ڤان‌و خودان شهاده دگه‌ل هندیّ‌نه کو مێر بلا گه‌له ژنا بینیت هه‌روه‌سا لناڤ ژناژی هه‌بون لڤیّ چه‌ندیّ .. هه‌روه‌سا د ناڤدا هه‌نه کو دبینن خویندنا کچا پێدڤی‌نینه‌و دبینت کو راست کرنا یاسا (احوال شخصیة) یا دویماهیێ زورداریه لمێرکی دهێته‌کرن . هه‌روه‌سا لبه‌رسڤا پسیارا (11) دیاربو کو 58٪ ژ مێریکێن مه چ روژا نادانن بمینه ل مالا خو و چ هه‌ڤپشکی دگه‌ل ژنا خو نینه ما کیش خوشتره برا ته ل مال هه‌ڤاله‌ك هه‌بیت ئان ته رشه‌ك هه‌بیت . ئه‌ز دبێژم هه‌که مێریکێن مه یێن خوینده‌ڤان بویجه‌ك له مێژویا ملله‌تیّ خو بزڤرنه‌ڤه یا بسته بو دشیا دگه‌ل خه‌لکیّ بئاخڤین بێی ترس ژنا کورد هه‌را سه‌رفه‌رازبیت‌و ئه‌ڤه باش‌و قه‌نجییه نه‌کو گرفتاریه‌و دڤیّ ژنا کورد هه‌را سه‌رفه‌رازبیت ویّ مێژوییّ به‌زره‌نه‌که‌ت ئه‌و ملله‌تیّ مه بوراندی .

نوکه دیّ هێڤ‌که‌ینه هژماره‌کا دی یا مێریکێن نه‌خوینده‌ڤان کانیّ به‌رسڤێن وان چنه .. ؟

س 1 تو ژنا خو دبه‌یه گه‌ریانیّ .. ؟
100٪ نه‌خێر

س 2 ته بخو ژنا خو هه‌لبژارتییه ئان مال بو ته ئینایه
42٪ مال یا بو من ئینای .
58٪ من بخو یا بخو هه‌لبژارتی بڤیان ..

* * *

س 3 تو دبینی باشه ژ ژنه‌کیّ پتر بینی .. ؟
58٪ به‌لیّ یاباشه
42٪ پێدڤی نینه .

* * *

س 4 تو چ دبێی بو ڤان مافێن ژنیّ دڤێن .. ؟
42٪ چیّ‌نابیت چنکو ژنك بخو کێم‌تره ژ مێرکی .
28٪ بو ژنیّ خارن‌و جلك به‌سن .
30٪ باشه .

* * *

س 5 ته چ جارا تێکه‌لیا ژنکه‌کا ده‌همان‌پیس کرییه‌و تو یێ بژن بوی ئان نه .
58٪ نه‌خێر
42٪ به‌لیّ‌و ئه‌زیّ بژن بوم

* * *

س 6 تو دبێی خاندن بو کچیّ یاپێدڤییه .. ؟
42٪ گه‌له‌کا پێدڤییه
42٪ پێدڤی نینه
16٪ وه‌کی ئێکه .

* * *

س 7 دیّ هێلی کچا ته لدویڤ دلیّ خو شوی‌که‌ت ؟
15٪ دیّ هێلم .
42٪ ناهێلم ، چنکو ئه‌و نزانیت چ یێ بو باشه
43٪ ناهێلم حه‌ژ که‌سیّ بکه‌ت ، لیّ ئه‌ز بزوریّ ژیّ ناده‌مه‌شوی .. !

* * *

س 8 تو چ دبێی بو ڤەشارتنا ژنێ و عەبای .. ؟
28٪ بو ئایینی یاباشە
42٪ بو جڤاکی مە یێ باشە
30٪ پێدڤی نینە ..

* * *

س 9 تو چ دبێی بو بەردانا ژنێ .. ؟
42٪ شولەکا پیسە
28٪ هندەجارا یاباشە .
15٪ گەلەکا باشە .
15٪ (چ بەرسڤ نەدان)

* * *

هەکە ئەم بهێن ڤان بەرسڤا شروڤەکەین ، پسیارا (8) ژ ژنکێن نەخویندەڤان دگەل بەرسڤا پسیارا (9) ژ مێرکێن خویندەڤان . مە دیت 67٪ ژ ژنا دبێژن مە کوڕ دڤێن چنکو شوینوارە ئانکو بناغەیە . لێ 70٪ ژ مێریکێن خویندەڤان دبێژن کچ و کوڕا چ جوداهی لناڤبەرا هەردوکا نینە .

ژبلی هندێ کو مێرکێ خویندەڤانە و ژنا نەخویندەڤانە ڤێ مالکێ بهێلن لێ ئەو بخو ژنکە و کچ نەڤێن لڤێری ئەم ستوییێ کێ بگرین و بێژین مافێن مە کا .. ؟

ژنك بخو دبێژیت کوڕ شوینوارە لێ کچ بەلایە و مالێ خەلکێیە . ئەڤە گوتنە ژی دبیتەکرن دەمێ دایك زاروکا بخودان دکەت و کچێ هەر ژ روژا ئێکێ تەپەسەر دکەت . ڤێجا سەیر نینە خویشکا من هەکە مێرك ژی تە تەپەسەر کەت .

دیسا وەرن پسیارا (2) ژ مێریکێن خویندەڤان کو 42٪ دبێژن خاندنا ژنێ یاباشە ژبەر پارەی ، 30٪ پێدڤی نینە ، 28٪ دبێژن ماڤ وێیە ئەڤێ چەندی بێخنە بەر بەرسڤا (7) ژ مێریکێن (نەخویندەڤان) 42٪ دبێژن خاندنا ژنێ یاباشە و نە گوتیە ژبەر پارەی .. !!
42٪ دبێژن پێدڤی نینە ، 16٪ وەکی ئێکە .

ڤێجا خویندەڤانێن هێژا کا جوداهی لناڤبەر خویندەڤان و نەخویندەڤانا .

جارەکا دی وەرن هێڤکەنە بەرسڤا پسیارا (10) ژ مێریکێن خویندەڤان کو لسەر ڤەشارتنا ژنێیە 15٪ دبێژن ژبەر ئایینی یاباشە 42٪ ژبەر جڤاکی یاباشە ، 42٪ پیدڤی نینە . ئەڤێ بێخنە بەر دگەل بەرسڤا پسیارا (9) ژ مێریکێن نەخویندەڤان 28٪ دبێژن ژبەر ئایینی یا باشە ، 42٪ ژبەر جڤاکی باشە 30٪ پێدڤی نینە . لڤێری کا جوداهی لناڤبەرا ئێکێ زانکوخاندی و ئێکێ پەیڤا ژێك نەنیاسیت .

خویندەڤانێن هێژا :

هەرچەندە مروڤ د هەلشکاڤتنەکا هوسا سڤك و بلەز ناگەهیتە چ ئەگەرێن راست و رەوان لێ مروڤ دکاریت دا ڤێ هەلشکافتنێدا بێژیت ئەگەرا پاشکەفتنا ژنێ هەر ژن بخویە و ئەگەرا پاشکڤتنا جڤاکی ژن و مێرن هیڤیدارم ئەز شیابم نێزیکی رامانێ ببم ئەو رامانا کو لبەراهییێ من دانایە بەرسینگێ خو کو بگەهمێ ، ئەو ژی ئەوە کو دڤێ بەری ئەمە مێرکی هشیارکەین کو د ماڤ ژڤێ بگەهیت و دڤێ ژن بخو ژی هشیاربیت . و یاپێدڤی گوتنێ ئەوە کو ئەڤ توێژدانە بدرێژی من دگەل سەیدایێ خو (علی الجابری) دەمێ ئەز خویندکار لزانکوییێ پێشکێشکریە لخەلەکا (دراسی) یاکو زانکویا سلێمانییێ 1978 دگەل ئێکەتیا ئافرەتان گرێدای و لوی دەمی ئەڤ توێژدانە هاتەدیراسەکرن .

* * *


ژێدەر

1 سامیە شاکر / کوڤارا یاسای ئوتونومی هژمارە 1 2 ب 13
2 باسیل نیکیتین (الاکراد) بەرهەڤکرنا روژهەلاتناس (لوی ماسینون)
3 روژناما عیراق هژمارە (77) ب 1976/5/20
4 التآخي 1975/9/18 (ژیانا جڤاکی لکوردستانێ)
5 الاکراد الدکتور شاکر خصباك
6 روژی کورد هژمارە (2) تموز 1971 ب 18 — 19
7 فؤاد حمه خورشيد دراسة ميدانية ، روژناما عیراقێ
8 المجموعة الاحصائية ، وزارة التخطيط لعام 1976 ، رقم 1/4 و 2/14 و 4/14 و 9/14 جدول رقم (20)
9 المجموعة الاحصائية للسنوات 1976 — 1977 المحاكم الشرعية في دهوك ، اربيل ـ سليمانيه جدول رقم 12/2 احصاءات عام 1976
10 چاڤپێکەفتن دگەل قازیێ دهوکی ل روژا 1978/3/5
11 روژناما (الفكر الجديد) ب 1976/10/9

## سکاڵای دلدارێک

لە ناخمدا ...
ئەوینی تۆ ،
دای چاندوە شارەگەو تۆ ،
بۆیە کەرچی رێکەی کۆچت ،
لێم گرتەبەر ،
لەسەر رێگای هەر رێبوارێك ،
لە جێژوانی گشت دلدارێك ،
چرۆ ئەکاو دێتەوەبەر .

* * *

هۆ مەتوانی(1) ....
دڵەی پڕ ئێش و زامدارم ،
لە دووری تۆ ،
زۆر لەمێژە ،
وشکە سەرچاوەی ڕوبارم ،
ساڵەهایە ... ،
بەشوێن سۆراخی تۆ وێڵم ،
یان پێت ئەکەم ،
یا ستەمە مانەوەم لای هۆزو خێڵم

* * *

(1) مەتوان = مەرمەم

* جلال حمد امین *
* کۆیە *
1983/10/6

## ناوت گۆرانیێکی باڵداره

مظفر عبدالرحمن حبیب «سەرکەڤری»
کۆلیجی پزیشکی زانکوی سەلاحەدین
شوبات / 1984

که ناوت دێ
خەیاڵی نوستووم هەڵدەستێ
گیانم ئەبێ بەیەك شەختەو ..
ووشە لەزارما دەبەستێ ... !

که ناوت دێ
هەموو دونیا هێمن دەبێ

تەنها سەدای ناوەکەی تۆ
بەگوێما دێ

که ناوت ئەبیستم لەدوور
ئارام ناگرم
دەبڕم سەد ئاستەنگ‌و سنوور ... !

شنەی ناوت
وەك گزەبای ڕێبەندانە

گیانم دەهێنێتە لەرزە
هاژەی قەڵبەزو چەمانت
قولاپێکە
دڵم دەردێنێ لە جەستە

ناوت تاجی ڤینی منی
کردۆتە سەر
شەپۆلێکە
بەلەمی هەست‌و بیرمی
خستۆتە گەڕ

ناوت کانی پەرگەی دێیە
کە هەیڤەشەو
مانگ قژی تیا دەکا شانە ... !!
گۆرانیێکی باڵداره
گەرووی هەموو هەزارانی
بۆخۆی کردووە بە هێلانە !

# پێنووس و ترس

**مەهاباد قەرەداغی**
**کفری**
**تەمووزی 1983**

## - 1 - ترس

ئەگەر خامەی شاعیر ترسا
ووشەکانی نابن بە ووشەی ناو فەرهەنگ
ئەگەر گەردن لەپەت ترسا
سۆزی گەرووی نابێتە دەنگ
گەر لاپەڕە لەگڕ ترسا
شیعر ئەبێتە سووتووی بێ ڕەنگ
پیتی خامەو ، سۆزی دەنگو ،
شیعری شاعیر ، کاتێ لەناو دڵدا ئەژین
بێترس بپێون ئاسمانو ، ناخی زەمین

## - 2 - پێنووس

پێنوس گەر نەیتوانی ووشە
بگۆڕێتە کڵپەی ئاگر
بائیتر بێدەنگ دانیشێ
گەر لاپەڕە نەیتوانی بێتە دەریای خوێن

با کۆتری ووشەی لەسەرا نەنیشێ
ئەگەر شاعیر ؛
نەیتوانی ئاگری نەورۆز بکاتەوە
بائیتر دەم نەکاتەوە ..

---

—

پێشکەش بێت بەو ئیلهامەی ڕەگی
تەمەنی لە بەهاری ژینم داکوتاوە

—

## کچە کوێستانیەك لەغەمی سەوزی شاعیرێکدا

تۆ بە نێو گیانی تەزیوما
بە هەستی شاعیریتی‌ما
دەچیتە خوار
سەرتاپای لەشم ئارامە
تەمەنم لەگوڵ دەنیشێ
گوڵی بەهار
ئای چەند هێمنیم خۆش دەوێ ... !
تۆش هێمنی ! ؟
ئای چەند نهێنیم خۆش دەوێ .. !
گیانت پڕە لە نهێنی ! ؟

* * *

نازدارەکەی دیوەخانم
چرای ماڵم ...
گیانم لەتەك غەمی تۆدا .. تۆی ژیانم
ئەتوێتەوە ... !
ئەستێرەیەکی ئاسمانم
ئەگەر گیانم کڵپەو گڕ بێ
بە شەپۆلی ڕوباری تۆ
ئەکوژێتەوە ... !

عومرم عومری داربەڕووە
داربەڕووی لەبن نەهاتوو
دەستم زبرە لەشم ماندوو .. !
وەك داربەڕووی ووشك هەڵاتو .. !
لەتۆ دوور بووم
بۆیە هەناسەم تەڕو توشە .. !
دەبا تیشکی ڕۆژ لەچاوانم کەوێ ،
هەناسەی کچە کوێستانی ،
لەنێو خوێنمدا ئەسرەوێ .. !

* * *

کچی کوێستان
تۆ ئاوازێکی شیرینی
لەڕەی دەنگت چریکەو دەنگی ڕۆژگارە
سۆزو نازت ڕەنگی شیرینی بەهارە
شەو لەگەڵ یادەوەریدا ئەسوتێم
تۆ یادەوەری ژینمی
هەناسەکانم ئەمرێنم
بۆیەك هەناسەی سەرفراز
هەرگیز دڵت نارەنجێنم ...

—

**کامەران غالب**
**سلێمانی**

—

پێشکەشەبە « ب »

# ژان

● ابراهیم علي رسول ژاژڵەیی ●

سلێماني ـ مجید بگ

حەزم ئەکرد ببمە تۆزی خۆڵەمێش و
هەر یەکەم جار تۆم نەدیایە
یا ببمە قەترەیەك ئاوو
بەناو دەروونی زەوی‌دا ڕۆچوومایە
حەزم ئەکرد بۆ یەکەم جار
سەرنجم تامی جوانیتی نەچێشتایە
ئێستا خەمی جوانیت ناخۆم
چونکە جوانی بەهارێکە دێت و دەڕوا
بەڵام ژانی یادگارەکان ... ئازارێکە لە دڵمایە
یادگارت بەهارێکە بێ کۆتایە
لەگەڵ بوومە لێڵەی شەوا
مۆتەی خەم بەسەرما دەکشێ
شەو ڕادەشکێ ... هەرچەند دەکەم
من هێشتا هەر خەوم نایە
ئازیزەکەم چاك ئەزانم تۆش وەك منی
تۆش وەك من ژان لە دڵتایە
ئازیزەکەم گوێ بگرە لێم
گەر لە دەروونم تێ‌دەگەی
خۆشەویستی بناغەی دین و دونیایە
ژیان بێ بەڵێن و ڕاستی بەرەڵایە
پاییزێکە زەرد هەڵگەڕاو ژیانی من و تۆ ئێستا
پاییز مەرگی هەزاران گوڵی لەدوایە

« کورتە چیرۆك »

# شاری نامۆیە

ئەورەحمان عەلی

هەروەکوو زۆرکەس دڵدارێکت هەبوو لەوەرزی بەهاری ئەمساڵدا بەجێی هێشتی و ڕۆیشت ، جوانێك دڵدارت بوو لەکۆتایی بەفرو بارانی دەروونتدا شرە بزگوڕی پێچایەوەو لەئازارو ئەشکەنجە زێتر چی‌دی بۆ جێ‌نەهێشتێ ..... ئەوکیژە نازدارەی تادوێنێ لەگەڵتدابوو ، ئەوکیژەی بۆماوەی دووساڵ هەموو شەوێ هەر بەخەیاڵ دەتهێنایە ژوورە پڕلە پەرتووکەکەتەوە لەڕۆژێکی ڕەهێڵە بارانی شارێکی دووری خۆتاندا ئاشنایەتیت لەگەڵدا پەیداکرد ، دەنووزایەوەو فرمێسکی تێکەڵبووی لەگەڵ باراندا دەسڕی ، جانتای دەستیان فڕاندبوو ، تۆش خوویەکەو گرتووتە بۆ دڵدانەوەی ئەمجۆرە مرۆڤانە ڕێگای دوورو نزیکت هەرلەهاتوو چوونە ....

« لەو شارەی دوور لەسۆزو میهری دایکت دەژیای خۆت بەنامۆیەك دەزانی زۆر کەسیشت بەنامۆ دەهاتەبەرچاو بۆیەناوت لێدەنا شاری نامۆیی »

ـەو ماوەیەی لەوشارە مانەوە بێدەردی سـەری‌و قرەوبـڕەو ـووڕلەفڕوفێڵ وەکو دوو دۆست دڵتان بەیەکدی‌دا بەڕادەیەك ـش گەرانەوە کەشت نەتدەوێرا ئەوەندە بچی بەلای هەموو کیژێکدا لەترسی ئەوەی نەبادا سەرنجی پڕلەسۆزاویت لێ‌زەوت ـکری‌و لە خۆشەویستەکەت بکا .....
کلتێ خامەت بەپەنجەکانتەوە شۆڕدەکردەوە جوانترین سلاوت بۆدەڕازاندەوە :

- سلاوێکت پێش‌کەش دەکـەم ناسکتـرلەپەڕەی گـوڵ قەشەنگ‌تر لەگزنگی خۆر
داوات لێ‌دەکرد هەرگیزاو هەرگیز گرژو مـۆنی لەڕوخساریـدا نەنوێنێ چونکەبـەم کارە بێ‌ڕوودانی هیـچ کارەسـاتێك هـەر لەخۆوە دڵت تەنگ دەبوو ، ناشرین‌ترین دیمەنی پڕلەنەگبەتیت لەپێش‌چاو دروست‌دەکرد ، بۆیە دەتنووسی :
- ئازیزەکەم هیوام وایە زەردەخەنەی سەرلێوت هەمیشـەیی بێت ....

« قسەوباسی ڕەنگاوڕەنگی سەر پارچە کاغەز نـاتوانێ کارێکی ئەوتۆ بکات بـۆزۆر بوون‌و کـەم‌بوونی خـۆشەویستی لەقـالبی مرۆڤـایەتیـدا » بۆیـەتۆش بـەخـۆتـدا ڕانـەدەدیت هەمووڕازێکی دڵەبێ‌ئارامەکـەت باوێیتـە سەرئـەو نامـانەی بۆت‌دەنارد .

[ بـەیەك گـەیشتنی دڵداران‌و دەست لەمل‌کـردنی هـەمـوو زیندەوەرێکی سەرئـەم زەمینە ، دروشمی ڕەسـەنی وەرزی بـەهاری ڕەنگینـە ، دڵداران هەمـوو ڕازو گلەییەکی خـۆیان ڕاست‌و ڕەوان لەزینـدانی سنگیـان ئـازاددەکـەن لەپێنـاوی هـەڵدانەوەی لاپـەڕەیەکی گـەش‌و بێ‌لەکە لەجیهـانی پڕلە خۆشەویستیدا ، دەرگای هەڵگلۆفتنی کوڵم‌و ماچی دەم‌و لێوی بـاریك‌و دەست‌هێنـان بەنـاوقژی ئـاڵتوونی‌و قـەتـرانی‌و ... وەکوهەموو خونچەیەکی نەورۆزی ئەم وولاتە شرینە کراوەیە ]
بەڵام بەهاری ئەمساڵی تۆو نموونەی وەك‌تۆ خەزانێکی گـوڵ هەڵوەریوی بەتاسەو‌ئارەزووە ، هەڵوێستی ساتەکانی ئەڤینتان دەهێنیـەوەیـاد کـە چـۆن سکـالای دڵت بـۆ هـەڵدەڕشت هەلیدەڕشت ، بەجیهانی خەیاڵ لۆش دەبیەوەو لەهاوارهاواری خۆت بەئاگادێیەوە :

- بۆبەم دەردەت بردم بۆ ؟ کێ‌وای لێکردی ئەم‌هەموو درۆو دەلەسانەم بۆبڕە خسێنی ؟ ... تائەم نزیکانەش بەدوای ئـەوبرایـەیدا وێـڵ‌و سەرگـەردان بـووی کـەهـەر بـەدرۆو تەڵەکەبازی لەبۆی دروست‌کردبووی‌و لەپێناوی ئەودا ڕووتی دەکردیەوە ...

هەرلەپێناوی چاوانی ئەودابوو زۆرلەگۆرانی بیژانی شارەکەت خۆش نەدەویست . ئـەوانەش کـەهاوەڵی سـەردەمی منداڵی خۆت‌بوون ، سەرەتای لاوی‌و خوێن گەرمیتی بەحەسحـەسی پێکردنی باڵالەبـەر چاو ڕێـك‌وپێکەکـەی فەوتـاند لەشـانۆی زیندەگیدا هیچ‌ڕۆڵێکی پێ‌نەدای بۆئەوەی خەڵکی ئاشنات‌بین‌و لەم‌لاو ئەولا باست‌بکەن ... پێ‌ی دەووتی :
- .. م‌بێ سـڵکـردنـەوە پێت‌دەڵێم زۆرم خـۆش دەوێ‌ی ، خۆشەویستیشم لەسەر بناغەی سەرەتای ووشەی نامەکـانم تاکۆتایی‌دواهەناسە لەسییەکانم دامەزراوە ..
بەڵام‌ئەوەندەت زانی هەمووکارێکی خۆی لەگەڵ لاوێکی دیدا مەیسەرکردووە تۆش هەر بەحەسحەسی مـاویتەتـەوە ، پاش بەدەرکەوتنی ئەم‌ڕەفتارە ناشرینەی‌وبەهـۆی تەقـاندنـەوەی دواقسەت بەسەروچاویەوە خۆت لەکـۆتی خەت‌و پلەوپـایەی سەرزارەکی ئازادکرد :

« ئەی مرۆڤە لەخۆبایی بووەکە ڕاستە فرێتدامـە سەر ڕێگایەکی بێ‌یاساو نمرەو نیشانەی هاتووچۆکردنەوە ، بـەلام بۆکوێ ملی‌ڕێ دەگری هەر دەقۆزرێتەوە ، لەلایەن منەوە ؟ نا ! چونکە ڕێزی مرۆڤایەتی دەگرم ، ڕێزی هەموو کـەسێك هـەر لەگەورە تابچووك ، هەرلەزاناو لێهاتووەوە تائـەو کەسـانەی لەگێژاوی نەفامی دەژین ، بەڵام ئەوی دەم نادەم دڵی خۆمی پێ‌دەدەمـەوە ئەوەیـەکە بـۆم دەرکەوت هـەمـوو دەروونێـك قەتماغەی تەلای بێ‌گەرد لەخۆی ناگرێ نێستە بۆم ئاشکرابوو ئەی‌مرۆڤە سەرکەشەکە لەبری سوپاسی ئـەودیاریـانەی بـۆم دەناردی بۆچی پێـلاوی هەڵگـری دیارییـەکەت مـاچ دەکردو دەتلێسایەوە ! و کوێستانی ژینی منیشت بـەفرپـۆش دەکردو پاشان دەخزامە شێـوەی‌ووشەیـەکی زەرد هەڵگـەڕاوی واوە کـەڕەنجێکی زۆرت دەدا بۆئـەوەی بگـەڕێمـەوە بـارو دۆخی جارانی خۆم .. »

شانۆیی بۆ منالان

# هاوڕێی گیانداران

شەفیق محەمەد

پەیمانگای هونەرە جوانەکانی سلێمانی

[ نووسەر لەنێو چەپکە تیشکێکەوە دەردەکەوێ و لەگەڵ بینەران دەدوێ ]

**نووسەر**

منالە ئەزیزەکان ، هاوڕێکانم . چەند ڕۆژێك لەمەوبەر بڕیارمدا گەشتێك بکەم ، واش هات بەخەیاڵدا ئەگەر هاتوو شتێکی سەیرم هاتە سەر ڕێ یان ڕووداوێکی خۆشم دی بیکەمە شانۆیی‌یەك و پێشکەشتانی بکەم ، بەڕێکەوت ڕێم کەوتە دارستانێك بەڕاستی نازانم چۆن وەسفی جوانی و خۆشی ئەو دارستانە بکەم ، منالینە دارستانێکی ئەفسووناوی و سەر سوڕهێنەر بوو ، لەهەمە جۆر درەختی تیا چاندرابوو ، ئەم دارستانە لە نزیك شارۆچکەیەکەوە بوو ، ئەو شارە بچکۆلانە لەجوانی و قەشەنگی‌دا لەوە دەچوو هونەرمەندێك کێشابێتی و نەخشاندبێتی ؛ خۆشەویستان سەرووی دارستانەکە کێڵگەیەکی فراوان بوو ، لەهەمەجۆر کشتوکاڵی تیا چاندرابوو کاتی دروێنەو کۆکردنەوەی هات بوو . ئەزیزەکانم تازە خۆرهەڵات بوو کەگەیشتمە ئەو دارستانە ، تەنها توولە سەگێکی ئێسك سووك و جوانکیلە لەخەو هەستابوو ، ناوی زەردە بوو ، زەردە خەریکی نووسین بوو . [ شانۆ ڕووناك دەکرێتەوە . دیمەن : ئەو دارستانەیە نووسەر باسی کرد ] ئەمە زەردەیەو دەمەوێ چەند پرسیارێکی لێ‌بکەم .

**زەردە**

فەرموو ، بپرسە . [ دەفتەرێکی بەدەستەوەیە ]

**نووسەر**

زەردەخان لەم دارستانەدا لەگەڵ کێ دەژی ؟

**زەردە**

لەگەڵ ئازاو گیانداران .

**نووسەر**

ئەو ئازایە کێ‌یە ؟

**زەردە**

منالێکەو تەمەنی — 11 — سالانە لەناو خەڵکی‌دا بە « هاوڕێی گیانداران » ناسراوە ، بۆ هەر شوێنێك بچێت دەمبا لەگەڵ خۆی .

**نووسەر**

زەردە ئەو شارۆچکەیەی نزیکتان جوان و دڵگیرە ، خەڵکەکەی چۆن دەژین ؟

**زەردە**

چەند کەسێکی کەم نەبێ هەمووی کاردەکەن . بەلام شتێکی سەیر .

**نووسەر**

چی‌یە ؟

زەردە

ئەوانەی کار دەکەن نیانە بیخۆن ، بەلام ئەوانیتر هەموو کات میزیان بەخواردنو خواردنەوە رازاوەتەوە .

نووسەر

ئەی کێ ئەو شارە بەڕێوە دەبات ؟

زەردە

یەکێکە لەوانەی کار ناکەنو پێی دەڵێن « هوها » .

نووسەر

[ بێدەکەنێ ] هوها ؟!

زەردە

بەڵێ هوها .

نووسەر

ئەم کێڵگەیەی تەنیشتتان هی ئەوە ؟

زەردە

ئەم کێڵگەیە پێی دەڵێن « کێڵگەی گەورە » و موڵکی ئێمـەی گیانداارانە .

نووسەر

چۆن ؟

زەردە

بەڵێ خۆمان کێڵاومانەو چاندوومانە .

نووسەر

ئەمەشتێکی زۆر جوانە ئەگەر زەحمەت نەبێ پرسیارێکی تر .

زەردە

فەرموو .

نووسەر

ئەی ئەم دەفتەرە چی یە ؟

زەردە

هەرچ ڕووداوێکی گرنگ لەژیانی ڕۆژانەماندا ڕووی دابێ تیایا تۆمارم کردووە .

نووسەر

ئەمە کارێکی جوانو مـەزنە ، دەتـوانم بزانم چی تیـا تۆمـار کراوە ؟

زەردە

بۆ دەتەوێ بزانیت ؟

نووسەر

تاکاتێ گەڕامەوە بۆ منالانی شارەکەمی بگێڕمەوە .

زەردە

بۆ بۆیان دەگێڕیتەوە ؟

نووسەر

تـاسوودی لێوەربگـرن ، تافێـربن چاکـە بکـەنو لەخـراپـە دووربکەونەوە تایەکتریان خۆش بوێو یەکتر لەیاد نەکەن .

زەردە

زۆر چاکە . کاتێ بۆت گێڕانەوە لەکۆتاییدا لێیان بپرسە چی فێربوون ئەگەر نەیانزانی جارێکیتر بۆیان بگێڕەرەوە بەلام ئەو منالەی یەکەمجار تێگەیشتو وەلامی دایەوە ئـەوە زیرەكو ژیرە .

نووسەر

کەواتە بەردەوامبە .

زەردە

[ دەفتەرەکە دەکاتەوە ] ..

[ دیمەن : دارستانە . مەڕ زووڕنـا دەژەنێ ، گوێ درێـژیش دەهۆل دەکوتێ ، گیانداارانیتر هەڵدەپەڕنو سەما دەکەن ، ئازا لەسەر بەردێك لەخوارووی چەپی شانۆ دانیشتووە ڕووەو ڕاستی شانۆو لەبیر کردنەوەدایە ، جلو بەرگـەکەی بـریتی یە لەپێستو خوری گیانداران ... زەردە دەچێت بۆ لای ]

زەردە

ئازا بۆ هەڵناپەڕیت ؟ دووربێ لێت خۆ نەخۆش نیت ؟

ئازا

شتێکم بەخەیاڵدا هاتووە .

زەردە

چی یە ؟

ئازا

[ هـەڵدەستێ ] هـاوڕێیـان ، تکـاتـان لێدەکـەم ڕێم بـدەن قسەیەکتان لەگەڵ بکەم .

گیانداران

[ بێدەنگ دەبن ] فەرموو . فەرموو .

ئازا

گوێبگرن شتێکم بـەخەیـاڵدا هاتـووە ئەگـەر بکرێ شتێکی مەزنە .

کەروێشك

ئەوەی بەخەیاڵی تۆدا بێت مەزن و بەرزە چی یە پێمان بڵێ ؟
**ئازا**
هاورێیان ئەوە زەوی یەکی فراوان و بەرینمان لەبەردەمدایە ، هەروەها کانی و کاریزێکی زۆریش .
**مەڕ**
ئەوە دەزانین . بەڵام دەتەوێ چی بڵێی ؟
**ئازا**
دەمەوێ بڵێم ژیان تەنها یاری و رابواردن نی یە بەڵکو ژیان کارکردنیشە . دەمەوێ بڵێم با قوڵی لێ هەڵماڵین و بکەوینە کێڵانی ئەو زەوی یە، کەباش کێڵامان ئەوسا دانەوێڵەو تووی هەمە رەنگی تیا دەچێنین .
**بەران**
مەبەستت چی یە ؟
**ئازا**
مەبەستم ئەوەیە بەرهەمی رەنجی شانی خۆمان بخۆین و نەچینە ناو زەوی و زاری جووتیارانەوە ، چونکە رەنجێکی زۆریان تیاداوە ، جگە لەشەونخونی و مەینەتی و هیلاکی یەکی زۆریش .
**مەیموون**
زۆر راستە .
**زەردە**
قسەیەکی جوانە .
**ئازا**
ووتتان چی ؟ [ کەمێك بێدەنگی ]
**گیانداران**
رازین . ئامادەین .
**ئازا**
کەواتە با لەئێستاوە دەست بەئیش بکەین .
**گوێدرێژ**
[ دەکێشێ بەدەهۆڵەکەدا ] ئازا گیان من دەمەوێ پارچەیەکم لە زەوی یەکە بۆ جیابکەنەوە تاخۆم بیچێنم .
**ئازا**
هاورێ پێویست بەوە ناکات ، هەموو بەهاوکاری یەکترو بەهەرەوەزی دەیکێڵین و دەیچێنین .
**گوێدرێژ**
[ قاچ دەدات بەزەوی داو دەزەرێنی ] دەمەوێ بەشەکەی خۆم بۆ جیابکەنەوە

**کەروێشك**
تۆ هەر خۆت چیت پێ دەکرێ ؟
**گوێ درێژ**
چۆن چیم پێ‌دەکرێ ؟ سەیرکەن [ بەتوندی دەکێشێ بەدەهۆڵەکەدا ] من بەهێزم دەتوانم هەرخۆم بیکێڵم و بیچێنم و بیشیدرووەمەوە .
**ئاسك**
ئاقڵبە ، ئاقڵ کێ دەتوانێ بەتەنها هەموو ئەو کارانە بکات
**گوێدرێژ**
[ وەك چۆن منداڵێك ورك دەگرێ ] وەك پێم ووتن گەر وانەبێ کار ناکەم
**ژیژك**
لەکەڵی شەیتان وەرە خوارەوە ، ئەگینا دەکەویت و ملت دەشکێ
**گوێدرێژ**
[ قاچ دەدات بەزەوی داو دەزەرێنێ ] نا .. نا .. نا ..
**ئازا**
بەسە بەس ، باشە ئەوەت بۆ دەکەین ، بەڵام ئەوەش بزانە هیچت پێ ناکرێ .
**گوێدرێژ**
حەیفتان نەکرد . وادیارە تا ئێستا بەئازایەتی منتان نەزانیوە .
[ تاریکی ]
**زەردە**
پارچەیەك زەویمان بۆ جیا کردەوە .
**نووسەر**
بۆی کێڵرا ؟
**زەردە**
بەشەکەی ئێمە دەنەوەندەی ئەوەی گوێ درێژ دەبوو ئێمە لە کێڵان و تۆو کردن بووینەوە ، ئەو هەر زەوی دەکێڵا .
**نووسەر**
ئەنجام .
**زەردە**
کەکێڵان و تۆو کردن تەواو بوو ، بریارماندا دارو درەخت بە دەوری زەوی یەکەدا بروێنین گوێ درێژ دیسان بێ عەقڵی خۆی نواندەوە .
**نووسەر**
ئەمەیان چۆن ؟
[ گیانداران خەریکی دارو درەخت رواندنن ، تەنها گوێدرێژ

نەبێ کەروێشک و زەردە دەچنە لای ]
**کەروێشک**
هاورێ بۆ تۆش لەگەڵمان کار ناکەیت ؟ بۆ دارو درەخت بە دەوری زەوییەکەتا ناڕوێنی ؟
**گوێدرێژ**
بۆ بیڕوێنم
**کەروێشک**
کشتوکاڵەکەت لە ڕەشەبا دەپارێزێ ، چونکە وەک دەزانی ڕەشەبای ئەم ناوچەیە بەهێزە ، ئەمە جگە لەوەی دیمەنی کێڵگەکە جوان دەکا ، هەروەها دەتوانی لەگەڵاو بەرەکەی بخۆیت .
**گوێدرێژ**
پێویستم پێی نییە ، ئەوەی کردوومە بەسمە .
**زەردە**
بەڵام ڕەشەبایەکی بەهێز هەڵبکات ، هیچت بۆ ناهێڵێ
**گوێدرێژ**
چی دەبێ بابێ .
**کەروێشک**
ئێمە هاورێین ، لەسەرمانە یارمەتی یەکتر بدەین و بەقسەی یەك بکەین ، ئەمڕۆ تۆ پێویستت بەمن دەبێ سبەینێ من بەتۆ .
**گوێدرێژ**
من قەت پێویستم بەکەس نابێ
**زەردە**
هیچ کەسێك ناتوانێ بەتەنها هەڵبکات .
**گوێدرێژ**
من بێستان و جۆکەم بەدەستی خۆم چاندوو هەرخۆشم تۆوم کردو کەسیش یارمەتی نەدام .
**زەردە**
بەڵام خۆت نەتویست یارمەتیت بدەین .
**گوێدرێژ**
بەرەکەشی تەنها بۆ خۆم دەبێ و نایەڵم کەس دەمی بۆ بەرێت .
**کەروێشک**
ئای کە خۆپەرست و چاوچنۆکی . تۆ تەنها بۆ خۆت دەژی ، ئەوەش هەر بۆ خۆی بژی زۆر ناژی .
**گوێدرێژ**
من گاڵتەم بەم کارە هەرەوەزییەی ئێوە دێت ، دەبینم لەسەر دابەشکردنی لێتان ببێ بە ئاژاوەو ناخۆشی .

**زەردە**
ئێمە تۆ دەبینین پەنجەی خۆت بگەزی و بڵێی ئای چیم بەخۆم کرد .
**گوێدرێژ**
بێ گومان دەتانبینمەوە بڵێن هەر تۆ چاکت کرد گوێ درێژی هاورێمان ، بریا ئێمەش وەك تۆمان بکردایە .
**کەروێشک**
وادیارە قسەکردن لەگەڵ بێسوودە ، با بچین بە لای کاری خۆمانەوە [ دەست دەکەنەوە بەکارکردن ] .
**گوێدرێژ**
عومری باپیریانم هەیە کەچی شەرم ناکەن دێن ئامۆژگاری من دەکەن ، دەشەرت بێ ئەوان چی بکەن من نەیکەم .
[ تاریکی ]
**نووسەر**
[ بێدەکەنێ ] بۆ عەقڵ بەگەورەو بچووکی یە ؟
**زەردە**
بەردەوام کارمان دەکرد ، خۆشەویست ترین شت بەلامانەوە کار کردن بوو لەبژارو پاس کردنی کشتوکاڵەکە تەمەڵیمان نەدەنواند بۆساتێکیش چییە نەمان دەهێشت کێڵگەکە تینوو بێت .
**نووسەر**
هەربۆیەشە واجوانەو بەرهەمێکی زۆری وەبەر هێناوە .
**زەردە**
بەڵێ . کاتێ کشتوکاڵ شین بوو . ڕۆژێکیان هوماو پاسەوانانی بێرەدا ڕەت بوون ، کێڵگەکە سەرنجی هومای ڕاکیشاو چاوی چنۆکی تێبری . بۆیە پاسەوانانی ناردە سەرمان ...
[ دارستان . ئازاو گیانداران لای ڕاستی شانۆن ، دوو پاسەوانیش لای چەپ ]
**ئازا**
چیتان دەوێ ؟
**پاسەوان — ١ —**
هومای مەزن دەفەرمووێت سێیەکی بەروبوومی ئەو کێڵگەو باخە دەبێ پێشکەش بەمن بکرێ .
**ئازا**
بەچ هەقێ ؟
**پاسەوان — ٢ —**
بەو هەقەی ئەم ناوچانە هەمووی موڵکی ئەون .

**ئازا**

نەخێر . ئەم ناوچانە موڵکی ئەو نین .

**پاسەوان ـ 2 ـ**

ئەی موڵکی کێن ؟

**ئازا**

موڵکی ئەو کەسەیە کاری تیا دەکات و ڕەنجی تیا دەدات .

**پاسەوان ـ 1 ـ**

ئای لەو قسە پووچە

**ئازا**

ئەگەر ئەو قسە پووچ بێ ، ئەوا ئەوەی ئێوە هیچ و پووچە .

**پاسەوان ـ 1 ـ**

بزانە چۆن قسە دەکەی زمان درێژ . ئەگەر بەئاقڵانە نەجوڵێنەوە نرخێکی زۆرتر دەدەن لەوەی داوای دەکەین .

**ئازا**

ڕەنجمان تیاداوەو نەسرەوتووین تا ئەوەمان بەرهەم هێناوە ، ئێستا چۆن دەهێڵین ئەوەی کاری تیا نەکردووە دەمی بۆ بەرێت .

**پاسەوان ـ 2 ـ**

بۆ دواجار ئاگادارتان دەکەینەوە ، وریابن .

**ئازا**

بڕۆن بەگەورەکەتان بڵێن : ئەوەی داوای دەکات مەحاڵە .

**پاسەوان ـ 2 ـ**

ئێمە وا دەڕۆین ، بەلام ئەمە زۆر دەکەوێ لەسەرتان .

[ دەڕۆن ]

**مەڕ**

ئازا نەدەبوو بەو جۆرە وەلامیان بدەیتەوە .

**ئازا**

نەء واچاکە . ئەمانە هەر فێری ئەوەن کار نەکەن و بخۆن .

**گوێ درێژ**

بەلام ئێمە لەگەڵ هوما چیمان پێدەکرێ ، ئەو خاوەنی چەکێکی زۆرە .

**ئازا**

مەترسن . تا من مابم نایەڵم کەس دەستان بۆ بەرێت . گەلێ شوێن گەڕاوم . لە هەر شوێنەو شتێ فێر بووم . لەڕمو تیر هاویشتندا پسپۆڕم ، لە شەڕەشیریشدا کەم کەس شان لەشانم دەدات .

**مەڕ**

ئەوە دەزانین . بەلام تۆ بەتەنها چیت پێ دەکرێ ؟

**ئازا**

بەتەنها هیچم پێ ناکرێ بەلام من تەنها نیم . بۆ تەنهام ؟ ئەی ئێوە ؟ بۆ ئێوە هەست بەبوونی خۆتان ناکەن ؟

**گیانداران**

باهەستی پێ دەکەین

**ئازا**

کەواتە من تەنها نیم . هاورێکانم هەرگیز لەرێی ڕاستیدا سەرتان شۆڕ نەکەن .. هاورێیان نزیك بنەوە با لەم کێشەیە بکۆڵینەوە [ کۆدەبنەوەو دەکەونە گفتوگۆ کردن ]

[ تاریکی ]

**زەردە**

ئەنجام بڕیارماندا ڕازی نەبین بە داواکەی هوماو نەهێڵین دەنکە جۆیەك چی یە بیبات .

**نووسەر**

ئەی هوما چی کرد کاتێ وەلامی ئازای بیست ؟

**زەردە**

هەر ئەوەبوو شێت و هار نەبێ . بۆیە دیسان پاسەوانانی ناردەوە سەرمان ...

[ دارستان . گیانداران و ئازا لای ڕاستن . پاسەوانان ـ ئەمجارە چوارن ـ لای چەپ ]

**ئازا**

ئەمجارەش بەهوما بڵێن ئەوەی ئەو داوای دەکات مەحاڵە

**پاسەوان ـ 2 ـ**

ئەگەر بەئاقڵ نەجوڵێنەوە کارێکتان پێدەکەین با بەدەواری شڕی نەکردبێ .

**پاسەوان ـ 3 ـ**

خاوەن شکۆ بەبەزەیی یە ، حەز ناکات بە توندو ڕەقی مامەڵەتان لەگەڵ بکات ، بەلام گەر بزانێ سەرپێچی دەکەن ئەوا بەڕۆژێك تەفرو توونا تان دەکات .

**ئەسپ**

[ ئەحیلێنێ ] حەز بەئاسوودەیی و سەرفرازی دەکەین ، ئەوەی بیەوێ سەربەستیمان لێ زەوت بکا ڕووبەڕووی دەبینەوەو بە گژیا دەچین ئایا ئەمە شوورەیی یە ؟

**پاسەوان ـ 1 ـ**

ئەگەر ئەوە شوورەیی نەبێ چی شوورەیی یە ؟

ئازا
شوورەیی ئەوەیە کار نەکەیت و بەزۆر بەرهەمی کەسێکی تر بدزی یان دەست لە خەڵکی پان بکەیتەوە .
پاسەوان ـ 4 ـ
نەخێر ، شوورەیی ئەوەیە رووبەرووی هوهای مەزن ببنەوە .
پاسەوان ـ 1 ـ
گوێبگرن ، دەبێ هەموو ملکەچی فەرمانەکانی هوهای مەزن بین .
ئازا
ئەو دەتوانێ تەنها حوکم بەسەر نموونەی وەك ئێوەدا بکات . هەرچەندە ئەوەش ناڕەوایە بۆ ئەوو شوورەیی یە بۆ ئێوە ، بەلام ئێمە ...
پاسەوانی ـ 1 ـ
ئێوەش دەبێ ملکەچی بن .
ئازا
بۆ تاقی نەکەینەوە ؟
پاسەوان ـ 2 ـ
چۆن ؟
ئازا
کامەتان لەخۆی ڕادەبینێ بێتە مەیدان شەڕەشیر بکەین .
پاسەوان ـ 2 ـ
ئنجا ئەوەمان خۆشە بلێن پاسەوانە ئازاکانی هوهای مەزن هێزی خۆیان لەگەڵ منالاندا تاقی دەکەنەوە .
ئازا
نەء . دوایی دەلێن منالێکی ئازاو زیرەك توانی پاسەوانانی هوها ببەزێنێ ... چی یە دەترسن ؟
[ پاسەوانەکان لەناو خۆیاندا دەدوێن . پاسەوان ـ 2 ـ شیرەکەی دەردێنێ و دەچێتە پێشەوە . ئازاش بەهەمان جۆر ]
زەردە
نا ، هاوڕێ تکات لێ دەکەم واز بێنە .
ئازا
مەترسن .
[ بەرانبەر یەك دەوەستن ، ئەمە دیمەنێکی کۆمیدی دەبێت ـ شیرەکانیان لەیەك دەدەن ، ئازا چەند جارێك گێلەی پێ دەکات کە دەبێتە جێگای پێکەنین ، پاسەوانەکە سەری لێ تێك دەچێ و بەهەر چوار لادا پەل دەهاوێ ، ئازا لە کۆتایی دا شیرەکەی پێ فڕێ دەداو شیرەکەی خۆی دەخاتە سەر بینە قاقای . گیانداران دەیکەنە چەپلە ڕێزان . ئەم شەڕەشیرە دەرهێنەر لەسەرشانۆ ڕێکی دەخاو جوانی دەکات ]
پاسەوان ـ 3 ـ
ئێمە ئەوە دانانێین بەسەرکەوتن
زەردە
بۆ ؟
پاسەوانی ـ 3 ـ
چونکە ئەم هاوڕێیەمان لە شەڕە شیردا شارەزا نی یەو لێی نازانێ .
ئازا
کەواتە خۆت وەرە مەیدان .
پاسەوان ـ 3 ـ
نەء ، من دەلێم ئێمە چوارین ، ئێوەش لەناو خۆتاندا چوار هەلبژێرن ، یاری پەت ڕاکێشان دەکەین . سەرکەوتن لەمەیدایە [ ئازا سەیری گیانداران دەکات ]
گیانداران
ئێمە ڕازین . [ زەردەو بەران و مەڕ هەلدەبژێرن لەگەل ئازا ]
زەردە
بەلام پەت لەکوێ بێنین ؟
[ پاسەوانەکان دەچنەوە یەك و قسە دەکەن . پاشان قایشەکانیان دەکەنەوەو پێکەوەی دەبەستن . ]
پاسەوان ـ 3 ـ
بەم قایشانە .
ئازا
[ لەناوەڕاستی شانۆدا خەتێك دەکێشێ ] هەر لایەکمان ئەوی ترمانی ڕاکێشایە ئەم دیوی خەتەکە ئەوەسەرکەوتووە .
[ هەر لایەی سەرێکی قایشەکە دەگرن . ماوەیەك یەکتر دێنن و دەبەن . پاسەوان ـ 1 ـ پانتۆلەکەی بەردەبێتەوە ، گیانداران پێی پێ دەکەنن ]
پاسەوان ـ 1 ـ
بوەستن [ دەوەستن هەلیدەکێشێتەوە ] دەست پێبکەن [ دەست پێدەکەنەوە ، یاری یەکە گەرمتر دەبێ لەپڕ قایشەکە لە ناوەڕاستدا دەکرێتەوە ، هەردوولا بەپشتا دەکەون . پێکەنین . قایشەکە دەبەستنەوە ، دەست پێدەکەنەوە ، بەتوندتر ڕای دەکێشن ، پاسەوانی ـ 2 ـ3 ـ4 ـ بەدوای

یەکدا پانتۆڵەکەیان بەردەبێتەوە ]

**پاسەوانی - 2 - 3 - 4 -**

بوەستن [ دەوەستن . هەڵدەکێشنەوە ] دەست پێبکەن .

[ یەکتر ڕادەکێشن ، پاسەوانەکان دەستێکیان بەقایشەکەوەیەو دەستەکەی تریان بەپانتۆڵەکەیانەوە .. لاکەی ئازا ووردە ووردە پاسەوانان ڕادەکێشنە ئەم دیوی خەتەکە ، پاسەوانان دەیانەوێ پیابکەن هەردوودەست دەگرن بەقایشەکەوە ، بەلام پاش چی . لەگەڵ دۆڕاندنیان پانتۆڵەکانیشیان بەردەبێتەوە ، گیانداران هاواری سەرکەوتن دەکەن و پێیان پێدەکەنن . ]

**ئازا**

ئەمڕۆ ئێوە بەشی خۆتان وەرگرت ، سبەینێ سەرەی گەورەکەتانە [ پاسەوانەکان قایشەکانیان دەبەستنەوە ]

**پاسەوانی - 3 -**

ئەمڕۆ لەبەر پانتۆڵەکانمان ئاگامان لەخۆمان نەبوو ، بەلام هەر دەتانبەزێنین .

[ گیانداران بۆیان دەچن ، هەڵدێن ، گیانداران پێیان پێدەکەنن ]

**[ تاریکی ]**

[ شانۆ تاریکە ، چەپکە تیشکێك چوار پاسەوانەکە دەردەخات و سەریان شۆڕکردووە . چەپکە تیشکەکە دەگوێزرێتەوە بۆ سەر هوما لەسەر تەختەکەی دانیشتووە ]

**هوما**

[ لەپڕ هەڵدەستێ ] هەڵتان دەواسم ، لەملتان دەدەم ، دەزانن چیتان کردووە ؟ سەری منتان شۆڕکرد ، دەبێ خەڵکی چیم پێ بڵێن کاتێ ببیستن مناڵێ پاسەوانانمی بەزاندووە . دەڵێن هوما مەزنییەکەی جارانی نەماوە [ چەپکە تیشکەکە دەچێتەوە سەر پاسەوانەکان . هوما بەردەوامە ] ئەو چی پێکردوون من دە ئەوەندەتان پێدەکەم وون بن لەبەر چاوم نامەوێ ڕووی بەزیوتان ببینم ، بۆ دەرەوە . [ پاسەوانەکان دەچنە دەرێ ، چەپکە تیشکەکە دەگەڕێتەوە سەر هوما ] تائێستا کەس نەیتوانیووە لەڕوومدا بوەستێ . کەچی ئەم مناڵە بەرپەچی داواکانی دامەوە ، لەوە دەچێ ببێتە کۆسپ لەڕێگەی ئارەزووەکانمدا کێڵگەی گەورە بەپیت و بەرەکەتە بەهەر ڕێگەیەك بووە دەبێ دەستی بەسەردا بگرم ، هەروەها دەبێ ئەو مناڵەش لەناوبەرم .

**[ تاریکی ]**

**زەردە**

هوما ڕاوێژکاری بانگ کرد ، مەسەلەکەی تێگەیاندو داوای لێکرد چارەیەکی بۆ بدۆزێتەوە . ڕاوێژکار داوایکرد ئەسڵ و فەسڵی ئەو مناڵەی بۆ ساغ بکەنەوە ، پاسەوانان گەڕان .. گەڕان ... پرسیان ... تا گەیشتنە ئەوەی ئەم مناڵە ...

* * *

[ شانۆتاریکە . چەپکە تیشکێك لەسەر هومایەو دانیشتووە ]

**هوما**

چیتان کرد ؟

**پاسەوان - 1 -**

[ چەپکە تیشکەکەی دێتە سەر ] مناڵێکە کەس و کاری نی یە .

**پاسەوان - 2 -**

[ چەپکە تیشکەکەی دێتە سەر ] لەناوگیانداراندا گەورە بووەو بەشیری خۆیان پەروەردەیان کردووە .

**پاسەوان - 3 -**

[ چەپکە تیشکەکەی دێتە سەر ] نازانرێ دایك و باوکی کێن .

**پاسەوان - 4 -**

[ تیشکەکەی دێتە سەر ] تەمەنی - 11 - ساڵانە ، بەلام تابڵێی زیرەك و ژیرە ، لەئازایەتیشدا بەئازا بانگی دەکەن .

[ چەپکە تیشکەکە دەچێتەوە سەر هوما . هوما سەیری ڕاوێژکار دەکات ، چەپکە تیشکەکە دەچێتە سەر ڕاوێژکار ، بیردەکاتەوە . ]

**[ تاریکی ]**

**زەردە**

ڕاوێژکار کەوتە بیرکردنەوە ، سەری هێناو برد ، گەلێ نەخشەی کێشاو گەلێکی هەڵوەشاندەوە ، تا لە ئەنجامدا ڕێگایەکی دۆزیەوەو بەهومای ڕاگەیاند هوماش لەسەر داوای ڕاوێژکار دووپاسەوانی نارد بەدوای ئازادا تا تەشریفی بهێنێ بۆکۆشك دووپاسەوان نەك زیاتر نەوەك ئازاو گیانداران واتێ بگەن بۆ شەڕ هاتوون .

**نووسەر**

شتێکت لەیاد چوو .

**زمردە**
چیم لەیاد چوو ؟
**نووسەر**
نەتووت ڕاوێژەکە چی بوو ؟
**زمردە**
لەیادم نەچوو تۆزێ ئارام بگرە دەزانی چی‌بوو .
**نووسەر**
ببوورە . کەواتە بەردەوامبە .
[ دارستـان . کـەس دیـار نیـیـە . پـاسـەوانی —1—2— بەئەسپایی‌و بە ترسەوە لای چـەپی شانـۆوە دێنە نـاوەوەوە دەگەنە ناوەڕاستی شانۆ ]
**پاسەوان ـ 1 ـ**
لە هەر دوو لاوە تەنگمان پێ هەڵچنراوە .
**پاسەوان ـ 2**
نایەین پاشا لەملمان دەدات ، دێین ئەوەحاڵمانە .
**پاسەوان ـ 1 ـ**
[ هـەنگاو هـەنگاو بـەرەو لای ڕاست دەڕواو بۆ گیـانـداران دەگەڕێ ]
**پاسەوان —2**
[ هەنگاو هەنگاو لە ترسا دێتەدواوە بۆ لای‌چەپی شانۆ ]
**پاسەوان ـ 1 ـ**
کەس نابینم ، ئەی تۆ ؟ [ وەڵام نی‌یە ، ئاوڕ دەداتەوە نایبینێ ئەمیش بەرەو لای چەپ ڕادەکاتە دەرەوە ]
[ پاسەوان —1— سەری ناوە بەپشتی پاسـەوان —2— دێنە ژوورەوەو بەرەولای ڕاست دەڕۆن ـ لەشێوەی یاری ئاشتی ، نەکەشتێن ]
**پاسەوان ـ 1 ـ**
دیارن ؟
**پاسەوان ـ 2 ـ**
دیارنین [ ئەمە دووبارە دەکەنەوە تا دەگەنە ڕاستی شـانۆ . دەنگێـك دێت ، بـەرەولای چـەپ ڕادەکـەن . دەنگێکی‌تـر ، شیرەکانیان دەردێنن بەرەو سەرەوەی شانۆ دەچن ، دەنگێکی بەهێز ]
**پاسەوان ـ 1**
[ بەرەولای چەپ دەچێت ]
**پاسەوان ـ 2 ـ**
[ بەرەو لای ڕاست دەچێت ]
**پاسەوان ـ 1 ـ**
[ دەترسێ . ڕووی لەدەرەوەیەو بەپشتا دێت بەرەو ناوەڕاستی شانۆو بۆ دەنگەکان دەگەڕێ ]
**پاسەوان ـ 2**
[ بەهەمان جۆری پاسەوان ـ 1 ـ ]
[ لە نـاوەڕاستی شـانـۆدا پشتیـان بـەر یـەك دەکـەوێ ، دادەچڵەکێن‌و شیرەکانیان دەکـەنە یـەك . دەنگی پێکەنینی گیانداران دەبیسترێ ، ترسیـان لێ‌دەنیشێ‌و سەریـان لێ تێك دەچێ شیـرەکانیـان هەڵدەگـرن ، بەرەو سـەرەوەی شانـۆ ڕادەکەن تا دەربازبن . ئەسپ‌و چەند گیاندارێکی‌تر بەردەمیان دەگرن ]
**پاسەوان ـ 1 ـ**
[ بەرەوڕاست ڕادەکات ، ئازاو چەند گیاندارێکی تر بەردەمی دەگرن ]
**پاسەوان ـ 2 ـ**
[ بەرەوچەپ ڕادەکات ، زەردەو چەند گیاندارێکی تر بەردەمی دەگرن ] [ پاسـەوان ـ 1 ـ بەرەو چـەپ‌و پاسـەوان —2— ڕاست ڕادەکەن ، لەناوەڕاستی شانۆدا بەریەك دەکەون گێژ دەبن ، دەخولێنەوەو دەکەون ، گیانداران پێیان پێ دەکەنن ]
**گیانداران**
[ دەستی یەك دەگرن‌و بازنەیەك بەدەوریاندا دروست دەکەن‌و بەدەوریاندا دەخولێنەوە ]
**ئازا**
هەستن خۆتان دەرباز بکەن .
[ دووپاسەوانـەکە هـەڵدەستن ، گیـانـداران لەلایـەکـەوە بـۆشاییـیـەکیان بـۆ دەکەنـەوە ، کـە دەیـانـەوێ دەرچن ، دایدەخەنەوە ـ لەشێوەی یاری پشیلەو مشك ـ ئـەمە چـەند جارێك دووبارە دەکەنەوە لەئەنجامدا پاسەوانەکان شەکەت‌و ماندوو دەبن‌و دەبوورێنەوە ، گیانداران پێـیـان پێ دەکەنن‌و دەوەستن ]
**مەیموون**
دوو سەتڵ ئاو بێنن [ دەیهێنن ] بیکەن بەسەرو چاویاندا .
[ دەیکەن بەسەرو چاویاندا . دووپاسەوانـەکە ڕادەپـەڕن .

پێکەنین ]
ئازا
ئنجا با بزانین چیان دەوێ و بۆچی هاتوون ؟
پاسەوان ـ 1 ـ
[ زمانی تەتەڵە دەکات ] هومای مەزن بەدوای تۆیدا ناردین . داوات دەکات .
ئازا
کاری بەمن چی یە ؟
پاسەوان ـ 2 ـ
وەك فەرمووی کارێکی خێرە .
ئازا
بڕۆن پێی بڵێن مادام ئەو کاری بەمن هەیـە ، پێویستـە ئەو بێت ، نەك من بچم .
پاسەوان ـ 1 ـ
بەلام ...
ئازا
قسەناکەن . بڕۆن وای پێبڵێن [ دوو پاسەوانەکە دەڕۆن ]
[ تاریکی ]
[ هەمان دیمەنی پێشوو . هوما لەوێ یەو کۆمەڵێ پاسـەوانی لەدەورە . گیاندارانیشی لێیە . هوماو ئازا قسە دەکەن ]
هوما
[ لەگەڵ ئازا ] چەند پرسیارێکت لێدەکەم ، ئەگەر بەراستی وەلامم بـدەیتەوە لەم بـڕوایەدام دوژمنـایەتیمـان دەگـۆڕێ بەدۆستایەتی
ئازا
درۆپیشەم نەبووە ، چی دەپرسی بپرسە .
هوما
کەس و کارت کێن ؟
ئازا
کەس و کارم نی یە . بەلام من هەموو ئەو خەڵکە بەکەسی خۆم دەزانم
هوما
چۆن ؟
ئازا
کاتێ چاوم کردەوە خۆم لە ناو گیانداراندا بینیەوە ، هەر لەناو ئەواندا پەروەردە بوومو گەورە بووم ، لەمردن ڕزگاریان کردمو بەشیری خۆیان گۆشیانکردمو پێیان گەیاندم . چی یە جەناب دەتبینم دەگریت و لە هەمان کاتدا پێدەکەنی ، ئـەمە مـانای چی ؟
هوما
بەڕاست کاتێ فامت کردەوە خۆت لەدارستاندا بینیەوە ؟
ئازا
بەڵێ لەدارستانداو لەناو گیاندارانڕدا .
هوما
ئای کە بەختیارم ، سەر لەنوێ لەدایك بوومەوە .
ئازا
تێناگەم ... چی ڕوویدا ؟
هوما
نازانم نازانم چۆنت تێبگەیەنم .
ئازا
لەچیم تێ بگەیەنی ؟
هوما
ئازا تۆ کوڕی منیت ، من باوکی تۆم .
[ ئازا سەرسام دەبێ گیانداران سەیری یەك دەکەن ]
ئازا
چۆن ؟ من کوڕی...
هوما
بەڵێ تۆ کوڕی منیت .
ئازا
چۆن ؟ بەلام چۆن ؟
هوما
ئازا گیان ڕۆڵەکەم بەر لە دەساڵ ڕۆژێکیان لەگەڵ دایکتا چووین بۆ سەیران بۆ ئەم دارستانە ، ئەو کاتە تۆ یەك ساڵان بوویت . خـەریکی نـان خـواردن بـووین ، تـۆش لەولامـانـەوە پـاڵ کەوتبووی ، دایکت لەپڕ هاواری لێهەستا ، کوا کوڕەکەمان ، کوڕەکەمان دیارنەما ... زۆرت بۆ گەڕاین نەمان دۆزیتـەوە ، هەموو دارستانمان پشکنی نەمان بینیەوە ، کە سەرەنجامت نەبوو وتمان دڕندەیەك فڕاندوویەتی و خواردوویەتی ، کەچی بەپێچەوانەوە پەروەردەیان کردی .
ئازا

ئەی نەدەبوو پاسەوانەکان چاودێریم بکەن ؟

**هوما**

چۆن ؟ ئا .. لەسەر ئەوە دوایی ئەوانەی لەگەڵم هاتبوون هەموویانم لەسێدارەدا! . وەرە کوڕەشیرینەکەم [ ئازا دەگرێتە باوەش ئازا هەرسەرسامە ]

**ئازا**

نازانم ئەمە خەوە یان ڕاستی ؟

**هوما**

ڕاستی‌یە ، ڕاستیەکی پرشنگدار دڵخۆش‌بە ئەی شازادە شیرینەکەم [ لەگەڵ گیانداران ] ئێوەش هاوڕێیانی ئازا سوپاستان دەکەم کە پاراستووتانەو پەروەردەتان کردووە .

**ئازا**

بابە دەمەوێ دایکم ببینم ، بۆ لەگەڵ خۆتا نەتهێنا ؟

**هوما**

ڕۆڵەکەم دایکت پاش ساڵێك بەسەر وون بوونی تۆدا کۆچی دوایی کرد .

**ئازا**

[ دڵی پڕ دەبێ خۆی فڕێ‌دەداتە باوەشی هوماوە ]

[ گیاندارانو پاسەوانان بەچەپڵەڕێزان خۆشحاڵی خۆیان دەردەبڕن ]

**ئازا**

بابە تکات لێ‌دەکەم ، واز لەهاوڕێکانم بێنەو دەست هەڵگرە لەداواکەت لێیان

**هوما**

ئەوان تۆیان لەمەرگ ڕزگار کرد ، پێویستە خەڵاتیان بکەمو پاداشتیان بدەمەوە هاوڕێیانی ئازا بەیارمەتیتان ئێمە دەڕۆین .

**گیانداران**

بەخێرچن .

**ئازا**

هاوڕێکانم قەت لەیادتان ناکەم سەرتان لێ‌دەدەمەوە ، کار لە کێڵگەکەدەکەینو جوانتری دەکەین ، زەردە دێت لەگەڵم .

**زەردە**

[ سەری بۆ دەلەقێنێ ]

[ ئازا هەردوو دەستی بەرزکردووەتەوەو ماڵئاوایی‌یان لێ‌دەکات . هوماو پاسەوانانو ئازاو زەردە دەڕۆنە دەرەوە . ]

**کەروێشك**

ئێتر بێ ترس دەژین ، بێ‌ترس بەرهەمی خۆمان دەخۆین

[ ڕەشەبا هەڵدەکات ]

**مەڕ**

ئەم ڕەشەبایە چی بوو ؟ بابڕۆینە ژوورەوە .

**گوێدرێژ**

لەوەدەچێ ئەمە ڕەشەبا نەبێ ، بەلا بێ ، خوایە بەلامان لێ‌دوورخە .

## [ تاریکی ]

**زەردە**

ڕەشەبا هەڵی‌کرد . هیچ ساڵێك ڕەشەبای وای هەڵنەکردبوو ، تا هەفتەیەك ووچانی نەدا . ئەگەر دارو درەختمان بەدەوری کێڵگەکەدا نەچاندبایەو پەرژینمان نەکردایە ، چیمان چاندبوو ڕای‌دەماڵیو ڕەنجمان بەفیڕۆ دەچوو .

**نووسەر**

واتە کشتوکاڵەکەی گوێ دریژی نەهێشت .

**زەردە**

گوێ‌بگرە پێت بڵێم گوێ‌درێژ چی‌کرد ..

[ دەنگی ڕەشەبایەکی بەهێز دێت ، گوێ درێژ خۆی داوەتە بەر ڕەشەباکە تاکشتوکاڵەکەی زیانی پێ‌نەگا ]

## [ تاریکی ]

**زەردە**

بەو جۆرە گوێ‌درێژ خۆی دەدایە بەر ڕەشەباکە تا نەهێڵێ بەروبوومەکەی زیانی پێ‌بگات ، بەلام نەیتوانی تاسەر بەرگری لەڕەشەباکە بکات بۆیە نەخۆش کەوتو لەجێدا کەوت ..

[ گوێ‌درێژ ئاخ و ئۆفیەتی ، گیانداران دەورەیان داوە ]

**گوێ درێژ**

ئەی هاوار ، ئاخ ... مردم .

**مەڕ**

ئەوە ئەنجامی خۆ پەرستیو چاو چنۆکیت . [ پەرداخێکی دەداتێ ] بگرە ، ئەوە هەڵقوڕێنە بەڵکو باش بیت . [ دەیخواتەوە ] ڕاست بەرەوە بتشێلم [ دەیشێلێ ] پێم بڵێ ئێستا هەست بەچی دەکەی ؟

**گوێدرێژ**

پەشیمانی ... پەشیمانم .

**کەروێشك**

چەند پێم ووتی ، ئێمە هاوڕێی یەکین . پێویستمان بەیەکتردەبێ .

**گوێدرێژ**

ڕاستدەکەی ، پەشیمانم ، لەوە گەیشتم کەس ناتوانێ بەتەنها بژی کەروێشك تۆ کەلێ ئامۆژگاری بەنرخت کردم ، گوێم لێنەگرتی .

**کەروێشك**

جا بۆ ؟

**گوێدرێژ**

چونکە بێمێشك بووم ، بێعەقل بووم . نازانم کشتوکاڵەکەم چی لێهاتووە

**مەڕ**

زیانی پێگەیشتووە ، ئەوەندەی خێر لێ نابینیت .

**گوێدرێژ**

هاوڕێکانم ئەم بەسەرهاتەی من بۆ منداڵەکانتان بگێڕنەوەو پێیان بڵێن : ئەمە بەسەرهاتەکەی بوو ، بەڵام لەدوایی‌دا پەشیمان بووەوەو دەیووت ئای کەکاری کۆمەکی خۆشە کەس ناتوانێ بە تەنها بژی ، ئەوەی بیەوێ بەس بۆ خۆی بژی زۆر ناژی ... بیری ئازاو زەردە دەکەم ، دەنگیان نەبوو .

**مەڕ**

ئێمەش بیریان دەکەین . ئەگەر ئێمە باز بوێ سەرمان لێدەدەن [ تاریکی ]

[ کۆشکی پاشا . ئازاوزەردە لەلایەکەوە دانیشتوون ئازا بەرگی شازادانەی پۆشیووە . ]

**زەردە**

بۆوا مات و بێدەنگی ؟

**ئازا**

زۆر بێزارم ، من بەژیانی وا ڕانەهاتووم .

**زەردە**

خۆزگە بەجاران ناخوازی ؟

**ئازا**

هەزار خۆزگەم بەجاران . [ خزمەتکار دێت ]

**خزمەتکار**

ئازا گیان هیچت ناوێ ؟

**ئازا**

سوپاست دەکەم مامە گیان [ خزمەتکار دەچێتە دەرەوە ]

**زەردە**

ئەم کابرایە زۆر خەمت دەخوا .

**ئازا**

زۆریش بەتەنگمەوەیە .... تا باوکم دیار نی‌یە باپڕۆین سەرێك لە هاوڕێکانمان بدەین .

**زەردە**

دوایی لێت توورە دەبێ .

**ئازا**

چی دەبێ بابێ [ دەیانەوێ بڕۆن ، دەوەستن ] ئەوە باوکم هات ، با خۆمانی نیشان نەدەین [ لە پەنایەکەوە خۆیان دەشارنەوە ] [ هوما دێت . لەسەر تەختەکەی دادەنیشێ ، جیرەیەك لەتەختەکەوە دێت ، ڕادەچڵەکێ . دادەنیشێتەوە ، جیرەیەکی‌تر ، ترسی لێدەنیشێ ، بەدەوری تەختەکەدا دێت و دەچێ و ژێرەکەی دەپشکنێ دێتەوە دانیشێ ، بەڵام دانانیشێ ]

**هوما**

جا دەبێ هەروا بە پێوە بم ؟

[ ئازاو زەردە بەئەسپایی دەیانەوێ بچنە دەرەوە ، دەگەنە بەر دەرگا . هوما چاوی پێیان دەکەوێ ] وەرە ڕۆڵە شیرینەکەم ، بزانم چیت دەوێ ؟

**ئازا**

بابە نیازمە سەرێك لەهاوڕێکانم بدەم .

**هوما**

کام هاوڕێیانەت ؟

**ئازا**

گیاندارانی هاوڕێم ، ئەو هاوڕێیانەی لەمەرگ ڕزگاریان کردم

**هوما**

وەك پێم ووتی تۆ جاران هاوڕێی گیانداران بوویت ، بەڵام ئێستا تۆ شازادەی [ دادەنیشێ . جیرەیەك . بەئەسپایی دادەنیشێ ]

**ئازا**

ئەوەچی بوو ؟

**هوها**

هیچ . ئێستا بچۆرەوە ژوورەکەت . دوایی قسەی لێ دەکەین

**ئازا**

هەر جارێك دێمە لات بـۆ ئەو داوایـە ، دەڵێی دوایی قسەی لێدەکەین [ پەلی زەردە دەگرێو دەڕۆن ]

[ ڕاوێژکار دێتە ژوورەوە ]

**ڕاوێژکار**

سڵاو لە خاوەن شکۆ .

**هوها**

گوێبگرە ، نیازمە بـەیەکجـاری کێڵگەی گـەورە دەست خۆم بخەم ، دەمەوێ هێرشیان بکەمە سەرو چیگیانـداری تیایـە تەفرو تونایان بکەم .

**ڕاوێژکار**

بـەجێیە . بـەڵام پەلە مـەکە ، هێشتـا کاتی کـۆکردنـەوەی بەروبومەکە نەهاتووە ، کەی کاتی هات پەلاماریان بدە .

**هوها**

ئەی ئێستا بۆ نا ؟

**ڕاوێژکار**

با جوان پەروەردەی بکەنو خۆیانی لەگـەڵ خەریـك بکەن ، چونکە هەر خۆیان دەزانن چۆن بەرهەمێکی نایاب بێننە بەر .

**هوها**

بەجێیە . دەبێ دوو پاسەوانیش چاودێری ئازاو زەردە بکەن .

[ تاریکی ]

**زەردە**

دوو پاسەوان چاودێریمان بکەن نەکا بچینە دەرەوە .

**نووسەر**

ئەگەر هاوڕێکانتان دڵیان کـرمێ ببووایـە لێتان ، نـاهەقیـان نەبوو .

**زەردە**

ئێمەش گوناهمان نەبوو . خزمەتکارەکە بووە هاوڕێمان ، ئازا لەم هاوڕێ تازەمانەوە شتێکی نوێ فێر بوو .

**نووسەر**

چی بوو ئەو شتە ؟

**زەردە**

هاوڕێکەمان تابلۆیەکی بۆ ئازا کێشا تا لە ژوورەکەیدا هەڵیواسێ ئـازاش داوای لێکرد فێـری ڕەسمی بکات ، ئـەویش لەگەڵی خەریك بوو ... خەریك بوو ... تا فێر بوو .

[ ژوورێك لە کۆشك کەژووری ئازایە ، تابلۆیەك هەڵواسراوە ، ئـازا خەریکی ڕەسم کـردنە ، خـزمەتکـارو زەردە سـەیـری دەکەن . ]

**ئازا**

مامە چۆنە ؟

**خزمەتکار**

چاك فێر بوویت ، زۆر جوانە .

**ئازا**

بەڵام ئەوەی تۆ [ دەست بۆ تابلۆ هەڵواسراوەکە درێژ دەکا ] جوانترە .

**خزمەتکار**

بەڵام گەر تۆش بەردەوام بیتو کۆڵ نەدەیت زۆر لەوانەی من جوانتر دەکێشی ، بەڵام بەکۆڵ نەدانو واز نەهێنان

**ئازا**

چۆن شتی وا دەبێ ؟ چۆن دەبێ قوتابی لەمامۆستاکەی باشتر بەرهەم بێنێ ؟

**خزمەتکار**

ئەی ئەگەر وا نەبێ پێشکەوتن چۆن ڕوو دەدات .

**ئازا**

مامەگیان تۆ بۆ ئەوەندە خەمی من دەخۆیت ، ئایا لەبەر ئەوەیە ئێوەم خۆش دەوێ ، ئێوە دڵو دەروونتان پاکە .

**خزمەتکار**

بەڵام خەمی دنیاش هەر بۆ ئێمەیە .

**ئازا**

چونکە فێڵو درۆ نازانن ، ویژدانتان پاکو هەست بەرزن .

**خزمەتکار**

تۆ وەك پیاوە ژیرەکان دەدوێی ، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زیـرەکتر دێیتە بەر چاوم . ئەم زیرەکییەت لەکوێ هێناوە ؟

**ئازا**

لەو خەڵکەوە فێر بووم ، تێکـەڵیان بـوومو ئەوەی نـەمزانیبێ پرسیارم کردووە .

**خزمەتکار**

مرۆڤ کاتێ شتێ نازانێ شوورەیی نییە ، بەڵکـو ئەو کـاتە

دەبێتە شوورەیی کە ئەو شتەی هەر بەنەزانی لا بمێنێتەوە . پرسیار کردنیش شوورەیی نییە ، پرسین ، گەڕان ، خوێندنەوە مرۆڤ دەگەیەننە ئەو شتەی نایزانێ یان وێڵە بەدوایدا . بەیارمەتیتان من دەڕۆم ، ئێوەش بنوون شەو درەنگە .

**ئازاو زەردە**

بەخێر چیت ، هەربمێنی بۆمان [ خزمەتکار دەڕوات ]

**ئازا**

ئای کەمرۆڤی وامەزنە ، لە هیچی کەم نییە .

**زەردە**

ئەوە نەبێ هەژارە .

**ئازا**

هەژاری کەمی نییە بەڵکو ئەوە کەمییە ئەوانە بەکەم بزانی [ کەمێك بێدەنگی ] ئەی هاوار دڵم تەقی ، دەبێ ئێستا هاوڕێکانمان چیمان پێبڵێن ، ئەگەر تۆم لەگەڵ نەبوویتایەو ئەم مامەیەم نەناسیایە بەرگەی دوو ڕۆژم نەدەگرت . هەست دەکەم ئەم ژوورە دیوارەکانی ڕۆژ بەڕۆژ دێنەوە یەكو نیازیانە بمگوشن .

**زەردە**

ئێستا تێگەیشتم ئەو باڵندە ناهەقی نەبوو .

**ئازا**

کام باڵندە ؟

**زەردە**

باوکم بۆی گێڕامەوەو ووتی : باڵندەیەکی تەلیسماویو جوانم دەناسی خستبوویانە قەفەزێکی لەئاڵتوون دروست کراوەوە . ئەم باڵندە ...

[ تاریکی ]

[ باڵندەیەك لە قەفەزێکی ئاڵتوندایە ، سەگیش لەسەر زەوییەکە چۆکی داداوە ]

**باڵندە**

[ لەناو قەفەزەکەدا هەڵبەزو دابەزیەتیو خۆی ئەکێشێ بەم لاو لای قەفەزەکەدا ]

**سەگ**

هاوڕێ ماخۆلانی چیتە ؟ بۆساتێ ئارام ناگری ؟

**باڵندە**

ئارامی چی بگرم ، دڵم تەقی .

**سەگ**

ئاگاداری خۆتبە ، خۆت دەپرووکێنی .

**باڵندە**

وازم لێبێنە یا خۆم دەپرووکێنم یان ئەم قەفەزە دەشکێنم .

**سەگ**

بۆ ؟ دەترسم ئەو قەفەزەت بە دڵ نەبێ .

**باڵندە**

ئاخ خۆزگە بۆم ووردو خاش بکرایە .

**سەگ**

چۆن وا دەڵێی ؟ دەبووایە دڵشاد بوویتایە ، چونکە چوار دەورت ئاڵتوونە .

**باڵندە**

من چی لە ئاڵتوون بکەم ، ئەگەر ڕۆژێ تیشکی خۆر نەبینم ، بۆنی گوڵێ نەکەم یان بۆ منداڵە جووتیارەکان نەخوێنم .

**سەگ**

خاوەنەکەت خۆشی دەوێی بۆیە قەفەزێکی لە ئاڵتوون بۆ دروست کردوویت .

**باڵندە**

ئەوانە مانای خۆشەویستی چوزانن ، ئەگەر بیانزانیایە منیان لەهاوڕێکانم نەدەکرد . دەبێ ئێستا دایکم چیم بۆ بکات ، تۆ بڵێی گوڵاڵە سورەکان چاوەڕوانی ئەوەبن تا جارێکیتر بۆنیان پێوە بکەمو بۆیان بجریوێنم . [ هاوار دەکات ] دایە گیان ، هاوڕێکانم ، هۆ منالینە ، ئێوەش گوڵاڵە سورەکان دڵم لاتانە منیان لەقەفەزی ئاڵتووندا داناوە ، بەلام نازانن من ئێوە بەهەموو ئاڵتوونی دنیا ناگۆڕمەوە .

[ تاریکی ]

[ ژوورەکەی ئازا .. زەردە بەردەوامە لەگێڕانەوەی چیرۆکەکەی بۆ ئازا ]

**ئازا**

زۆر جوانە . من ئێوە بەهەموو ئاڵتوونی دنیا ناگۆڕمەوە . دوایی ...

**زەردە**

باڵندەکە لە هەوڵو سوڕانی خۆی نەکەوت تاقەفەزە ئاڵتوونەکەی شکاندو پڕ بەسییەکانی هەوای هەڵمژیو دای

ـەشـەقەی باڵ . ئیتر کەوتە گۆرانی ووتن بۆ دایکیو منالانو گوڵاڵە سورەکان .

ئازا

تێ کە خۆشە ئینسان لەناو چوار دیوار ڕزگاری دەبێو چاوی بەئاسۆیەکی فراوانو سروشتی جوان دەکەوێ .

[ هاتو هاوارو دەنگە دەنگی دەرەوە دەبیسترێ ] بـەم نیوە شـەوە دەبـێ چـی یـێ . [ بـەرەو دەرگـاکـە دەچـنو گوێدەگرن ] .

[ تاریکی ]

[ کۆشکی پاشا ، ڕاوێژکار دێتە ژوورەوە ، دەنگـە دەنگەکـە بەردەوامە ]

ڕاوێژکار

مژدە .

هوها

چیتان کرد ؟

ڕاوێژکار

کێڵگەی گەورەمان داگیرکرد ، گیاندارانمان پەرەوازەکرد .

هوها

[ ئازاو زەردە دێنە ژوورەوە ] ئافەرین بۆ خۆتان و کارتان .

ئازا

بابە چیت کردووە ؟

هوها

ئەوەی سەرپێچی فەرمانەکانم بکات ئەنجـامی ئاوا دەبێت ، پێیان ووتن نرخێکی زیاتر دەدەن گاڵتەتـان لێهات . ئێستـا کێڵگەکە هەمووی هی منە .

ئازا

بەلام تۆبەلێنت دانێ وازیان لێ دێنی ، کوا بەلێنەکەت ؟ [ هوها وەلام ناداتەوە ] تۆ فریوت دان . من شەرم لە خۆم دەکەم

هوها

بۆ ؟

ئازا

چونکە باوکێکی وەك تۆم هەیە .

هوها

[ تووڕە دەبێ ] بێدەنگبە ، تۆ قەت باوکت لەمن زاناو ژیرتر نەبووە .

ئازا

یانی چی ؟

هوها

گوێ بگرە پێت بلێم ، بۆیە پێشت دەلێم چونکە ئیشم پێت نەما ، تۆ کوڕی من نیت .

ئازا

چۆن ؟!

هوها

تـۆم کردە کـوڕم تا دوورت خـەمەوە لەگیـانـداران چـونکـە سەرسەخت بوویت هانت دەدان ڕوو بەڕووم بنەوە ، ئەوانیشم هێمن کردەوە تا لەپڕ دام بەسەریاندا .

ئازا

چۆن دەبێ پاشا درۆ بکات ؟

هوها

بێدەنگبە .

ئازا

بـۆنابێ ؟ لەوانـەشە ئـەو تاجو تـەختـەشت بـەدرۆ دەست خستبێ .

هوها

دەلێم بێدەنگبە .

ئازا

ئەم ماوەیەی لای تۆ بووم زۆر شت فێر بووم ، لەوە گەشتم چی درۆو ناپاکی‌یە لێرەوە سەر هەڵئەدا . خۆشەویستی‌یەکەشت هەمووی درۆو ڕووکەشە . زەردە با بڕۆین .

ڕاوێژکار

ڕۆلە بـا ڕۆژبێتەوە . [ وەلامی نـادەنەوە دەڕۆن ] دەتـرسم گیاندارانمان لێهان بداتەوە .

هوها

چۆن ؟ نا ، ترست نەبێ ، تازە هیچیان پێناکرێ .

ڕاوێژکار

خۆزگە وابوایە ، بەلام من لەوە ترساوم .

[ بێئەوەی هوهاو ڕاوێژکار چاویان لێبێ خزمەتکار دوای ئازاو زەردە دەکەوێ . ]

[ تاریکی ]

[ لە نێـو چەپکـە تیشکێکەوە ، ئـازا ، خزمـەتکار ـ بـەرگی

پاسەوانی بۆشیووە گیانداران دەردەکەون و خەریکی گفتوگۆ کردنن . پاشان ئازا شیرەکەی لەزەوی یەکە دەچەقێنێ و دەستی ئەخاتە سەر ، هەموو دەست دەخەنە سەر دەستی ئازاو پەیمان دەبەستن ]

**ئازا**

مامەگیان ئامادەیت ؟

**خزمەتکار**

ئامادەم . [ دەستی مەیموون دەگرێ ]

**ئازا**

ئاگاداری خۆتان بن . [ خزمەتکارو مەیموون دەڕۆن ] با ئێمەش خۆمان ئامادە بکەین .

**[ تاریکی ]**

[ دارستان . کۆمەڵێك پاسەوانی لێیە . ]

**پاسەوان ـ 5 ـ**

ناڵێن کەی بەرو بوومەکە کۆدەکەنەوە ؟

**پاسەوان ـ 6 ـ**

نیازیانە هەفتەیەتر بیدوورنەوەو کۆی بکەنەوە .

[ خزمەتکارو مەیموون دێنە ژوورەوە ]

**خزمەتکار**

سڵاوتان لێ بێ هاوڕێیان . [ سڵاوەکەی دەسەننەوە ] هاوڕێکانم ، ئەم مەیموونەی دەیبینن لەکۆشکی هومای مەزن ئەمشەو بەزمێکی خۆشی گێڕا بۆیە پاشام فەرمانی پێدام بیهێنم بۆلاتان تا دڵتان خۆش کاو تۆزێ بەزمتان بۆ بگێڕێ .

**پاسەوان ـ 7 ـ**

خۆشە ، زۆریش خۆشە ، وانی یە هاوڕێیان ؟

**پاسەوانان**

وایە .

**پاسەوان ـ 4 ـ**

پێویستە ئەوە بزانن ئێمە پاسەوانین و وەختی یاریمان نی یە ، دەبێ هەموو کات ئەوەمان لەبەرچاوبێ ئێستانا تۆزێکی تر گیانداران هەڵەتمان بۆ دێنن .

**خزمەتکار**

بەم ڕۆژە ڕووناکە لەچی تۆقیووی ؟ کاتێ بەزێنران و زانیان لەگەڵ ئێمەدا هیچیان پێ ناکرێ بڵاوەیان لێکرد .

**پاسەوان ـ 4 ـ**

ئارەزووی خۆتانە .

**پاسەوانان**

با بەزمێکمان بۆ بگێڕێ .

**خزمەتکار**

[ لەگەڵ مەیموون ] دەست پێ بکە

[ مەیموون چەند یاری یەکی جومناستیکی دەکات ، سەرنجی پاسەوانان ڕادەکێشێ و چەپڵە ڕێزانی دەکەن . ]

**خزمەتکار**

هاوڕێیان ، ئەمە هەر هیچ نەبوو لەچاو بەزمەکانی تریدا .

**پاسەوان ـ 8 ـ**

با بەزمێکی تریمان نیشان بدات .

**خزمەتکار**

[ شیرەکەی دەردێنێ ] ئەگەر زەحمەت نی یە شیرەکانتانم بەنێ

**پاسەوان ـ 2 ـ**

بۆ ؟

**خزمەتکار**

ئەم یاری یە پێویستی بە شیرە [ چەند پاسەوانێك دەیدەنێ ] ئەوانی تریش ئەمانە بەش ناکەن

**پاسەوان ـ 2 ـ**

بەلام پاسا ڕێگای ئەوەمان نادا شیرەکانمان لەخۆمان بکەینەوە .

**خزمەتکار**

کەبۆ پاشای کرد پاشا خەنجەرەکەی خۆی دایەو فەرمانی دا ـ 50 ـ شیری بۆ بێنن ، کاتێ مەیموون یاری یەکەی تەواو کرد هومای مەزن سەری سوڕماو وتی : ئەگەر بەچاوی خۆم نەمدیایە قەت بڕوام نەدەکرد .

[ پاسەوانانی تر شیرەکانیان دەردێنن و دەیدەنێ . شیرەکان لە زەوی یەکەدا لەشێوەی بازنەیەکدا دەچەقێنێ ] ئێستا وەك دەبینن ئەم مەیموونە ناتوانێ بچێتە ناوەوە ، بەم پارچە قوماشە چاوی دەبەستم ، پاشان لەلایەکەوە شیرێکیان لادەبەم بۆی دەبێ بەدەرگایەك ئەم بلیمەتە یەکسەر دەیدۆزێتەوەو دەچێتە ناوەوە ]

**پاسەوانان**

دەی بابیبینین .

پاسەوان ـ 3 ـ

ـشە ئەی ئەگەر نەیدۆزیەوەو خۆیدا لە شیرێك ؟

خزمەتکار

نەیدۆزێتەوە ، بەلام ئەگەر نەیدۆزێتەوەو خۆی بدا لە شیرێك ئەوا شیرەکە دەچەقێنینە ئەو شوێنەی بەری کەوتووە .

پاسەوان ـ 3 ـ

زۆر چاکە ، کەواتە با دەست پێبکات .

خزمەتکار

[ چاوی مەیموون دەبەستێ ، پاشان لەلایەکەوە شیرێك لادەبات ] برۆ ناوەوە [ مەیموون بەئاسانی دەیدۆزێتەوەو دەچێتە ناوەوە . پاسەوانان چەپلەیەکی زۆری بۆ لێ دەدەن ]

پاسەوان ـ 1 ـ

وەرە دەرەوەو شیرەکەش بخەنەوە شوێنی خۆی . [ مەیموون دێتە دەرەوەو شیرەکەش دەخەنەوە شوێنی خۆی ] من شیرێك لادەبەم بزانم دەیدۆزێتەوە ؟

خزمەتکار

[ دەپەشۆکێ ، بەچرپە لەگەڵ مەیموون دەدوێ ] دەڵێی چی ؟

مەیموون

چار نییە دەبێ بیکەم .

خزمەتکار

ئاگاداری خۆت بە ، وریابە .

پاسەوان ـ 1 ـ

[ لەلایەکی ترەوە شیرێك لادەبات ] بچۆرە ناوەوە .
[ مەیموون لەسەر خۆو بەترسەوە دەچوڵێتەوە ، تا لە ئەنجامدا بەرێکەوت دەیدۆزێتەوەو دەچێتە ناوەوە ، چەپلەڕێزانی دەکەن]

خزمەتکار

[ شیرەکان کۆ دەکاتەوە ، یەکێکیان نەبێ بەپارچە قوماشەکە پێکیانەوە دەبەستێ ] ئێستا ئەم بلیمەتە لە دوورەوە ئەم شیرە رادەوەشێنێ و سێ فیکە لێدەدات ، لەفیکەی سێیەمدا پارچە قوماشەکە دەکرێتەوەو شیرەکان لێك جیا دەبنەوە [ پاسەوانان ئەحەپەسێن ] دەست پێ بکە . [ مەیموون شیرەکەی دەستی چەند جارێك هەڵدەسوڕێنێ ، پاشان هەڵی دەدا بۆ خزمەتکار ، سێ فیکە لێدەدات ، لە فیکەی سێیەمدا ئازاو گیانداران خۆیان دەکەن بە ژووردا . مەیموون شیرەکان هەڵدەگرێ و رادەکاتە دەرەوە . تێك دەوروژێن ، پاسەوانان سەریان لێتێك دەچێ و لێدانێکی چاك دەخۆن ناچار دەبن راکەنە دەرەوە مەیموون دێتە ژوورەوەو شیرەکانی پێیە . هاواری سەرکەوتن لەگیانداران بەرزدەبێتەوە . ]

بەران

جارێکی تر مەحاڵە بتوانن بەفرت و فێڵ فریومان بدەن .

ئازا

ئەو هاوڕێیانەی بوونە قوربانی هەموو کات بەرێزەوە یادیان دەکەینەوەو ناویان لەلاپەڕەی نەمراندا تۆمار دەکەین .

[ تاریکی ]

نووسەر

کارێکی مەزنتان ئەنجام داوە . بەڵێنت دەدەمێ ئەمە بکەمە شانۆییەك و کە گەڕامەوە پێشکەش منالانی شارەکەمی بکەم . پێیان دەڵێم : منالینە ، هاوڕێکانم . بەس خۆڵ بکەن بەسەرو چاوی یەکتردا و یەکتر پیس بکەن ، بەس تانەو تەشەرە بگرنە یەك ، بەس شەڕەگەڕەك بکەن و سەری یەك خوێناوی بکەن . پێیان دەڵێم ئێوە رۆڵەی شارێکن . خۆتان پاك و خاوێن رابگرن و یەکتریتان خۆش بوێ و پشتی یەکبگرن تا ...

زەردە

تا هەر هومایەك سەری دەرهێنا بەهو ـ ها دەریپەڕێنن و شار بەدەری بکەن .

نووسەر

بەڵێ تا هەر هومایەك سەری دەرهێنا بەهو ـ ها دەریپەڕێنن و شاربەدەری بکەن . زۆر سوپاست دەکەم و زۆریش ماندووم کردی بمبوورە .

زەردە

پێخۆشحاڵ بووم بەبینینت .

نووسەر

ئەگەر رێگام بدەی ماڵئاوایت لێبکەم و بڵێم : لای تۆم خۆش

زەردە

سەرچاوم هاتی و بەخێرچی .

[ تەوقە لەگەڵ یەك دەکەن . نووسەر دەڕوات ]

[ زەردە دەفتەرەکەی دەکاتەوەو دەست دەکا بەنووسین ]

تەواو

# لە هەولێر

● ئامادەكردنى ●

## چوارەم پێشانگای هونەرمەند فەیسەڵ عوسمان

لە رۆژانی 1 — 4/4/1984 لە لایەن كۆمەڵەی هونەرە جوانەكانی كورد ـ لقی هەولێرەوە چوارەم پێشانگا بۆ هونەرمەند فەیسەڵ عوسمان لە هۆڵی قوتابخانەی ئەیوبی یە سازكرا .

### ژیانی هونەرمەند

* ساڵی 1956 لە شاری دێرینی هەولێر لە دایك بووە .
* ساڵی 1977 لە قوتابخانەی ئامادەیی پیشەسازی لە هەولێر دەرچووە .
* ئەندامی نەقابەی رۆژنامەنووسانە .
* ئەندامی كۆمەڵەی هونەرە جوانەكانی كوردە .
* لە ساڵانی [ 1980 — 1983 ] تابلۆكێشی چاپەمەنی یەكانی دەزگای رۆشنبیری و بڵاوكردنەوەی كوردی بووە .
* ئێستاش قوتابی پەیمانگای هونەرە جوانەكانە لە بەغا .

### ـ كارە هونەری و پێشانگا تایبەتی یەكانی ـ

* پێشانگای یەكەم ساڵی 1975 لە هۆڵی قوتابخانەی ئەیوبی یە لە هەولێر .
* پێشانگای دووەم ساڵی 1976 لە هۆڵی ئەیوبی یە لە هەولێر .
* = سێ یەم = 1978 = = = =

### ـ ئەو پێشانگا یانەی هاوبەشی تیا كردوە ـ

* پێشانگای هونەرمەندەكانی شاری هەولێر كە لە ساڵی 1974 لە هۆڵی ئەیوبی یە سازكرا .
* پێشانگای قوتابیانی پەیمانگای هونەرە جوانەكانی بەغا لە هۆڵی پەیمانگای هونەرە جوانەكان ساڵی 1983 سازكرا .
* پێشانگا هاوبەشی یەكەی هونەرمەندانی كۆمەڵەی هونەرە جوانەكانی كورد لقی هەولێر لە هۆڵی كتێبخانەی گشتی لە ساڵی 1983 دا سازكرا .

### ـ هونەر یا سروشتی تابلۆكان ـ

**هونەرمەند بە** (30) تابلۆی هەمە جۆر پێشانگەكەی خۆی پێرازاندەوە (28) یان زەیتی و دووانیان ئاوی بوون ... كاری هونەری لای فەیسەڵ عەشق و خۆبۆسووتانێكی هەمیشەیی یە لە وردبوونەوەو قووڵ بوونـەوەیەكی هێمنـانەی پێشـانگاكـە زەوقێكی بـە چێـژو هـەستێكی نـاسـك رەچـاو دەكـرێت [ تۆیژینـەوەی رەنگەكـان ـ دراسة الالوان ] و [ سـروشتی

سرگیان - طبیعة جامدة ] ، [ ژیانی ریالیزمی ] له سەرجەم تەنوکاندا هەریەکەیان خانەی تایبەتی بۆی براوە :

- هونەرمەندو بیروڕای هونەروەری -

لە چاوپێکەوتنێکی تایبەتیدا فەیسەڵ عوسمان بیروڕای هونەروەریانەی خۆی بەم جۆرە دەربڕی :

[ هونەر یەکێکە لە گرنگترین ئامرازەکانی دەربڕینی خودو هەستە ئیجابی‌یەکان بەرامبەر بە سروشت و مرۆڤ .. جا هونەری تەشکیلیش پلەیەکی بەرزی ئەو دەربڕینانەیە . هونەرمەندیش چاوێکی دووربینە خەیاڵی بەرفراوان لە مێشکی مرۆڤدا قوڵ دەکاتەوەو ڕوونکاریەکی جوان لە گلێنەی چاوەکانیدا دەنوێنێ .. و هەست کردن بە جوانی‌و باری مرۆڤایەتی هەردووکیان مرۆڤ بە هونەرمەندەوە گری دەدا .

لەم پێشانگایەمدا تەنیا چەند لایەنێکم لە شێوازە دیراسی‌یەکان وەرگرتووە ، لەبەر ئەوەی من ئازەکارم‌و هێشتاش لە ڕێچکەیەکی نوێ دەگەڕێم بۆ کارە هونەری‌یەکانم‌و هەرچەندە شێوازی نیمچە [ میتافیزیکی - سوریالی ] لە هەندێ بەرهەممدا دەبینرێت ، بەلام مانای ئەوە نی‌یە من لایەنگیری سوریالیزمم کەچی دەکرێ ئەم شێوازە ببێتە ڕێچکەیەکی نوێی هونەرەکەم .

پێشانگەکەم بە گشتی بە تابلۆی شێوێنراو دادەنرێت ، چونکە بەڕای من گۆراندنی هونەری لە گەڵ وەرگرتنی هەموو قۆناغە دیراسی‌یەکانی هونەردا یەك دەگرنەوە .

مامەلەکردن لە گەڵ مۆدیل‌و سروشت چاکترین ڕابەرە بۆ گەیشتن بە ئارەزوو لەهەر شێوازێکدا . ] .

- تابلۆکان -

هونەرمەند پێشانگاکەی بەم تابلۆیانە ڕازاندبووەوە :

- گەڕانەوە بۆ شوێنەواری گوندەکە .
- پەڵە هەورێك ، کاتێ خۆر زەوی دەگرێتە باوەش .





- جووتە ئەسپ ، دیمەنی ئوتێلی سەری ڕەش .
- ئافرەتێکی کورد ، ڕوانینە دوا ڕۆژ .
- هەڵپەرکێی کوردی ، ڕەنگاکاری (5) تابلۆ
- وێنەکەم ، هاوارێك ، نانکەر ، ئافرەتێکی کورد .
- جوانی ئەسپ ، وەلی دێوانە (2) تابلۆ ، ستیل لایف (3) تابلۆ .
- دیمەنێکی سروشتی (4) تابلۆ ، حاڵەتێك ، مریشك فرۆش ،
- مۆدیل (2) تابلۆ ، سێ ڕوخسار ، حاڵەتێك (2) تابلۆ .

## کۆڕێکی شیعری

ڕۆژی چوارشەممە ڕێکەوتی 28/3/1984 سەعات (10) ی سەر لە بەیانی لە هۆڵی بەڕێوەبەری ڕۆشنبیری جەماوەر لە هەولێر کۆڕێکی گەرم‌و گوڕ بۆ کۆمەڵی شاعیر سازکرا ... سەرەتا مامۆستا عبدالوهاب تاڵەبانی وتاری دەزگای ڕۆشنبیری وبلاوکردنەوەی کوردی لقی هەولێری خوێندەوە .. دوابەدوای ئەو مامۆستا ناظم دڵبەند یەکەیەکە شاعیرەکانی پێشکەش‌کرد ، کە برتین لە :

**جەلال مەلا حەسەن خۆشناو** : بەم ناو ونیشانە [ لە سەنگەری بیروبڕوادا - جارێکی دی ئەبرەها دەشکێت ] شیعرەکەی خۆی خوێندەوە .

چەکەکانمان
بە خوێنی سوور



ژەنگو توزیان ئەشۆرێنین
لە سەنگەرە برسی یەکانی
سەر سنووری وڵاتەکەم
بەکار دێنین
تەقەو گرمەی
شاخ و کێوی ، خاکی وڵات
لە ژێر پێی شەڕخوازەکان
ئەلەرزێنین
ئەلەرزێنین
تا دوژمنانی ئەو خاکە
چۆك ئەدەن و بەجێ دێڵن
ڕق و کینەو دژیایەتی
دژیایەتی .

ڕۆستەم بلجەلانی شیعر عەشق و خۆشەویستی و خۆبۆسووتانە لای شاعیری ڕەسەن دلداری‌کردن لە گەڵ پاکی و هەڵوێست و جوامێریدا ئەو پەڕی واتاو گەورەیی شاعیر دەگەیێنێ ... ڕۆستەمیش بەو زمانەدوا :

**- داستانی دەریا -**

کوڕەم نەختێ لەسەرخۆبە
جەربەزەو بە هەڵپە مەبە
با ماشێنی مەرگت بەرەو ناخی ئەم خەرەندە نەتبا
با ئەژدەهاك لە قوڕگیا قوتت نەدا
کچێ دایە
گوێ لەم سەرگوزشتەم بگرە
وەبیرمە کە منال بووم
بلبلێکی ڕەنگین کەوتە حەوشەکەمان
کاتێ بینیم لاباڵیکی زامدار کراوەو بێ ئارامە
دلم پێ سووتاو زامەکەم پێچایەوە
پاشان لە نێو قەفەزێکا بەندم‌کردو
دانەویلەو ئاوم خستە بەردەمیەوە
هێندەی نەبرد زام چابۆوەو دەرم هێنا
بەلام دایە
ئەوەی جێگای سەرسوڕمان بوو
بلبلەکە لەپڕ لەنێو لەپەکانم
خۆی هەڵتەکاندو هەڵفڕی
فڕی !.. فڕی !
تا لە چاوان وون بوو فڕی
منی خامیش دوێنێ تاوانم دەخستە
ئەستۆی بلبلی بەندکراو
کەچی ئەمڕۆ
ئەمڕۆ دەڵێم : ئێ بلبلە زامدارەکە
نازانم بۆ لەقەفەزا بەندم کردی و ئازارم دای

**مەسعود پەرییشان**

کاتێ کانی بەهرەی شاعیر ئەتەقێتەوە کە لە گەڵ خۆی و دەوروبەردا ڕاستگۆبێت . بێ باکانە گورانی بۆ گوڵ وگڵ بلێت ، دلداریەکی بێگەرد لەگەڵ خۆشەویستەکەیدا بکات .. ساباورد سەرنج لە [ چەپکێ تیشکی دەم شەوەزەنگی ئەو هەوارە ] بدەین :

زریانێ گێژتان پێ ئەدا ، ئارەقەو خوێنی پێ ئەوێ
ڕووبارێکتان شەپۆل ئەدا ، مرۆڤ و تاریکە شەوی لێتان ئەوێ
چوار چرا ڕێشمەی ئەسپێکی ڕەهانی بۆ قازی ئەوێ
کوردستانیش بەهارێکی بەردەوامی بۆ مەهابادی سوور ئەوێ .

**سەید جەلال سەید حەسەن بەرزەنجی**

کاك سەید جەلالیش لەو شیعرەی پێشکەشی کرد بە

ناونیشانی [ هەروگیفەکانی ڕەفسەنجانی ] . کە تیایا دەڵێ :
پرسیم لە کوڕێك لە خەڵکی ئێران
بۆچی داماوی هەی ماڵم وێران
ئەوها مەلول و ڕەنگ پەشۆکاوی
خەڵکی کام شاری .. لەکێ جێماوی ،
بۆچی نەورۆزت بەڕەش نووسراوە ؟
کێ بوو سەبەبی ئاگر کوژاوە ؟
وتی : نازانم ئێمڕۆ نەورۆزە
کێ بە من دەڵێ جەژنت پیرۆزە
من لە کوردستان وابووم دەربەدەر
چۆن دانەمێنم بۆ دەردو کەسەر
وێرانکردن و پەت و سێدارە
بۆ کوردی ئێران ڕۆژی هەزارە
وەلامم داوە بەم وشە جوانە
سوێندم بە خاکی ئەم کوردستانە
گەلێك بیەوێ بگا بە ژیان
ئەبێ هەزاران گەنجکا بە قوربان
**ئەحسین مەولود**

برای تازە پێگەیشتو کاك ئەحسین مەولود لە شیعری [ چرۆی سەرکەوتندا ] بە دەنگێکی زوڵاڵەوە هاوار دەکات :

هەزارێکم
سنگی ڕووتم قەڵغانێکەو
دەیخەمە دەستی هەمووتان
بە شایەت بن
دەیکەم بە جوانترین خەلات
بۆ هەرکەسێ
خۆی ببەخشێ
لەسەر ماف و
خاکی وڵات .
**مەغدید سۆران**

کاك مەغدید سۆرانیش لەو شیعرەی کە بە ناوونیشانی [ دوونامە لە هەندەران ] هوە وتی :

**(نامەی یەکەم)**
با کۆتری نامەبەر بێتن ، نامەی دڵ بەرێ
لەدامێنی قەندیل دەردی دووریم دەربڕێ
بەر لە کروزانەوەو باراندی ئەشکی سۆز
یەکسەر لە جیاتی من کڕنوش بۆ جوانی بەرێ .
**(نامەی دووەم)**
نەمەم ، نە فەرهاد ، نە پەروانەو مۆم
لە ڕێگای شەما نەسووتان وەك خۆم
ئێستاش هەر وێڵم بە دوای خێڵەوە
سەد جار بمکوژن زندوو دەبمەوە
« ئەحمەد بۆڵی » چوار قورنەیی
ئەم برایەش بە ناونیشانی [ سکاڵایەك بۆ کوردستانی ئێران ] بەشداری ئەو کۆڕە شیعرییەی کرد ، کە سەرەتا بەم کوپلەیە هاتە پێشەوە :
کوردستان مافت لەسەرمە چاوەڕوانی هەل دەکەم
بۆ خەباتت سەر دائەنێم تەرکی دانیشتن دەکەم
گوێ نادەمە خوشك و برام بۆپێشەوە هەنگاو دەنێم
ماڵ و خێزان جێ دەهێڵم پشت لە خزم و کەس دەکەم
شەو بێ خەوو ڕۆژ بێ خۆراك ، بە بێ ی پەتی و بێ پۆشاك
لە مەیدانی جەنگ دەوەستم تا دوژمنم بێزار دەکەم
لە گەڵ ڕۆڵەی مەهاباد و سنەو سەقزدا دەوەستم
لەگەڵ دایك و خوشکی ئێران یەکیەتی یەك دروست دەکەم

# لە سلێمانی

« ئاسۆس » ئامادەی کردووە

**پێشانگای قوتابخانەی ناوەندی ڕەنگینی کچان**

ڕۆژی چوارشەممە ڕێکەوتی 2/5/1984 قوتابخانەی ناوەندی ڕەنگینی کچان بە دیار مۆمێکی کافورییەوە لە گەڵ تەواوبوونی ساڵێك بەسەر دامەزراندنی ئەم قوتابخانەیەدا پێشانگایەکی ڕەنگینیان کردەوە ، تائێوارەی 6/5/1984 هونەرمەندان و ڕووناکبیران و مامۆستایان و قوتابییان سەریان لەم پێشانگایە ئەدا بۆ بینینی بەرهەمی قوتابییان . بە شێوەیەکی گشتی پێشانگاکە بریتی بوو لە :

1 — نیگار بە بۆیەی (پۆستەر ، ئاوی ، پاستیل ، زەیتی ) .
2 — شێوازێکی‌تر بە ووردەکاغەزی ڕۆژنامــەو گۆڤــار لە سەر شێوەی مۆزاییك .

3 — شێوەیەکی‌تر لە کارکردن بە کاغەزی ڕەنگاوڕەنگ
4 — ئیشی دەست بە خوری ، بــە شێوەیــەکی تازە کــە وێنەی پێ بکرێت .
5 — دروست‌کردنی وێنە بە دەنکە شقارتە .

6 — وێنە دروست کردن بە قوڕی سناعي لە سەر شێوەی بۆیە .
7 — دروست‌کردنی وێنە بە شێوەی کڕاندن .

8 — کاری دەست بە قوڕ « سیرامیك » بەبێ سوورکردنەوە .
9 — ئیشی پەیکەرتاشی « نەحت » لە بۆرەك‌و قوڕ .
10 — ئیشی دەست : چنین ، دروومان ، نەخش ،

ئەم پیشانگەیە کە سەرنجی بینەرانی ڕاکێشابوو ، وە بوبـوە جێی ڕەزامــەندی‌و ستــایشی هونــەر دۆستــان لە دوو هــۆڵی قوتابخانەکەو دوو ژووری گەورەدا پیشان درابوو . بۆ ئەوەی زیاتر لە چۆنیەتی سازکردنی ئەم بەرهەمانە بگەین چاومان بە هونەرمەند مامۆستا « نوری ئیسمــاعیل فــەتاح .. کــەوت کە مۆستای هونەرە لەم قوتابخانەیەدا لە وەڵامدا ووتی :
« ئەوەی بەلای منەوە گرنگە پەروەردەکردنی هەستی هونەرییە لە ناو قوتابیەکانماندا تابتوانن بە هــەستێکی هونــەری پاك ، ســـروشتی جــوانی کــوردستــان‌و بــابــەتــە نــەتــەوەیی‌و مرۆڤایەتیەکانی دەرببڕن . ئێمــەی مامــۆستایــانی هونــەر لە ڕاستیدا ئەرکێکی گرنگ‌و گرانمان لە سەرشانــە . یەکــەمیان ئەرکی نەتەوایەتی ئــەمجا ئــەرکی مامــۆستایــەتی . بۆ ئــەم ڕاستیەش ئەبێت وەك مرۆڤێکی کورد گیانێکی پاك لە ناو ئەو قوتابیانەدا پەروەردە بکەین ، چونکە ئەوەی لای ئێمە تائێستا تێبینی‌کراوە کە لە پیشانگاکانی قوتابخانەی کچانا بایەخ زیاتر بــە ئیشی چنــین‌و دروومــان دراوە ، بــەڵام من ئــەمــەوێ لەم پیشانگایەدا لەو چوار چێوەیە دەرچم ، وە ئەوەشمان سەلماند کە قوتابیانی کچان ئەگــەر ڕێگای هــونەری ڕاستیــان پیشان بدرێت توانای هونەری باشیان هەیە وە بە هیچ جۆرێ لە برا قوتابیەکانیان کەمترنین .

وەك مــامۆستــایەکی هــونەر ، وەك کــوردێك ئــاواتم ئەوەیــە پیشانگایەکی تایبەتی بۆ منالانی کورد بکرێتەوە گشت منــاڵە بەهرەدارەکانی کوردستان تێیدا بەشداربن ، لە ئێستــاشەوە من ئامادەیی خۆم پیشان دەدەم بۆ سەرپەرشتی‌کردنی ئــەو کارە . بۆ ئەوەی بی‌سەلمێنم کە منالانی کــورد چەنــد خاوەن هەستی هونەری جوانن وە چەند بەهرەدارن ، لێرەدا ئەوەش دەهێنمەوە یاد ـ هەرچەندە گۆڤاری کاروانی ئــازیز هــەر لەم گۆشەیەدا پەنجەی بۆ ئەوە ڕاکێشابوو ـ دەڵێم : پار ، چەند تابلۆیەکی منالانی قوتابخانەی بۆتانم بۆ « دەزگای ڕۆشنبیری منــالان » لە بــەغــدا بــرد ئــەوانیش ڕەوانــەی پیشــانگــا





حیهانییەکانیان کرد ، لە ئەنجامدا دوو قوتابیم (نەوروز جەلال و مریاد ئەحمەد) خەلاتیان بۆ نێررا لە لایەن پیشانگای ئەتاتورکی ـ مولی و پیشانگای ئیسلامییەوە .

ئەم سەرکەوتنە ئەوە دەگەیەنێ ئەگەر مامۆستایانی هونەر رێگا بۆ منالان خۆش بکەن و دەست بدەنە بالیان دەتوانن بە هەموو جیهانیان بناسێنن »

هەروەها مامۆستا نوری دەربارەی بەتوانایی منالی کورد ئەوەشی بیر خستینەوە کە جارێکی تریش کچێکی خۆی (ناز نوری) لە پیشانگایەکی جیهانی لە ژاپۆن پاداشتی تایبەتی وەرگرتوە . دەربارەی قوتابیەکانیش مامۆستا نوری ووتی :

« ئەو قوتابیانەی کە دوارۆژێکی رووناکیان لێ ئەبینم ـ مەبەسم لە بواری هونەری تەشکیلیدا یە ئەمانەن :

گەلاوێژ شەریف ، رازاو رەشید ، شادیە عمر خالد ، شیرین عبدالله ، رێزان عمر بارام ، بێستان صدیق ، نەسرین رەحمان ، کوێستان غریب ، تریفە عمر حمدی ، کوێستان سعدی گدرون ، نیگار ئەحمەد ، سنەوبەر ئیبراهیم ، سەرەرای چەند قوتابیەکی تر کە ئێستا ناوەکانیانم لەیاد نیە .

**رای هونەرمەندان دەربارەی ئەم پیشانگایە :**

**هونەرمەند جلال عزیز رسول ووتی :**

« پیشانگاکە نمونەی دلسۆزی هەول و کۆششی مرۆڤی دلسۆز بە نەتەوەو نیشتمانە ، ئەگەرچی بەلامەوە جێی سەرسوڕمان نیە چونکە مامۆستا نوری اسماعیل ئەو هونەرمەندە دلسۆزە دەست رەنگینەیە زوربەی قوتابخانەکانی بەم کارە هونەرییانە ئاوەدان کردۆتەوە ، ئەم پیشانگایە خۆی لە خۆیا نیشانەی ووشیاری و پێشکەوتن و دلسۆزییە بۆ هونەری میلەتەکەمان »

**هونەرمەند عوسمانی شێخ مستەفای خال ووتی :**

ئەوەی سەرنجی راکێشام وێنەو پەیکەرتاشی و ئیشی گڵێن و چنینە مامۆستای هونەر توانیویەتی قوتابیەکانی ئاراستەی هونەر بکات و بیان جوولێنێ و ئەنجامیش واسەرکەوتوو بێ » .

**هونەرمەند ئیسماعیل خەیات دەربارەی پیشانگاکە ووتی :**

« سەرەتا ئەم پیشانگایە دلسۆزی کاک نوری دەردەخات سەرەرای تواناو بەهرەی قوتابیانی ئەم قوتابخانەیە بە تایبەتی لە هونەری تەشکیلیدا ، سوپاس بۆ هونەرمەندو بەرێوەبەرێتی و مامۆستایان و قوتابیانی ناوەندی رەنگینی کچان . »

**هونەرمەندی لاو ئازا حسیب قەرەداخی ووتی :**

« هەولێکی پاک و باش دراوە بۆ ئەم پیشانگایەو شانازییە نەک هەر بۆ ئێمە بەلکو بۆ خودی قوتابیەکانیش ، سوپاس و رێزم بۆ مامۆستا نوری و قوتابییەکانی . »

**لە کۆتاییدا جارێکی کە مامۆستا نوری اسماعیل ووتی :**

« نامەوێ ئەم هەلەم لە کیس بچێ ، دەمەوێ ئەوە رابگەیەنم کە بەرێوەبەری قوتابخانەکەمان و یاریدەرەکانی و گشت مامۆستایان هەمیشە بە هەستێکی پاک هانی گشت قوتابیانیان ئەدا بۆ ئەوەی کە لە بواری هونەردا پێشکەوتووبین ، هەر ئەو هاندانەش بووە هۆی رەزامەندی ئێوەو سەرکەوتنی پیشانگاکەمان . »

**« کۆرێکی پەروەردەیی »**



بەرێوەبەرێتی رۆشنبیری جەماوەر ئێوارەی 1984/5/3 کۆرێکی فراوانی لە هۆلی کارگەی جگەرە بۆ مامۆستا عومەر عەبدولرەحیم سازکرد ، ژمارەیەکی زۆر لە مامۆستایانی قوتابخانە سەرەتاییەکان ئامادەی ئەو کۆرەبوون ، مامۆستا عومەر لە بواری پەروەردەکردنی منالا جێ پەنجەی دیارە ، ماوەیەکی زۆری لە تەمەنی وەک مامۆستایەکی سەرکەوتوو لە قوتابخانەکاندا بەسەربردوە ، لەم ئێوارە کۆرەدا سەبارەت بە

بیرەوەریەکانی خۆی دوا لە سەرەتای خوێندنیەوە تا ئەوکاتەی خانەنشین‌بوە ، ماموستا عومەر چونکە چارەکە سەدەیە زیاتر لە پۆلی یەکـەما دەرسی وتـوتەوەو منـالانی پێ‌گەیـاندوە بـۆیە گێرانەوەی بیرەوەریەکانی تەڕو پاراوو ڕەوان‌بوو .

لە ڕاستیدا دەربارەی ئەم کۆڕە چەند سەرنجێك هەیە دەیخەمە پێش چاو بە مەبەستی ئەوەی کۆڕەکانمان گەرم‌و گوڕ ترو بە پێزتربن :

یەکەم : ماموستا کەریم زەند بەڕێوەبەری کۆڕەکەبوو ، بەلام مەگەر بە خۆیی چێشت خۆی لە قەرەی مـاموسـتـا عومەرو کۆڕەکەی دابێ ، سەرەتا نزیکەی سێ چارەك سەعات مـاموسـتـا زەند خـۆشی کەوتـە گێرانـەوەی بیـرەوەرییـەکـانی خـۆی ، چـۆن نـاچـار بـوون لە مەلکەندییەوە بچن بـۆ قوتـابخانـەی خالدیـەو چۆن منالانی ئەو گەرەکە (تـرانزیت) یـان لێ‌سەنـدوون ، چونکە هەموو ڕۆژی بە خاکی ئەوانا تێپەڕیون ، لەگەل ناو هێنانی هەندێ لە پیاوە ناسراوەکانی ئەم سەردەمە کە ئەو کاتە پێکەوە قوتابی‌بوون .

ماموستا کەریم خـاوەنی تاقیکـردنەوەیـەکی زۆرە لە بواری پەروەردەدا وا بۆ چل سال دەچێ ماموستایەو بەڕێوەبەرەو سەرپەرشتیارە لەبەر ئەوە جێی خۆیەتی ئەگەر [ بەڕێوەبەریتی ڕۆشنبیری جەماوەر ] چەندین کۆڕی لەم بابەتە وە بۆسازبکات تا لە تاقیکردنەوەکانی سوود وەربگرین نەك لە پێشکەش‌کردنی یەکێکی تـرا ئەوانە بلێ .

دووەم ـ مـاموسـتـا عومـەر ئەدیبـەو چیرۆکنـووسی منـالەو ماموستایە بە پێی ئەو شارەزاییانە دەبوو باسێکی نوێ پێشکەش بکات چونکە لە مارتی 1980 دا لە هۆلی (دار المعلمین) هەمان ئەم باسەی ئەمڕۆی لە سەر خواستی لیژنەی زانستی ئیدارە پێشکەش‌کرد ، ئەو کاتە لیژنەکە بریتی‌بوو لە ماموستایان عبدالله میدیاو ئەرخەوان‌و مستەفا سالح کەریم ، چاوەڕوانی باس‌و لێکۆڵینەوەو تاقیکردنەوەو بیرەوەری بە پێزتـرین لە ماموستا عمر .

« لە ژمـارەکانی داهـاتوودا دەربـارەی ئەم چـالاکییانـە دەنووسین »

1 ـ چلەی مـاتەمینی خـوا لێخوشبـوو ئەمینی میـرزا کەریم 1984/5/10

2 ـ پیشانگای فۆلکلۆرو کەلوپەلی ناومال لە کاریزە 1984/5/15

3 ـ پیشانگای منالانی خانەی نەوجوانان 6/2 تا 6/4

4 ـ ئێوارە کۆڕێ دەربارەی پیشانگای نەوجوانان 6/4

5 ـ کۆڕێك دەربارەی شانۆی شیعری 6/7

# لـــە دهـــۆك

ژ ئامادەکرنا : مەتین

## ژ بۆ پێشێختنا لڤلڤینا شانوگەریێ ل دهوکێ

دەمێ مـروڤ دنێریتـە بزاڤـا ڕۆشنبیری ل پـارێزگـەهـا دهوکێ ، دێ بینیت کو ئەڤە دەمێ دوو سالانە لڤلڤینەکا باش یا هـەی . دامو دەزگـەهێت ڕۆشنبیـری ل دوی کـارین‌و هێـزو ڤەژەنێت خو دەوەرەکێ مەزنێ دیتی دڤێ لڤلڤینێدا . بتایبەتی ریڤـەبەریـا ڕۆشنبیری جـەماوەر وە دەزگـەهـا ڕۆشنبیـری‌و بەلاڤکرنـا کوردی ، وە ئێکـەتیا نڤیسڤـانێت کورد ـ تـایێ ـ دهـوکێ . لێ چاخێ هێڤـدکەینـە بزاڤێت هـەتا نهـو هـاتینـە پێش‌کێش‌کرن دێ بینین کو شانو نە ل لوك‌و ئاستا بزاڤێن دنە .

ـملزه هەر دکەڤندا بزاڤا شانوگەری ل پارێزگەهێ یا هەژارو ـکەتیە . بەلکو تەنها دبیرهاتن‌و هندە هەلکەفتنادا سەری هەلددەت‌و خو دکێشیتە مەیدانێ . لەوما پاشکەتی‌و لاوازو بێ هێزە . وە هولی بڤی دەست داری بپاش ناکەڤیت .ژبو ـدست نیشانکرنا ئەگەرێت ڤێ داکەتنێ ، وە چارەسەکرنا وان ئەگەرا ، ژبو بەرفرهێش‌برنا بزاڤا شانوگەریێ ل دهوکێ ، مە ـیت گەلەکا فەرو پێتڤی‌یە ئەم هزرو بیرو رایێت چەند پسپورو روشنبیرا ل پارێزگەهی تێکەهەلدەین . تەڤدا مینا کورانکەهەکا بەرتەنگ گرێدەین . ژبو دیتنا هندەك رێکێت دبنە هاریکار بو کوماستنا ڤی باری بو بەرف چاکترو باشتر ژ لایێ خو ڤە . هەر چەندە ئەم دبینین ئەڤ کارە ئوبالەکا (مسؤولية) تەڤایی‌یە کش دامودەزگەهـ تڤی‌یا هەول بدەن ڤی بارێ کەتی راکەنە سەر پیا .

ل پێشیێ کاك وصفی حسن ردێني بو مە ل سەر جورێنێت جەماوەرێ شانوییێ ل دهوکێ ئاخفت کەرەم کر گوت : جەماوەر شانوییێ ل دەڤەرا خو ئەم دشێین بکەینە سێ جورین . ئێك : ئەڤێت باوەری هەی ب دەورێ شانوییێ دگوهرینا هزرو بیرادا . دوو ئەڤێت ژ بەر کەنی‌و حەنەك‌و سوحبەتێت دشانوگەریێدا تێنە پێش . جونیا سیێ : دهێنە پێش شانوییێ بو چاخ بوراندنێ ، لێ ئەم دکارین بێژین کو هێدی هێدی جەماوەرێ شانوییێ ل دهوکێ یێ زێدەدبیت .

کاك « بانییز عمر » نڤیسڤان‌و دەرهێنەرێ شانوگەریێ ژلایێ خو چەند ئەگەرێت داکەتنا هونەرێ شانوییێ ل دهوکێ دەست نیشانکرن گوت : ئەز ڤان ئەگەرا بەرێ هەمی تشتا دکەمە ب پشت‌گوهڤە هاڤێتنا شانوییێ وەکو هونەر ژ لایێ کاربدەست‌و دەزگەهاڤە ل پارێزگەهێ .

دیسا نە پەیدابونا چو تیپێت دەستوپردای هەتا نهو ، وە نەبونا هولێت تایبەتی بو شانوییێ . دێ بینین تەنها دەمێ هەلکەفتن‌و ڤەبونا ڤیستەڤالا دام دەزگەهێتا تێکەلی بروشنبیریێ ڤە دەستێ هاریکاریێ بو تیپا درێژدکەن ئەوژی نە ل ئاستا رزامەندیێ‌یە . هەر وەسا ل سەر جەماوەرێ شانوییێ ئاخفت گوت : ژلایەکێ دیڤە جەماوەر یان کومەلێ دهوکێ ژ بەر کو شانوگەری ل بازێرێ وان وەکی (هێکا دیکلیە) وسا دشانوییێ دگەهن وەکی چاوا دبەرهەمێ بازرگانیێ ، سینەما وتەلەفزیونی دگەهن . ژ لەوما ناهێلن کورو کچێت وان نێزیکی



شانوییێ ببن ، بتایبەتی کچ . هەر وسا بچاڤەکێ باش نا سەحکەنە کارکەرێت شانوییێ . وە هەتا نهو چ ڤەکولین ل سەر شانوییێ ل دهوکێ نینن‌و نەهاتینە کرن . لێ دسەر ڤێ هەژاریێرا ڤان سالێت دویماهیێ هژمارەکا شانوگەریا هاتنە پێشکێش کرن دخراب نەبون . هندەکا ژوان پشکداری کر دئاهەنگو ڤیستەڤالادا ، ئەنجامێت باش ئینان ، ژکش ئالێت هونەرێ شانوگەریێ‌ڤە خەلك نەمازە پسپورێت شانوییێ ل پارێزگەهێت دن ژ کوردستانێ ژ ڤان شانوگەری‌یا درازی بون .

ئەڤە چ دیارکەت ، دیاردکەت کو بزاڤەکا هەی ، هێزەکا هەی ، پیچیبون‌و پێڤەهاتنێت خورت یێت هەین ، ئانکو بنەکوکەکا هەی دڤێت بهێتە حوکم کرن وە ئاڤاهیەك ل سەر بێتە دانان . دا ئەم دەورێ خو ببینین ل رێکا پێشێخستنا هونەرێ شانوگەریێ مل بمل ل گەل شارێت دن ل کوردستانێ ، وەل گش وەلاتێ شرین . دوویڤدا نڤیسڤان‌و ئەکتەرێ داهێنەر کاك « رفعت رجب » بو مە تبابەکێ ل سەر دیروکا شانوییێ ل دهوکێ ئاخفت گوت : ژ سالا 1972 یێ وەرە من ل گەل شانوییێ ل دهوکێ دەست پێکریە ب هندەك شانوگەریێت خاندنگەهی . بو جارا ئێکێ من شانوگەری‌یا « الوحدة الوطنية » پێشکێش کر ژدانان‌و دەرهێنانا فرهاد شریف یا کو ل شارێ مویسل هاتیە پێشکێش‌کرن . وە ژ شانوگەریێت من بەشداری تێدا کری ل دهوکێ و ل لوکا وەلاتی ، ئەڤ شانوگەریێت ژێرینە :

1 – شانوگەریا « الوحدة الوطنية » ژ دانان‌و دەرهێنانا فرهاد شریفی ، ل مویسل‌و دهوکێ هاتە پێشکێش کرن .
2 – شانوگەریا « التصفية » ژ دانان‌و دەرهێنانا جهاد دلپاکی ، ئەڤ شانوگەریە هاتە پێشکێش کرن ، ل هەڤلێرو دهوك .
3 – شانوگەریا « طوفان الصمت » دیسان ژ بەرهەڤکرن‌و دەرهێنانا جهاد دلپاکی وەل هەڤلێرو دهوکێ هاتە پێشکێش کرن .
4 – شانوگەریا « الصلب » دانانا کمال ملکي‌و دەرهێنانا سعيد مجيد ئەڤ شانوگەریە ل مویسل هاتە پێشکێش کرن .





5 — شانوگەریا « الرجل الذي قال لا » دانانا عبدالاله حسن ، وە دەرهێنانا سعيد مجيد ، هاتە پێشكێش كرن ل هەڤلێرو دهوك .

6 — شانوگەریا « نافذة التاريخ » ژ بەرهەفكرن و دەرهێنانا سعيد مجيد ل دهوكێ و هەڤلێر هاتە پێشكێش كرن .

7 — شانوگەریا « غريب بالسلف » دانانا عبدالمنعم شكرى » وە ژ دەرهێنانا سعيد مجيدى ، ل دهوكێ هاتە پێشكێش كرن .

ئەڤ شانوگەریە هەمى ل نافبەرا سالا 1972 وە 1978 هاتنە پێشكێشكرن . پشتی ڤان كارا من ئو هندە ئەكتەرا ديت يا فەرە ئەم شانوگەرێت خو ب زمانی كوردی پێشكێش كەين . وە ل دويڤ زانينا من هەر ژ سالا 1965 ێ وەرە شانوگەری ل دهوكێ ب زمانێ كوردی تاتنە پێشكێش كرن . ئو هەتا سالا 1972 . ل سالا 1978 ئێكەمين شانوگەری مە پێشكێش كر ب زمانێ كوردی ل ژێر ناڤێ « الفيل يا ملك الزمان » ، « فيلێ تە ئەی مەليكێ زەمانی » دانانا سعد الله ونوس و دەرهێنانا سعيد مجيدى . ڤێ شانوگەریێ دەنگڤەدانەكا باش هەبو ل ناف جەماوەری ل دهوكێ ، نەمازە شانوگەری هاتە پێشكێش كرن ل هەڤلێرو زاخوو عمادیەو دهوكو فايدە . هەر وێ سالێ مە تەمسيليەك پێشكێش كر بو تەلەفزيونێ ل ژێر ناڤێ « لا للامية » ژ دانانا عبدالله اسماعيلی وە ژ دەرهێنانا خليل ابراهيمی بو تەلەفزيونێ . ل سالا 1980 مە ئێكەمين تيپا شانوێ چێكر ل دهوكێ ، ل ژێر ناڤێ « تيپا بزاڤ يا شانوێ » تەنها ل سەرێ وێ ئەزو ئازاد عبداللهو بائيز عمر بوين . ل سەری ، تيپ هاتە ب بەرێكڤەئينان كو خو ب دەتە ل گەل رێكخراوەكا جەماوەری ئينا جو دگەل ئێكەتيا قوتابييت كوردستانێ لقێ دهوكێ . ئو ئەندامێت تيپێ دوەختێ خودا گەهەشتنە 16 كەسا . ئەڤ تيپە هەتا نهو ب ڤان كارێت ژێری رابويە :

1 — شانوگەریا « بزاڤ » دانانا بائيز عمر وە ژ درهێنانا آزاد عبداللهی .

2 — شانوگەریا « گەنجێت مهابادێ » دانانا زبير مائی وە ژ دەرهێنانا آزاد عبداللهی .

3 — شانوگەریا « گازيەك ژ كاوەی » دانانا عبدالله اسماعيلی وە ژ دەرهێنانا آزاد عبداللهی .

4 — تەمسيليا « خازگينی » دانانا عزت فندی وە ژ دەرهێنانا بائيز عمر ی بو ئێزگا كوردی ل بەغدا . ئاخفتن هێژ يا كاك رفعتی يە پێڤە چوگوت : ڤان شانوگەرێت ژوری بەشداری كر دفيستەڤالا دا ل ئاستا وەلاتی ئێكەمين دەرچون و خەلات وەرگرتن . نوكە ژی ئەڤ تيپە شول دكەت بو گش رێكخراوێت مللی و جەماوەری ل پارێزگەهێ كارێت وێ يێ ل لوكەكا باش ، لێ يا ب بەرهەمێ خوڤە هەژارە . هەر وسا دڤێ كورانگەها بچويك دا سەيدا « عبدالله هرور ژ لایێ خوڤە ل سەر دورهێلێ بزاڤا شانويێ ل دهوكێ ئاخفت ، كەرەم كر گوت : ئەم نكارين بێژين بزاڤەكا شانوگەری ل دهوكێ يا هەی ، لێ ئەم دكارين بێژين لڤلڤينەكا شانوگەری مە يا هەی . ئەڤ پێنگاڤێت تاتينە هاڤێتن هەتا بەری سالا 1977 گش دهەلنگڤتن . ئەز دكارم بێژم ئێكەمين پێنگاڤا چاك ئەوە يا كو ل دويماهيكا سالا 1977 هاتيە هاڤێتن . كاك عبداللهی ژی ئەو شانوگەريێت ژ ڤێ سالێ هاتينە پێشكێش كرن هژمارتن وە ديار كر كو شانوگەریا « رەنی » دويماهيكا ڤان پێنگاڤا بو ل سالا 1983 هاتە پێشكێش كرن . ئەڤ كارەنە بونە دەرازينكەك بو مەيدانا شانويێ ، چمكی ل پەی بنەكوكێت هونەری گاف هاڤێتن وە تێكستێت شانويێ يێت نڤيس وەرگرتن نە مينا ساليێت 1970 ێ ، زوربەی كارێت ڤان سالا ، دسەرهێ بون وە دموجد نەبون ب سستی ڤە تاتنە وەرگرتن . ديسا كاك عبداللهی تلاخو درێژكرە كەسێت هەتا نهو بڤان كارێت شانوگەريێ يێت رابوين رابوری گوت : ئەڤ جڤاتێت دشانويێ دا دخەبتن ، دێ بێژم (جڤات) چمكی هەتا ئەڤرو چ تيپێت شانويێ هەميا ب چڤێنيت دچارچوڤەكا تايبەتی دا نينن . مە شولە پێ نينە هندەك بێژن تيپێت شانويێ مە يێت هەين . چمكی هەكە بزڤرين سەحكەنە تيپێت خو چ نابينن ، تەنها دێ خو بينن يێ خو دسەردا دبەن . پاش كاك عبداللهی گوتی : زوربەی ئەكتەرێت مە قوتابينە ل سالا دويماهيكی ژخاندنا خو ، وە ژ بەر خاندنێ نكارن چاخێ خو هەميێ داننە دخزمەتا شانويێ دا . ديسان ئەڤێت ژ ويكا تێن چ پێڤەهاتن و سەربور دشانويێدا نينن .

ژ نيڤشكێ ئاخفتنيت برادەرا ئاشكرا بو كو راست شانو ل دهوكێ يا پاشكەفتيە ، نە مازە هەكە بەراورد بكەين ل گەل دەڤەرێت دی يێت وەلاتی . مە گەلەك پێخوشە ئەڤ



ـرەسەرییێت ڤـان برادەرێت هێـژا خەمخـورێت هـونـەرێ
ـنوگەریێ ل دهوکێ بو مە دەستنیشان کرین ئەم بکەینە ئێك و
ـ ئینە دچەند خالەکادا ، هیڤی دارین بێنە بجهـ ئینان ژ بو
ـێشئێخستنا کاروانێ شانوگەریێ ل پارێزگەهێ . ژوان داخاز و
چارەسەریا :

– پێشکێش کرنا دەستێ هاریکاریێ ژ لایێ رێکیخراوێت مللی و جەماوەری بـو بزاڤـا شانـوکەریێ ل پـارێزگـەهێ . وە دەستویردانا تیپا بزاڤ ژ لایێ وزارەتا راگەیاندنێ .

2– داخاز دکەین ژ گەنجێت دهوکێ ژ ئەڤینداریێت شانویێ خو بدرستی پاڤێنە ڤی هونەری ، بچنە ئاموژگاریا هونەرێت جوان ل سلێمانیێ ، دا بشێین کادرەکێ شـانویێ پـەیدا کەین . دیسا بڤێ رێکێ « اختصاصات » دێ پەیدا بن ، نە هەما چار پێنج کارەکا ئێك بتنێ بێ رابیت ، هەروەکی هەتا نهو چیدبیت .

3– گرێدانا کوڕو پێشکێشکرنا موحازەرا ل سـەر شانـویێ ل دهوکێ . ژ لایێ پسپورو کادرێت ڤی هونەری ل پارێزگەهێت دی یێت کوردستانێ ژ بـو وەرگرتنـا مفایی ژ پێڤـەهاتن و سەربورێت وان دڤی هونەریدا .

4– نڤیسڤان و تورەڤان ژ بەرێ خوڤە تڤی یا بدەورێ خو رابن ملا بدەنە بن ڤی باری و راکەنە ڤە چ بگێرانا کوڕا ل سەر شانویێ وە چ بنڤیسینا تێکستێت شانـوگەریێ و رەخنێ ل سەر کارێت تێنە پێشکێشکرن .

5– ڤەکرنا هولەکا تایبەتی بو شانویێ .

6– هیڤی دارین دەستویردانا تێکستێت شانویێ گەلەك گیرو نەبن دا کو وی دەمی هەمیێ نەمینینە بێکار .

7– بەرفرەهکرنا تیپێت شانویێ . وە پالدانا ژنکێ بو بەشداریێ ل گەل ڤان تیپا .

8– تـومارکـرنا کـارێت ل دهوکێ تێنـە پێشکێش کـرن ، بـو تەلەفزیونا کەرکوکێ .

# ڕێڤەبەریا چالاکیێت خاندنگەهێ و چەند بزاڤێت هونەری

ڕێڤەبەریـا چالاکیێت خـاندنگـەهی ئێکە ژدەزگـەهێت زیرەك بکـارێت بـەرکـەڤتی رادبیت سـەخمـەراتی پێشڤـەبـرن و پێشئێخستنا بزاڤا رۆشنبیری لپاریزگەها دهوکێ هەر وسـا بەرهەمێت داهێنەر یێت شاگردا وە یێت ماموستایان دگەهینیتە فیستـەڤال و پێشـانگەهێت لوەلاتی چێدبن دیسـان ئـەڤێت ژدەرڤەی وەلاتی چێدبن .

ژبو زانینا بزاڤێت ژیهاتی یێت ڤێ رێڤەبەریێ مە پێخوشە ئەم ڤێ چاڤپێکەفتنێ تومار بکەین لگەل هـونەرمـەندێ دلوڤـان سـەیدا اسمـاعیل عبـدالقادر کـاربدەستێ پشکـا هونـەرێت شێوەکاری لرێڤەبەریێ . لپێشیا ئاخڤتنا خو کاك اسماعیلی کەرەم کر گوت : دەمێ رابوری ژڤێ سالێ ئەم یێ بچەند بزاڤا رابوین ژوان بزاڤێت کو ئەم پێ رابوین ، ڤەکرنا پێشـانگەهـا لپارێزگەهێ وقەزاو ناحیا . ئەڤ پێشانگـەهە دپێکهـاتی بون ژبەرهەمێت شاگردا ژهونەرێت شێوەکاری و کارێت دەستی یێت فولکلورێ مللی و سامانی دەڤەرێ زل و بەربچاڤـدکەن ، هـەر وەسا ڤیانا وەلاتێ خوشتڤی ، ژلایەکی دیڤە مە بەشداری کریە لگەل پێشانگەهێت هاتینە ڤەکرن لبەغدا وە دیسان ژدەرڤەی وەلاتی . ژڤان بەشداریا ، بەشداری پێشانگەها جیهانیدا یا وێنێت زاروکا ، لسەر یارییێت ئولەمپی . هەروەسا دپێشانگەها وێنێت زاروکا یێت وەلاتێت بوسلمان لتورکیا . وە دپێشانگەها جیهانیدا یاهونەرو پێشەسازیا لهنگاریا بدەمـ بەرهـەمێت شاگردا . گەلەك پشکدارێت دی ژی مە یێت دگەل پێشانگەها لبەغدا دگەلپارێزگەهێت دی یێت وەلاتی وەکی پێشانگەهـا هونەرێت شیوەکاری یێت خاندنگەهێت سەرەتایی وەپێشانگەها نڤیسینا عەرەبی لبەغدا . وە پێشـانگەهـا بەلاڤـوکێد تـاقاو وپوستەرێت رامیاری هەر لبەغدا ، وە پێشانگەها هونـەرێت شێوەکاری یێت خاندنگەهێت جەرەڤی و ناڤنجی . ئەڤەو کاك اسماعیل پێڤە دچیت دبێژیت : ژبلی ڤان بزاڤیت ئەم پێ رابوین مە کارێ خو یێ کری ئو ئەم دپەیتین بەشداریێ دهندە بزاڤێت دی یێت هـونەریدا بکـەین لدەمێ بێت . وەکی بـەریکـانێ (مسابقە) یا جیهانی یا کو کوڤارا (ژنکا سوڤیێتی) پێ رادبیت لموسکو . وە پێشکانگەها سیێ یا زاپوینێ یا هەر دوو سالا جارەکێ لیابانێ ڤەدبیت . لدویماهیکا ئاخڤتنا خو سەیدایی دیارکر کو ڤان هەیاما دێ بەشداریێ دپێشانگەهەکا دی ژی دا کەن ببیست کەڤالا ژبەرهەمێت ماموستایێت پەروەردا هونەریێ لموزەخانا هونەرێت شیوەکاری یا خاندنگەهی لبەغدا .

ئەمینداریێتیی رۆشنبیریو لاوان
گۆڤاری « کاروان»
هەولێر - ت/20862






● ئامادەکردنی ●
سۆران حەریری

**خوێنەرانی ئازیزو خۆشەویست ..**

وا ئەمجارەیش ژمارە « 23 » ی گۆڤارەکەمان دەکەوێتە بەردەستی ئێوەی خۆشەویستو لەگەڵ خۆیدا کۆمەڵە نووسینو بەرهەمێکی تازەی هەڵگرتووەو وەکو چەپکە گوڵێکی هەمیشە گەشاوە پێشکەشی خوێندەواری کوردی دەکاتو کەلەبەرێکی دیکەی کتێبخانەی کوردی پێ پڕدەکاتەوەو بەردێکی تر دەخاتە سەر ئەو بناغە چەسپیوەی ئەدەبی کوردیمان کە نووسەرو ئەدیبو شاعیرو زاناو مێژوونووسانی کورد هەر لەکۆنەوە بە پتەوی دایان مەزراندووە بۆ ئەوەی هەر بە پتەویش بمێنێتەوە ، ئەو بناغە قایمەی کە ئێمرۆ مایەی خۆشبەختی هەموو نووسەرێکی کوردەو شانازی پێوە دەکرێ ، نابێ ئەوەیشمان لەبیر بچێ کە مێژووی ئەدەبی کوردیمان هەر لە کۆنەوە تاوەکو ئێمرۆو دوارۆژیش مایەی ڕەنجو کۆششی بەردەوامی ئەو نووسەرە دڵسۆزانەیە کە هەموو ئاواتێکیان خزمەتکردنی ئەو کەلەپوورە نەمرەیەو بە خەباتێکی زۆرەوە لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی پێشکەوتوو تری دەگوێزنەوە ، بۆ ئەوەی ئاڵا شەکاوەکەی ئەدەبی کوردی هەردەم بەرز ڕابگرن ..

● **خوێنەرانی هێژا :**

کاروانی ئەمجارەیشمان بەردێکی قایمتری دیکە دەخاتە سەر ئەو بناغە پتەوەو تۆزێکی تر لە بارستایی دیوارەکە بەرز دەکاتەوەو مژدەی چوون بەرەو قۆناغێکی تازەتر بە خوێنەری کورد ڕادەگەیەنێو ، بەدەرچوونی ئەم ژمارەیەیش خەریکە خۆی لە داگیرساندنی مۆمی پێنانە سێساڵەی تەمەنی نزیك دەکاتەوەو مژدەیەکی نوێ دەچرپێنێتە گوێچکەی هەموو ئەو براو خوشکە نووسەرانەی بە دڵسۆزیو بە گیانێکی لەخۆبووردووانە دەستی یارمەتیان بۆ درێژ کردووەو هاوکارییان لەگەڵدا کردووە ، پێیان دەڵێین ڕەوڕەوەی کاروانی بەرەوپێشچوونی گۆڤارەکەمان هەر بەردەوام دەبێتو لە وەستان ناکەوێت لە پێناوی گەشەپێکردنی ڕەوتی پێشکەوتنخوازانەی ئەدەبی میللەتەکەمانو لە پێناوی دەست بە باڵەوە گرتنی ئەدیبو نووسەرانی کوردو دەوڵەمەندکردنی ئەرشیڤی کتێبخانەی کوردیماندا ..

● **خوشكو برایانی دڵسۆز :**

هەر لە زووەوە گوتوومانە « کاروان » گۆڤاری هەموو نووسەرو ڕۆشنبیرێکی کوردە ، هەر بەو گیانەیش گۆڤارەکەمان بەردەوامی بە ڕێبازەکەی خۆی دەداو بەرەوپێشەوە دەچێت ،

حیا ئیتر لەبەر تیشکی رووناکی ئەو بەڵێنەی « کاروان » دا سرێژە بەو هاوکاری‌یە بدەین کە تا ئێستا دریغیمان لێ ی نەکردووە ، بۆ ئەوەی زیاتر گەشەی پێ بدەین و بەرەو قۆناغێکی چاکتری بەرین و هەوڵ و کۆششی هەموو لایەکیشمان نەبوتەیەکدا یەك بگرێتەوە کە ئەویش خزمەتکردنی ئەدەب و رۆشنبیریی کوردیمانە ، دەبا بەر لەوەی گلەیی لە گۆڤارەکەمان بکەین ، گلەییەکی بچووکیش لەخۆمان بکەین و بزانین تا چ رادەیەك ئەو کەلەبەرو ئەگەرانەی لەرووی کەمی بابەت و نووسینی چاك و بەپێزەوە کە هەندێ جار دێنە رێ ی گۆڤارەکەمان توانیوومانە چارەسەری بکەین و ئەو کۆسپانە تەخت بکەین و نەیان هێڵین .. دەبا ئیتر نووسینەکانمان نموونەی ئەدەبی سەرکەوتووبن لە پێناوی بەرەوپێش بردنی کاروانی رۆشنبیریی ئەتەوەکەمان و ئەشوونەما پێکردنی بەهرەی نووسەرە تازە هەڵکەوتووەکانی کورد ..

**● براو خوشکە شیرینەکانم ●**

وا ئیتر لێرەدا دەوەستین و وەلامی ئەو بەرهەم و نامەو نووسینانە دەدەینەوە کە لە ئێوەی ئازیزو دلسۆزەوە پێمان گەییون ، ئەو بابەتانەی لەبەر زۆر هۆ بواری ئەوەیان بۆ نەرەخساوە لە گۆڤارەکەماندا بلاویان بکەینەوە ، دەستا خۆشوون لەگەل ئەو بەرهەمانەی کە لەم ژمارەیەدا وەلامدراونەتەوەو دووبارە سوپاس و هەربژین .

**● بۆ ئەم براو خوشکە ئازیزانەمان :**

« هۆشەنگ و پێشەنگ ، موسى محمد ئێمیکی ، سلێمان گەلالی ، ئەمین چاوڕەش ، بێ هەست ، عارف رشدی ، ظاهر عبدالسلام خلیل گەزنەیی ، رزگار مەجید نەجم ، مەردۆخ ، دلوڤان عبدالرحمن ، رەنجدەر ، خلیل جەباری ، شەوبۆ بهجت عارف ، محمد عبدالکریم چەلکی ، بێبەش مەنتك ، رێبوار غەمبار ، نادر علی محمد ، سەرباز کانەبی پەژارە ، هەوار سپیندار ، نێچیرڤان کورەماركی ، شلێر هموندی ، ئازاد زەبوون ، یوسف ابراهیم باپیری ، دلێر عمر ، بێباك وەرتی ، بدل دۆسکی ، وارکورد ئەتروشی ، خطاب حامد بندیان ، بریندار ابراهیم ، فائق صدیق شوانی ، کاوە سەعدوللا محي الدین ، عبدالله صالح شاربازێری ، جەوهەر محمد بشێخانی ، بژار ، کمال نوری ورگە ، بەیان ـ ع ، رێژنە کاکە احمد مام قادر ، شیرزاد مەردۆخ ، ووشیار حمد حاجی ـ پێشەوا ، بەختیار سوار شێروانی ، هەژار شینکی ، رێژار سولەیمان ، بێوار سلێڤانەیی ، وریا عزیز ، هەلمەت عزالدین ، سمبایل مەریوانی ، عارف محمد المندانی ، صابر دلگیر ، رەنجدەر خۆرانی ، محمد گردعازەبانی ، رمضان اسماعیل ئاکرەیی ، ادریس شەیداهو ، شوان حمد کافرۆشی ، خدر ئەحمەد رەواندوزی ، باغەوان عمر گردعازەبانی ، محمد طاهر لادێیی ، صابر سلێمان علی ، هادی عمر رسول ، هیوا سالەیی ، شکر سلێمان حمد ، محمد خدر سەرانەیی ، س . ع . ك ، فاتح سلام محمد ، پشتیوان هیرانی ، انور داماو ، هاوار سعید علي ، نەبیل جەبار پیرۆز ، سەردار عدنان احمد ، هاژە عبدالله ، شامل قادر حمید ، رێباز مصطفی فەقیانی ، رێدێر باتیفی ، یاسین گەردی ، هەڤالێ کاروانی ، هێرش ابراهیم ، سعید محمد سعید ـ کوردۆ ، شێواو بالیسانی ، اسمر شیخ بزینی ، شۆرش ابراهیم امین ، یەحیا دلگیر ، صباح احمد طه ، احمد رفعت محمد ، خالد محمد ولی ، مەشخەل نەقشبەندی ، ص . حاجی مارف ، س . محمد امین ، حسن محمد صالح بەرواری ، ستار احمد ، زیکۆ سەعیدو رۆستەم عەزیز ، محمد خدر ابراهیم سەرانەیی ، عبدالله عزیز عبدالله ، مجروم قادر نبی ، ئازاد صدرالدین برزنجی ، عثمان خدر یاسین ، فاضل محمد عزیز قەرەداغی ، هێمن محمد صالح محمد ، زەردەشت محمد عمر میکائیل ، یاسین لطیف محمود ، جعفر ابراهیم رسول ، نەوزاد کوردی ، کمال احمد محمد » .

براو خوشکانی هێژا بەر لەوەی بچینە نێو پوختەی باسی بلاوکردنەوەی ئەم ناوانە ، دەلێین بمان بەخشن کە ئەو بەرهەمانەی بۆتان ناردبووین بواری بلاوکردنەوەیان بۆ نەرەخسا ، ئەویش لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە ..

● زوربەی زۆری بەرهەمەکان ناوی تەواو و ناونیشانی دیاری نووسەرەکەی بەسەرەوە نەبوو ، کە ئەم خاڵەیش یەکێکە لە مەرجە سەرەکی یەکانی بلاوکردنەوەی هەر نووسینێك و بابەتێکی نووسەرەکە خۆی ئەگەرچی ئێمە زیاتر لە جارێك ئەم مەسەلەیەمان راگەیاندووە کەچی تا ئێستایش وادیارە زۆر لە برا نووسەرەکانمان پەیرەوی ناکەن و وەك بلێ ی حیسابێکی بۆ

ناکەن ، ئەمە جگە لەوەی کە نووسەرەکە هەرخۆی تووشی گێرمەو کێشەیەکی زۆر دەبێت ئەگەر هاتوو بابەتەکەی بلاوکرایەوە ، چونکە وەکو مافێکی ئاسایی یاداشت لەسەر نووسینەکەی وەردەگرێ ، جا کە ناوو ناونیشانی تەواوی خۆی نەنووسێ ئەوە ئەو مافەی وەلاوە دەنرێ ..

● هەندی لەو بەرهەمانەی کە ناوو ناونیشانیشیان بەسەرەوەبوو ، نووسینەکانیان هەردیسان بەوجۆرە ڕوون و ئاشکرا نەبوون کە سوودیان لێوەربگیرێ ، جگە لەوەی هەندێ لەو برادەرانە تەنها مەبەستیان بووە کاغەزێك بەچەند قسەیەکی سادەوە پڕبکەنەوەو بیدەن بە گوێی گۆڤاری « کاروان » داو جا هەرچۆنێك بێ ، ئێمە هەرچەند لە ناخی دڵمانەوە سوپاسی ئەو برایانە دەکەین ، بەلام لەهەمان کاتدا داوایان لێدەکەین کە جارێ زۆریان ماوە بین بە نووسەرو شاعیری وا کە ناویان بەسەر لاپەڕەی فلانە گۆڤار یا فیسارە رۆژنامەوە بیریسکێتەوە ، خۆزگە ئەو براو خوشکانەمان پێشتر هەوڵی ئەوەیان دەدا کە زیاتر خۆیان ڕۆشنبیر بکەن بە ئەدەب و کەلەپووری نەتەوەکەیان ، ئینجا گەر بۆیان کرا ئەوە هەموو دەرگایەك لەسەر پشتەو ئێمەیش بە خۆشحاڵییەوە بۆیان بلاودەکەینەوە .

بەم بۆنەیەوە بەو خوشکو برایانە ڕادەگەیەنین کە ناوەکانیانمان بلاوکردۆتەوە بمانبوورن لەوەی بەرهەمەکانیان بلاوناکرێتەوە لەبەر نەنووسینی ناوو ناونیشانی تەواوی خۆیان ، هەروەها هەموو برایەکیتر ئاگادار دەکەینەوە کە ئەگەر هاتوو پەیرەوی ئەم داخوازیەمان نەکەن ئەوە هەر لە ئێستاوە بەرهەمەکانیان بەلاوە دەنرێن و بلاوناکرێنەوە ، ئیتر هیواداریین جارێکی دیکە ئەم داواکاریەمان دووبارە نەکەینەوەو سوپاس بۆ هەموو لایەك و هەربژین .

**● بۆ ئەم خوشکو برا ئازیزو خۆشەویستانەمان کە بەشیعرو پەخشانە شیعر گۆڤاری « کاروان » یان بەسەرکردۆتەوە :**

« سلام ڕوستایی ، محمد سعید ، رفیق فقی محمد همزە ، محمد کاروانچی ، صباح یوسف کاکەیی ، نەوزاد بەندی ، کاوە قادر خۆشناو ، شێرکۆ حمە رحیم ، سەردار سەرهەنگ ، علي شامل ، حسن بالیسانی ، ئازاد جاف ، عبدالستار ڕەنجەڕۆ ، ستار حمەأمین قادر ، بەختیار فرج ، اسعد عزیز محمد ، علي محمد امین ، آراس حسن ، جلیل باپیر ئاقوبانی ، ئەبەز جواد قادر ، بێدار خۆشناو ، کاوە انور ، حسین سلێڤانی ، دەخیل شەمۆ ، بدل ڕفۆ مزوری ، ئەحمەد بێتکاری‌ەخضر عبدالله ، شاکری دلدار ، هاشم محمد ئەتروشی ، بویا مرقس بهنان عێنکاوی ، کەژاڵ زەنگەنە ، فتح‌الله سعدالله ، هەڵەت رسول محمد امین ، عبدالرحمن عثمان بەندە ، هێرش عبدالله ، داماو دهۆکی ،

ازاد شوکت ، م . ك ئاوارە ، محمد سعید محمد صالح ، یوسف احمد مەنتك ، ابراهیم احمد ، طیب حسیب ، رزگار حسن ، محمد فتح‌الله سعید ، دیار اسماعیل شکري ، حمید محمود قادر ، شێروان علي سعید ، مهاباد ناصر صابر ، هاوار سعید علي ، عبدالصمد سیان ، طه احمد رسول ، صابر نامۆ ، عثمان محمد ، صالح حامد محمد ، سلێمان گەلاڵی ، فائق شوانی ، رؤوف محمد علي کریم ، احمد محمد عبدالله بۆلی ، ڕێبوار بێبەش ، جمال محمد علي احمد ، چەوسا عمر طاهر ، ڕیڤینگ محمد باتیڤی ، صلاح سامان ، یوسف مصطفی رشید ، بەشارەت احمد کریم ، رسول فتاح ، حسام عمر مەنتك ، فؤاد رشید ، خلیل بێخەم ، شکر سلمان محمد ، سامي نصر الله هرکی ، ناجي طه سعید ، فاخر سیان شەپۆل ، صلاح حسن عبدالکریم ، رؤوف دیبەگەیی ، جوهر محمد شێخانی ، تحسین مولود مصطفی ، ازاد حمه رؤوف ، صلاح فاضل ، ڕەوەز کاوێس کەلهوری ، جمال جامي محمد ، ادریس عثمان ، قارەمان ئەسعەد مەنمی ، طاهر باراوی ، عبدالحمید حمدامین ، جەنگی عارف شوانی ، ف . هـ باغمرەیی ، دەرسنیم جلال ، وشیار حمد حاجي ، یاسین احمد داماو ، عبدالرحمن بێلاف ، بایزید محمد عبدالرحمن ، محمد گەردی ، صباح لادێیی ، خلیل پاسین هۆشمەند ، صباح گەردی ، حسین علی پەژار ، سادال دیوانە ، نبیل جبار پیرۆز ، حسین رسول ، تاهیر عاصي شوانی ، سۆران عبدالله احمد ، فاتح حسین سیکانی ، خالد ساتووری ، مصطفی بێبەش مەنتك ، سامي جمال محمد قەرەداغی ، نەوزاد حەمە کەریم ، احسان محمد محي‌الدین ، مصطفی جندیانی ، عبدالستار عبدالله کامل ، حسن شکری » .

● برایانی ئازیز ، خوشکانی شیرین .. بەوپەڕی

خۆشحاڵی‌یەوە نامەو نووسین‌و بەرهەمەکانتانمان وەرگرت ، پێشەکی بەناوی گۆڤارەکەمانەوە ڕێزو دڵسۆزی خۆمانتان پێ ڕادەگەیەنین ، لەڕاستیدا زۆرمان حەز بەوەدەکرد کە ئەو بەرهەمانەی ئێوە کردووتانە دیاری بۆ گۆڤاری کاروان بێ‌ئومێد نەبن‌و دەست بەڕوویانەوە نەنرێ ، بەلام وابزانم خۆشتان لەگەڵ ئێمەن کە دیارە بەرهەمەکانتان لەو تاقیکردنەوەیە دەرنەچووین ، بۆیە ئێمەیش لەبەر بەرژەوەندی کاروان‌و کاروانی ڕۆشنبیریی کوردی‌و زیاتر بەرزکردنەوەی پلەو پایەی ئەدەبی میللەتەکەمان ڕێگەی ئەوەمان بەخۆمان ڕەوا بینی کە پێتانی بڵێین بابەتەکانتان شیاوی بلاوکردنەوە نەبوون ، بۆیە داواتان لێ‌دەکەین زیاتر بخوێننەوەو چاکتر سوود لە ئەدەب‌و کەلەپووری کوردی وەربگرن‌و قوڵتر بیربکەنەوە بۆ ئەوەی ئەو ڕەنجەی دەیدەن بەرهەمێکی چاک‌و دەوڵەمەندو سوود بەخش بهێنێتە کایەوەو دووبارە سوپاستان دەکەین‌و هەرشادبن ..

● **بۆ نووسەری ئەم شیعرانە** : « وام دەزانی ، ئەو ڕۆژانەی کە ناتبینم ، ناشێ ، ئەو ینێکی بزێو ، ئەی گوڵە شیعرە ڕەنگینەکەم ، ئەنجامی بێگانە پەرستی ، سێدارەی چارەنووس دەپچڕێنم ، چرپەیەك ، کاغەزەك بۆ دایکا من ، مەهاباد کانیا خوێنێ ، پێشکەشە بۆ برسییێت کوردستانا ئێرانێ ، بەسەرهاتی بەندکراوێکی کورد لە ئێراندا » .

. لەناخی دەروونمانەوە سوپاسی برایانەی خۆمانتان پێ‌ڕادەگەیەنین‌و داواتان لێ‌دەکەین کە بمان‌بەخشن لە بلاونەکردنەوەی ئەم بەرهەمانەتان کە لەسەرەوە پەنجەمان بۆیان کێشاوە ، ئەویش لەبەر ئەوەی زۆربەیان لە ڕووی هونەری شیعری‌یەوە لەنگو بێ‌هێزن‌و بەشێکیشیان لەگەڵ ڕێبازی گۆڤارەکەماندا ناگونجێن ، هیواداریـن بەرهەمی بەسۆزو پێزترمان بۆ بنێرن بۆ ئەوەی بواری بلاوکردنەوەیان ببێ‌و دووبارە سوپاس بۆ هەموو لایەك ..

● **كاك سەرکەوت مدحت رشيد و كاك سليمان كەلالی** : ئەم دوو برایە هەریەکەی شانۆگەریەکی‌یان بۆ ناردووین ، ئێمە لە پێشەکی‌دا زۆر سوپاسیان دەکەین‌و هیواداریـن هەمیشە نموونەی براو دڵسۆزی ئاوامان زۆربن بۆ ئەوەی چاکتر خزمەتی ئەدەبی میللەتەکەمان بکەین ؛ بەلام دەبێ بمان‌بەخشن کە هەردوو شانۆگەری‌یەکە شیاوی بلاوکردنەوە نەبوون لەبەر ئەوەی یەکەمینیان لەزۆر ڕووی هونەری‌یەوە ناتەواو بوو و کەم‌و کورتی پێوە دیاربوو ، دووهەمینیشیان هەردیسان بەپێ‌ی پێویست ئەو سوودەی تیا بەدی نەدەکرا ، جگە لەوەی کە لە زمانە ڕەسەنەکەی خۆیەوە وەرنەگێڕدرابوو ، هەر بەم بۆنەیەشەوە دەڵێین خۆزگە ئەو برادەرانە لە هونەری وەرگێڕاندا پسپۆڕن‌بەو لایەنەیان ڕەچاو دەکرد بەهەرحال ماندووبوونەکەتان جێگەی سوپاسەو هەربژین ..

● **بۆ ئەو برا ئازیزانەمان کە ئەم چیرۆکانەیان بۆ ناردووین** :

« چاکەی بەرانبەر بە چاکە ، لەرزو تا ، هەرگیز ، کوڵە کوڵی گەرما ، ئەمڕۆش + پار ، بووکەشووشە ، ژووان ، نادیارو ڕاستی ، مامە کاکل پێش من دەرچوو ، گوڵەی ویل کەس ناناسێت ، گرەو ، شڤان‌و لاسکە فاسوڵیاکان ، سەنگەرەکەم ، شارەکوێر ، خەم‌و هەنگاو ، وورگە ـ ئەوەی نوێ ـ گەڕانەوە ، ئەو ئافرەتەی خۆی لە بەرگی سواڵکەریی شاردوتەوە ، تو بخێر هاتی ئاوازو مار ، کورکێ ئۆ کچکێ ناڤێ هەردووا » .

لە ناخی دڵمانەوە سوپاستان دەکەین ، ئاواتەخوازین بەردەوام دۆستی دڵسۆزی گۆڤارەکەتان گۆڤاری « کاروان » بن‌و بەرهەمی چاک‌و بەسوودی بۆ بکەنە دیاری ، ببوورن کە ئەم بەرهەمانەتان شیاوی بلاوکردنەوە نەبوون ئەویش لەبەر زۆر هۆی هونەری و کەم‌و کورتی لە ناوەرۆکی چیرۆکەکان‌و ڕەچاو نەکردنی زۆر لایەنی دارشتن‌و تەکنیکی لە چیرۆك نووسیندا ، داواتان لێ‌دەکەین زیاتر بخوێننەوەو چاکتر بە ناخی ئەدەب‌و ڕۆشنبیری کوردیدا بچنە خوارەوە بۆ ئەوەی شارەزایی‌یەکی فراوانتر لە هونەری چیرۆك نووسیندا بەدەست بهێنن‌و بتوانن بەرهەمی دەوڵەمەندتر پێشکەش بە خوێنەرانی کورد بکەن ..

● **بۆ كاك فارس ئەحمەد چاوشين** .. سوپاست دەکەین بۆ ئەو نووسینەی کە لەژێر سەردێری « مام سمایلە باسە » دا بۆت ناردبووین ، بەلام دەبێ بمان‌بووری لە بلاونەکردنەوەی ، چونکە زۆر مەرجی لێکۆڵینەوەی ئەدەبی تیادا نەبوو جگە لەوەی کە دارشتن‌و ناوەرۆکی نووسینەکە زۆر سادەو ساکار بوو ، چاوەنواری بەرهەمی بەسوودترتانین‌و هەربژین ..

